بسم الله الرحمن الرحيم


عاشقم نەوەک درندە

نووسینی: جاسم زاری

نەخشەسازی ناوەوە: زەردەشت کاوانی

## کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی




بەڕێوەبەری گشتی: موحەممەد خضر ئەحمەد ٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤

بەڕێوەبەری هونەری: موستەفا موحەممەد کوردی ٠٧٥٠٩٩٩٨١٨٢

فەیسبووک: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ M.Ktebxana

ئنیستگرام: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ M.Ktebxana

لقی یەکەم: بەرانبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری

لقی دووەم: چوارڕیانی شێخ مەحمود - بەرانبەر مزگەوتی مەحمود عەلاف

ئیمێل: mdmaktaba@gmail.com

نەخشەسازی بەرگ: عبدالله حاجی

چاپی یەکەم: ١٤٤٥ک - ٢٠٢٤ز

پێوانە: ١٤ * ٢١

تیراژ: ١٠٠٠

لاپەڕە: ٤٧٦

نرخ: ٨٠٠٠

له بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان ژمارەی سپاردنی (٨٦٩) ساڵی (٢٠٢٣)ی پێدراوە.

# عاشقم نەوەک دڕندە

نووسینی
جاسم زاری

بەداخەوە بە بەڕێزتان ڕادەگەیەنین کە ئیمڕۆ هەینی لەکاتی بەیانیدا مامۆستا و حەکیمی گەورەی بیابان نشین، بەڕێز جەنابی حەکیم سوهەیلی نووسەر و ڕۆماننووس، دوای ئەوەی بە قوتابیەکانی شاد بوویەوە هەواڵی مەرگی کەوتە بەر گوێچکەمان و غەمباری کردین، بەم بۆنەیەوە ئیمڕۆ هەموو ڕەش دەپۆشین.

شایەنی باسە دوای ئەوەی ئیمڕۆ کاژێر هەشتی بەیانی پەیامنێر و کامێرامانەکەمان چووبوونە بیابان و دەشتاییەکانی دەرەوەی شاری ئەختەر تاوەکو چاوپێکەوتن لەگەڵ جەنابی حەکیم دا بکەن، وەلێ بەداخەوە بەر لە گەیشتنی ئەوان حەکیم کۆچی دوایی کردبوو. ئێستاش لەگەڵمان بن لە کەناڵەکەی خۆتان ڕاستەوخۆ مەراسیمی ناشتنی حەکیم سوهەیلتان بۆ دەگوازینەوە و وردە وردە خەڵکی دەگەن و ئێرە جەنجاڵی زیاتر بەخۆیەوە دەبینێ.

ئارای مەولەوی لەگەڵ بیستنی ئەم هەواڵەدا واق بوو[1] بەرامبەر شاشەکە و هاوارێکی بە ئازاری لێ بەرز بوویەوە، بەرگەی نەگرت و خێرا تەلەفزیۆنەکەی کوژاندەوە و بە خێراییەکی یەکجار زۆرەوە لە ماڵێ چوویە دەرێ و بەرەو ماڵی ڕەنجی هاوڕێی وەڕێ کەوت.

ئەو دەمەی گەیشت بە توندی لە دەرگای دا و ڕەنج هاتە دەرێ و حەپەسا کە بینی ئارا هەناسەی سوار بووە و هانە هانی لێوە دێ.

---

(١) واق بوون: سەرسوڕمان

+ چی بووە برا، ئەی هاوار چی بووە! دەڵێی تا ئێرە بە ڕاکردن هاتووی؟!

- ڕەنـــج خـــێرا خۆت بگۆڕە و تێلێك بۆ ئەحمـــەد بكە با ئۆتۆمبێلەکەی بێنێ، کورە حەکیم سوهەیل کۆچی دوایی کردووە حەکیم سوهەیل.

لەگەڵ ئەم قسەیەدا ڕەنج لە شوێنی خۆیدا ڕەق ڕاوەستا و چاوەکانی فرمێسکی پێدا هاتنە خوارێ و دوای کەمێ لە تاسان گوتی: ئەوە چی دەڵێی ئارا! مەگەر ئێمە دوێنێ لای حەکیم سوهەیل نەبووین، چۆن ئیمڕۆ ئاوا لە ناکاو ئەمە ڕوویدا، خۆ ئەو تەندروستی زۆر باش بوو!

ئارا کە ڕۆندك لە کۆڵمەکانی شۆڕ ببوونەوە و گەیشتبوونە گەردەنە بلووریەکەی دووبارە وەدەنگ هاتەوە: تخوا ئەمە قسەیە دەیکەی ڕەنج، مەگەر مردن ساغی و نەساغی دەزانێ، مەگەر منداڵ و پیر دەناسێ، خۆ مناڵ نی تازە فێری ئەم شتانە ببی کاکە!

ئەمجارەیان ڕەنج گریانەکەی لە جاران توندتر کرد و بە دەنگێك کە تێکەڵی ئاوازێکی زۆر غەمبارانە بوو بوو گوتی: لێم مەگرە چاوەکەم لێم مەگرە، بەخوا لەگەڵ ئەم هەواڵەدا وەها تاساوم کە نازانم چی دەڵێم و خەریکی چیم. باشە تۆ چۆنت زانی برا، سەریاڵ و ئارتین باسیان لێوە کرد؟

- کورە هەموو خەڵکی زانیویانە زانی، لە کەناڵەکان هەراو ژاوە ژاوی ناوەتەوە، هەر من و تۆین لە گوێی گادا خەوتووین. کاکە کاتی ئەو قسانە نییە، خێرا تێل بۆ ئەحمەد بکە.

+ ئەوە دەچمە ژووریٚ و مۆبایلەکەم دێنم تۆ لێرەبە، باشە بۆ تۆش تێلت نەدەکرد ئێمە بە ئۆتۆمبێل دەهاتینە دوات، ئەم هەموو ڕێگایەت بۆ بڕیوە؟

- ئەی هاوار ئەمە چ کارەساتێکە خودایە، هەر خۆشم نازانم مۆبایلەکەم لە کویٚ یە ڕەنج، لەگەڵ هەواڵەکەم ژنەوت و ڕامکرد بۆ لایماڵتان.

ڕەنج بە خێرایی چوویە ژووریٚ و بە گریانەوە تێلی بۆ ئەحمەد کرد و لەگەڵ دەنگی گریانەکەیدا خاتوو ڕەحمە لە ناندینەکە هاتە دەریٚ و بە پەشۆکاویەوە گوتی:

ئەوە چی یە نازدارەکەم، کیٚ مردووە ئاوا دەگریەی؟!

+ دایکە، حەکیم سوهەیل کۆچی دوایی کردووە، تاکە کەس بوو من و ئارا دڵمان بە هەبوونی خۆش بوو کە هەتوان[١] بیٚ بۆ برینەکانمان.

- هەمان ئەو حەکیم سوهەیلەی کە ڕۆمانی (عاشقم نەوەك دڕندە)ی نووسی بوو، ئەوەی تۆ و ئارا چووبوونە لای؟

---

(١) هەتوان: مەڵهەم، دەرمان

+ بەڵێ دایكە، ئەو هەر دوێنێ بوو بە قوتابیەكانی شاد بوویەوە و لە میدیا و كەناڵەكاندا ناسێنرا، ئەمڕۆ چوویەوە لای ئەو دۆست و مەحبووبەی كە چەندین ساڵ بوو لە بیابانەكاندا پەرستشی بۆ دەكرد و عاشقی بوو. وا لەگەڵ ئارا و ئەحمەد دەڕۆین ئامادەی ناشتنەكەی ببین، هەر چەندە پێش ڕاناگەین چون ئەوێ تەواو دوورە.

ڕەنج ئەم قسەیەی كرد و بە خێرایی چوویە دەر و چاوەنووڕ بوو تا ئەحمەد گەیشت، لەگەڵ گەیشتنی ئەحمەد دا هەردوو سواری ئۆتۆمبێلەكە بوون و وەڕێ كەوتن.

لە ڕێگادا ئارا هەر ئاماژەی بۆ ئەحمەد دەكرد كە بە خێرایی لێی بخوڕێ تا بتوانن ئامادەی ناشتنەكە بن، وەلێ ڕەنج بە تووڕەییەوە لە ئارا ڕاما و گوتی:

ڕاوەستە ئارا با تووشی ڕووداوێك نەیەین و ڕێگاكە زۆر ناخۆشە، تازە بتەوێ و نەتەوێ ناتوانین لە كاتی ناشتن لەوێ بین، لەوانەیە ئێستا سەریاڵ و ئاڕتین ناشتبێتیان. دووبارە تكات لێ دەكەم ئارامت هەبێ. وادەزانی من ناڕەحەت و دڵتەنگ نیم، بەخوا وادەزانم هەموو دونیام لەدەست داوە هەموو دونیا تێبگە، وەلێ دڵنیابە نە خودا و نە باوكت و نە حەكیم سوهەیلیش بەم خێراییە ڕازی نیین.

+ ئیمڕۆ هیچم لێ مەگرە ڕەنج هیچم لێ مەگرە، هەر دوێنێ بوو دڵی هێندە خۆشبوو بە بینینەوەی قوتابییەکانی بەم هەموو تەمەنەوە دەتگوت تازە لە دایك بووە، ژیانێکی نوێی بەبەردا کرابۆوە، هێشتان هەزاران قسەی هەبوو بۆ قوتابییەکانی بیکات هەزاران، دوای ئەم هەموو ساڵە دووریە بە دیدار گەیشت، وەلێ تەنیا یەك شەوی تر ژیا یەك شەوی تر. ئەی بۆ ئێمە، کورە ئەی بۆ ئێمە، خۆ هێشتا تێر لەلای ڕوونەنیشتبووین و سەدان ڕازی نێو دەروونی خۆم بۆ باسنەکردبوو. بەو خودایە بمزانیبا دوێنێ جێم نەدەهێشت، ڕەنج بەخوا جێم نەدەهێشت.

هەمووی خەتای ئەم دوو پیرە پیاوە بوو، بەڵێ خەتای ئەوان بوو، ئاخر لەبەر ئەوان نەبا ئەمشەو من لە ماڵەکەیدا دەخەوتم و تا بەیانی لێیم دەڕوانی و دەردە دڵم بۆی دەکرد.

ڕەنج کە خەریك بوو بە فانێلەکەی فرمێسکەکانی دەسڕی گوتی: هێواش بە کاکە هێواش بە، ئەو تەنیا هەر ئەو شەوەی لە ژیاندا مابوو، ئیدی ئەمە خودا بۆی داناوە و کاری ئێمە نییە مشتومڕی لەسەر بکەین. دواتر ئەم تاقە شەوە مافی ئێمە نەبوو لەلای بین بەڵکو مافی ئەم دوو پیرە پیاوە بوو، چون ئەوان دوای ئەم هەموو ساڵە بە یەکتر شادبوونەتەوە قابیلە ئێمە لەملاوە بێین مافی ئەوان بخۆین و نەهێڵین لەلای بن، مەگەر لەیادت کرد ئەمە داخوازی حەکیم خۆی بوو؟

لەگەڵ ئەم قسەیەدا ئارا سەری بەردایەوە و هیچی تری نەگوت و هێواش هێواش لەبەر خۆیدا دەگریا، ڕەنجیش چاوە سەوزەکانی لەگەڵ فرمێسکدا هێندە سوور بوو بوو کە دەتگوت لەنێو ئاوێکی سپی پڕ لە قەوزەی سەوزدا ڕاوچیەکان ماسیەکانیان بریندار کردووە و خەریکە خوێنی ماسیەکان ڕەنگی ئاوەکە و قەوزەکانیش بگۆڕن بۆ سوور و لە ڕەنگی سوور بەولاوە ڕەنگێکی دیکە بوونی نەمێنێ.

ئەو دەمەی گەیشتن ڕوانیان جەنجاڵیەکی یەکجار زۆر لەوێدا هەیە و لە تەنیشت خانووەکەیدا حەکیمیان ناشتووە و چین چین خەڵك لەسەری دەگرین و شوێنەکە تەژی بووە لە کامێرا و ڕۆژنامەنووسان. بە خێرایی بەنێو خەڵکەکەداخۆیان گەیاندە سەر گۆڕەکەی و بە گریانەوە سەلامیان لە حەکیم کرد و دەستیان بە خوێندنەوەی دەقە ئاینیەکان کرد.

# تەنیایی لە تەمەنێکی پیردا

بەردەوام بە لەگەڵم هاورێ، کتێبەکەی دەستت دانەنێی، چی دەبێ ئیمڕۆ بەیەکەوە بچینە دوێ. دەزانم گەلێ مژووڵی و کاروباری دونیا بواری هیچی بۆ نەهێشتوویەوە، وەلێ تۆزێ گوێت بۆ ئەم پیاوە پیرەش شل بکەی خراپ نابێ. وابزانم ئیمڕۆ تۆزێ ساردترە لەڕۆژان، خودا نەیبرێ ژوورەکەشم هێندە بائەنگێوە[1] هیچ شتێ ناگێڕێتەوە. دەی با ساردتر بێ قەی چی دەکا، ئەسڵەن کەی گرنگیم بە کەش و هەوا داوە، خۆ جگە لەخۆم کەسی دی لێرە نییە تا خەمیم بێ سەرمای نەبێ، ئەوانە غەمباری ئەو حاڵەتەن کە مەعشووقێکیان هەیە، دەی با لەوە گەڕێین ئەم بابەتە درێژدادڕە. جوان تێم بڕوانە چی دەڵێم، گوتەکانم بە باشی بژنەوە، ئای لەخۆم! کاشکی[2] دەمزانی بۆ کێ دەدوێم! باشە تۆ گوێم بدێ ئەی جن، نەخێر ئیدی، خەریکی هەڵیت و پەڵیتم، قیداریش لێرە نییە، هەر دەڵێی لەیادم چۆتەوە تەنهام.

بەڵێ بەڵێ لەیادم چۆتەوە، دەڵێن پیری و هەزار عەیب، وەلێ بگرە زیاتریش. دەی با بنووسم و حەقم لەم چشتانە نەبێ، لەوەیە

---

(١) بائەنگێو: کونێکە بای لێ بێتە ژوورەوە

(٢) کاشکی: خۆزگە

ڕۆژێك كەسێ ڕێی لێرە بكەوێ و ئەم تیانووسە بدۆزێتەوە، چووزانم، گەر نەیان دۆزیەوە چی؟ دەی با نەیدۆزنەوە كاكە، یارای[١] ئەو خەمەشم نییە.

وادیارە بایەكە پتر بووە، پەنجەرەكان تەقە تەقیانە. ئەم شوێنە هەر دەڵێی خودا غەزەبی لێ گرتووە، خۆ گیانداریكی تێدا ناژی. هەفتەیەك لەمەوبەر پاساریەك هاتبوویە سەر چارپاكەم و تۆزێ ئاوم پێدا، لەو ڕۆژەوە ئەویشم نەبینیوەتەوە. دەشتێكی چۆڵی كاكی بە كاكی، لە ژوورەكەی من بترازێ چ كەسی دیكە لێرە بەدی ناكەی، ئاخر خۆ خەڵك شێت نەبووە مەنزڵ لێرە چێ بكا كاكە. هەموو ڕۆژێ بەم تەمەنەوە دەبێ نیو كاژێر بڕۆم تا دەگەمە لادێكە و تۆزێ ئاو هەڵدێنجم. چەشنی كەترە و كەوەڕێیەك[٢] تێم ڕامەمێنە كە هیچ وەجێكی[٣] نەمابێ، ڕاستە لەنێو مووەكانمدا ڕەشایی بەدی ناكەی، لە چرچ و لۆچی ڕوخساریشم هەر بگەڕێ، ماوەیەكە بە داردەستەكەم نەبێ هێندە تواناى ڕێكردنیشم نەماوە.

ئیدی ناتوانم وەكو زەمەنی زوو جوانیەكان ببینم، لێ هێشتا جوانی لە هەرچیدا هەبێ خۆشم دەوێ، هێشتا عاشقی دیمەنی زەردەپەڕ و كاروانكوژەم، ئێستاش لە دامێنی چیاكاندا، لە

---

(١) یارا: توانا

(٢) كەوەڕێ: شەكەت، بێزاربوون لە لەشی خۆت

(٣) وەچ: كەڵك

ڕوانینی چاوی ئاسکێکی سرکدا دیەی هەزاران جوانی شەنگ و شۆخ دەبینم. ئەو دەمەی لە گوڵێکی سووری بنارێك ڕادەمێنم کە ئاونگی[1] کەوتۆتە سەر بەو نەشمیل و خەرامانەی دەچوێنم کە دڵدارەکەی لێی جویٚ بۆتەوە و کوڵمەکانی خوێنیان تێ زاوە و ئاوی تەڕ و ڕەوانیان بەسەردا شۆڕ دەبێتەوە. هێشتا عاشقی ئەو نەسیمەی بەری بەیانم کە لق و پۆی درەختە بەرزەکان چەشنی کاکۆڵی درێژی دولبەران سەما پێدەکا و بەملاو لایدا دەبزوێنێ.

نا نا هەرگیز نەکەی بێژی ئیدی پیر بووی و جوانیەکانت بیرچوونەوە. پیری هەموو شتێك لەگەڵ خۆیدا پیر و ژاکاو دەکا وەلێ عیشق نا، عیشق شتێکی دیکەیە، عیشق لەوانە نییە کە ژاکاوی و تیاچوونی بەسەردا ڕابووریٚ. ئەوەتا لێرەدا ژوورێکی شپرزە دەبینی کە باریٚ تۆزی بووەتە میوان، بنمیچێکی[2] تەڵخ داگەڕاو لە پیسیدا، ئینجا ئاسنجاو[3] و بادیەکەشم بە خۆڵی ئێرە نەخشاون، خوا هەڵناگریٚ جار جار پەڕۆیەکی تەڕ بە پەنجەرەکەدا دێنم تاوەکو دیمەنی دەرەوەم لیٚ ون نەبیٚ، ئاخر دەمەویٚ ببینم کە چۆن خۆڵەکان گرمۆڵە[4] بوون و وەکو لەشکرێکی تیژڕەو قەتاریان بەستووە و چین چین بەرەو ژوورە تاریکەکەم هێرش دێنن. کەچی

---

(١) ئاونگ: شەونم

(٢) بنمیچ: ئاسمانە، سەقف

(٣) ئاسنجاو: قاپ و قاچاغی مسین

(٤) گرمۆڵە: تۆپەڵە بوونی شت

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هێشتا دڵێکی لێوانلێو لە عیشق بوونی هەیە. هەموو ئەمانەی دەیبینی لێرەدا قابیلی تۆز گرتنن عیشق نەبێ، بەڵێ ئەو نە تۆز دایدەگرێ و نە مردنیش ڕووی تێدەکا. دەزانی هەندێ جار ڕوانین لەم دیمەنە تۆزاویانەش خراپ نیین بۆ مرۆیەکی پیر کە هیچی نەمابێ لەدەستی بدا. لەوانەیە ئەم دیمەنانە بۆ ئەو هێندەی فیلمێکی سینەمایی چێژداربن کە لە ڕۆژێکی باراناویدا مرۆ لەگەڵ مەعشووقەکەیدا تێی بڕوانێ. چووزانم، ئاخر دەی ئەو هەر هێندەی هەیە کەیفی لەگەڵ بسازێنێ. ئای هاوڕێ گیان، نازانم تا ئێستا گوتەکانم دەژنەوی یان نا، ڕۆژگارێ بوو منیش وەکو تۆ دەورەم تەژی بوو لە خەڵك، کەسانێك ئارەزووی بینینیان دەکردم، بگرە مرۆڤانێك هەبوون بۆشم گریاون یاخود لەبەر من خۆیان تووشی ئازار و تەنگی کردووە. هێندێك لە شوێنی دوورە دەست بۆ دیداری من دەهاتن، یانی دەمەوێ بڵێم منیش سەردەمێ دۆست و خۆشەویستانێکم هەبوو، ڕەنگە لەتۆ عاشقتر بووبم، دەشبێ بۆ نا؟ بۆ لات وایە ئەوەی پیربوو عاشق نییە؟! ئەگەر تا ئێستا ئەمە بیرکردنەوەت بووە هەڵەی. هەندێ جار لە تەنهاییدا ئەم دێڕەی مام هێمن لەبەر خۆمدا دەڵێمەوە کە گوتی:

ئەی ئەوانەی قەت لەبیرم ناچنەوە

ئێستا ھبینن ئەرێ دەمناسـنەوە؟

ئەرێ هەر بەڕاستی دەبێ ئەو دۆست و یارانەی جاران بمناسنەوە یان نا؟ بازێ جاریش ئەو دەمەی لە تێڕامانی خۆڵەکان بێزار دەبم



فیلمەکە دەگۆڕم و لەبەر دەرگاکە لەسەر گازی پشتێ ڕادەکشێم و سەیری فیلمی تراژیدیای هەورەکان دەکەم و هەزاران نەقش و یادگاری ڕابردوویان تێدا دەبینم. تۆ بڵێی ئەوان چۆن بتوانن ئاوا نەقش و نیگار چێ بکەن؟ دەی بێگومان بەدیهێنەرەکەیان ئاوای سازاندوون دەنا ئەوان خۆ گیانێکیان لەبەردا نییە.

بەڵێ ئەو دەمەی خەیاڵ و ئەندێشەیان لەسەر چڕ دەکەمەوە دیمەنی هەموو ئەو ئازیزانەم نیشان دەدەن کە ڕۆژێك لە ڕۆژان خۆشم ویستوون، لەپڕدا برینی زەمانی زووم دەکولێنەوە و بە ئەسپایی دەخشێنمەوە ژوور. وابزانم کەسێك لەدەرگا دەدا، ئەی خودایە بەم بەیانیە چ کەسێ ڕێی کەوتۆتە ئەم چۆڵەوانیە! تۆ بڵێی خەو نەبێ! نەمردم دووبارە تەقەی دەرگاشم ژنەوت. باشە باشە ئەوە هاتم خەریکە دەیشکێنی. دەبێ بڕۆم بزانم کێ یە، تۆ نووسراوەکەت دامەنێ و هەر ئێستا دەگەڕێمەوە.

ئەو دەمەی پیرە پیاوەکە دەرگاکەی والاکرد تۆ بڵێی کێ بێ! سەراسیمەبوو ئەو کاتەی دیمەنی کچێکی شلك و شۆخی بینی بە ڕوخسار و جلێکی شێواوەوە کە ئاسەواری لێدان بەڕوویدا دیاربوو.

هەنسکە هەنسکی گریان و دەنگی پرزەی[١] ئەم ناوەی تەنی بوو، لەوە دەچوو زۆری ڕاکردبێ تاوەکو گەیشتۆتە ئێرە. بەچاوێکی

---

(١) پرزە: هەناسە

ڕەشی ئاسکانەی ئاو گرتوو و برۆیەکی تیژی باریکەوە کە وێدەچوو سروشتی بن و کاری دەست نەبن، لەگەڵ زوڵفێکی تێك ئاڵاوی دانەهاتووی کاڵەوە خۆی کرد بە ژوورەکەدا. باڵایەکی ناوەندی هەبوو کە بەلای کورتیدا دەینواند، لێ زوڵفە ئاڵۆزکاوەکانی بزوابوونە سەر ئاوی لێوانی و بەهۆی بارانی چاوی و لیکی بەردەوامی تەڕ بووبوون. لق و پۆکانی زوڵفی وەکو درەخت سێبەریان لە ڕووی کردبوو، خشڵەکانیشی لەگەڵ ترس و لەرزینەکەیدا سەمایان دەکرد، وەك بڵێی لەگەڵ زوڵفەکاندا دوو لەشکری مەزن بوون و خۆیان پێك دادەدا، لێ ئەوەی لەم نێوەندە زیانی بەردەکەوت مرۆی عاشق بوو. با لێگەڕێین پیرە پیاوەکە خۆی بیگێڕێتەوە.

ئەوە گەڕامەوە هەروەکو گوتم. میوانەکەمان تۆزێ سەیربوو، نازانم چۆنت بۆ وەگێڕم. کچێکی لاوبوو لە دەرگاکەیدا، نازانم چی لەبەردابوو، ئەها وابزانم عەزیەیەکی ڕەشی کۆن بوو کە ئاسەواری دڕاوی پێوەبوو، هەر زوو دیاربوو کە کێشەیەکی گەورەی هەیە.

ئەو دەمەی چاوی بەمن کەوت تۆزێ واق بوو لە جێگەکەی خۆیدا، دواتر بە شێواوی ڕایکردە ژوورەکەم و قۆڵی گرتم و بە دەنگێکی تەژی لە ترس و گریانەوە تکای لێکردم کە بیشارمەوە. بەر لەوەی دانیشمەوە خێرا خۆڵی سەر زەمینەکەم بە دەست بڵاوە پێکرد و تەختەکەم هەڵدایەوە کە لە ژێرەوەی ژێر زەمینێکی چکۆلەی پتەوم چێ کردبوو. خۆشبەختانە ئێستا کچەم لەوێ

حەشارداوە و چ کەس تواناى دۆزینەوەى نییە. نازانم ئەم ژێر زەمینەم بۆچی چێ کردبوو، لەڕاستیدا مرۆڤ لە تەنهاییدا دەست بۆ کاری سەیر سەیر دەبا، ئەها دەبینی ئەوەش سوودێکی هەر هەبوو، مرۆڤ قەت بێ کار دانەنیشێ چاکە.

ئای خودایە دەنگی گریانی ئەم کچە ئەندێشەی پەڕاگەندە کردووم، پێویستە پرسیاری لێ بکەم، پێدەچێ کەسانێك لەدوایەوە بن و ئازاری زۆریان پێگەیاندبێ. دەبینی مرۆڤ گەیشتۆتە چ حاڵەتێکی دڕندەیی کە ئازاری کچۆڵەیەکی بێ دەسەڵات بدا.

+ خاتوون تکایە هێمن بەرەوە ئێرە شوێنێکی سەلامەتە و دەستیان پێت ناگا، ئایا دەتوانم یارمەتیت بدەم؟ ئای خودایە خۆ ئەمە نایەتە گۆ لەبەر گریان! مەترسە کچم من وەکو باوکت وەهام، شەرمم لێ مەکە و هەموو شتێ بێژە، بەڵێنت پێ دەدەم بە دڵسۆزی گوێت بۆ ڕادێرم.

کچە بە هاوارێکی نزمەوە: نامەوێ، نامەوێ وەکو باوکم وەهابی، ئەو دڕندەیە دڕندە.

+ بۆچی کچەکەم، چی ڕوویداوە؟ دەمەوێ قسەم بۆ بکەی، بەڵکو بتوانم یارمەتیت بدەم.

ئای خودایە دیسان دەرگایە، خەریکە لەبن ڕا دەری بێنن، ئەمانە لە کەسێك و دووان ناچن، ئیمڕۆ چیم لێ قەوماوە، هاتم هاتم کاکە خەریکە ژوورەکەم بەسەردا برمێنن.

باشە دووبارە بەجێت دێڵم هاوڕێ، وەكو گوتم نووسراوەكەت دانەنێی، ئیمڕۆ كێشەیەك لەگۆڕێ دایە و پێویستە بەیەكەوە چارەی بكەین.

ئەوە دووبارە هاتمەوە، دوای ئەوەی دەرگاكەم واڵاكرد چەند كەسێكی ئاتەشی[1] بە هەڕەشە و چەكەوە هێرشیان هێنا بۆ ژوورەكەم و پرسیاری كچەیان كرد و خەریك بوو بمكوژن، بەڵام خەمبار مەبە، نە هیچیان بەدی كرد و نە منیش هیچم دركاند، لێ یەكێكیان پاڵێكی بەهێزی پێوەنام و پشتاوپشتی خستم، خەریكە ئێستا هەست بە ژانەكەی دەكەم. چابوو ئەو نامرۆڤانە بەدەست بەتاڵی دەرچوون و چیان لێ نەكردین. دەی كچم ئێستا سەرهاتی خۆتم بۆ وەگێڕەوە، ئەوەتا پیاوكوژەكان ڕۆیشتن و ترسێك لەو ناوەدا نەما. هەموو شتێكم بۆ باسكە، بەڵكو چارەسەرێ بدۆزینەوە، وەلێ جارێ لە ژێر زەمینەكەدا مەیە دەرێ، پێم وابێ ئەوێ لێرە خۆشترە، زۆر جوانم سازاندووە و دەتوانی لەوێ پتر ئارامی خۆت وەرگری.

دوای ئەوەی تۆزێ خامۆشی بەسەر ژوورەكەدا ڕابورد خۆشبەختانە كچەی هەڵاتوو بە دەنگێكی گریاناوی دەستی بە قسان كرد.

- ناوم لیایە، لە خانەوادەیەكی پارەدارم، وەلێ خۆزگە هیچمان نەبوایە، پارە سەری باوكم و براكانمی خواردووە و كردوونی

---

(١) ئاتەشی: مرۆڤی زۆر تووڕە

بە کەسانێکی درِندە. دەیانهەوێ بەزۆری لە کاربەدەستێکی دەوڵەمەند مارەم ببڕن، وەلێ من لە ڕۆژی مارەکردنەکەمدا هەڵاتم، بەڵێ هەڵاتم و ئەم ڕێگا مەرگاویەم پێ چاتربوو لەو ژیانەی ئەوان دەیانهەوێ بۆم. تۆش لەسەرت پێویست نییە خۆت بخەیتە مەترسیەوە لەبەر من، بۆیە پێویستە لێرە بڕۆم.

+ نا هەرگیز، نایەڵم خانمێکی شۆخی وەکو تۆ بە تەنها بەم دەشت و بیابانە بکەوێ، هەزاران درِندە لە دەرەوە هەن دەزانی؟ بۆیە هێمن بەرەوە و چیرۆکەکەتم بە تەواوی بۆ وەگێڕە. بەیانی هەرچۆنێ بێ خۆم دەگەیەنمە دێکە و ڕادەستی کەسانێکی متمانە پێکراوت دەکەم تاوەکو کێشەکەت لەگەڵ ماڵێ بۆ چارکەن، وەلێ ئیمڕۆ پێکانم زەوی ناگرن و نازانم بۆ هێندە بە ئێش و ماندوون.

- هەرگیز، هەرگیز ئەوە نابینی بگەڕێمەوە ماڵێ و بە دەستی ئەوان بمرم، یان ڕێگایەکم نیشاندە ئەم شارە بەجێ بێڵم، یاخود بە دەستی خۆت بمکوژە و لێرە بمنێژە. نازانم ئێستا چیان بەسەر باڵادا هێناوە، چارەنووسی ئەویش وەکو من ونە.

+ باشە بۆم بدوێ بزانم چیرۆکی تۆ چی یە، لێ چاوەڕێی ئەوە مەبە بەم چەشنە وازت لێ بێنم بەرەو مەرگ بڕۆی. خۆ ژێر زەمینەکە نارەحەتت ناکا کچم؟

- نەخێر جێگایەکی ئارامە، مرۆڤ لەژێر زەمیندا بەند بکرێ چاترە لەوەی زەلیلی بەر دەستی نامەردان بێ. ئەگەر چیرۆکی

خۆم بێژم گوێم لێ ڕادەگری؟ پێم بێژە تخوا گوێم لێ ڕادەگری، یاخود تۆش وەکو ئەوانی دی تێم ناگەی و سەرزەنشتم دەکەی؟

+ بەڵێنت پێدەدەم تێت بگەم و هەوڵی چارەسەریش بدەم، متمانەم پێ بکە و بۆم بدوێ کچم، لەمێژە هیچ کەسێ بۆم نەدواوە و گوێم لە ئازاری چ کەس نەگرتووە.

- ئاخر هەموو شتێك بڵێم؟ تەنانەت گەر باسی عیشقیش بێ؟

+ بەڵێ تەنانەت گەر باسی عیشقیش بێ.

دوای کەمێ لە شەرم و بێدەنگی کچە دەستی پێکرد: من کچێکی خوێندکارم، لە قۆناغی دووەمی کۆلێژی ئەندازیاریم، گوپچڕی[1] زۆرم چەشت تاوەکو گەیشتم بەم قۆناغە، چون ماڵەوە نەیان دەویست لە خوێندن بەردەوام بم، هەمیشە بە سووك و ڕیسوا تێیان دەڕوانیم. ئاخر ئەوان دەڵێن نابێ کچ لە خزمەتی پیاو بەولاوە چ کاری دی هەبێ. زۆر لێیان پاڕامەوە تاوەکو لە خوێندن دام نەبڕن، سەرەنجام بەوە ڕەزامەندیان دەربڕی کە چاودێرێکم ڕەگەڵ کەوێ. ئەها بەڕاست، بیرم چوو بێژم کە دایکیشم نەماوە، ئاخر گەر دایکم مابا دڵنیابووم شتێکی بۆم دەکرد، بەڵێ دڵنیام دەیکرد. ئای بێ دایکی چی لە مرۆڤ دەکەی!

---

(١) گوپچڕی: دژواری

لاوێك لە كۆلێژەكەمان بوو بە نێوی باڵا، هەمیشە باسی حیكمەت و هەندێ دەقی ئاینی دەكرد كە تەواوی قوتابیان، بگرە مامۆستاكانیشی سەراسیمە دەكرد لە گوتەكانی.

ئەو كەسێكی ئاسایی نەبوو، ئەوحەكیمێكی مەزن و لەبلەبان بوو[١]، ئەو لەگەڵ كتێب ژیابوو، ئەو بە عیشق گۆش كرابوو، ئەو هەر بەڕاستی باڵابوو. دەتگوت دایكی لەبری شیر نان و حیكمەتی داوەتێ. من ئەوم خۆشویست، بەڵێ ئەوە من بووم ئەوم خۆشویست و خەتاكە هی من بوو، ئاخر لاوێكی وەها جوان بۆچی دەبێ بكەوێتە مەترسیەوە لەبەر من پێم ناڵێی؟! لەناوچوونی ئەو لەناوچوونی هۆزێك بگرە گەلێكە. حەیفە گەلێك بەدەستی نەزانێك بلەقێ و بكەوێتە مەترسیەوە.

+ ببوورە كە گوتەكانت پێ دەبڕم كچم، وەلێ هەمیشە ئەوەی لەناو دەبردرێ و ڕووبەرووی مەترسی دەبێتەوە جوانییە، هیچ كەسێ یەخەی ناشیرینی و تەڵخی ناگرێ و كارێكی پێیدا نییە، دەبینی هەمیشە هەورە بروسكە لە چیا بەرزەكان دەدا و كامە بولبولیش جوان و ڕەنگین و خۆشخوانە لە قەفەسی ئاسنین دایە. ئاخر گوڵ ئەگەر ئەم جوانی و بۆن خۆشیەی نەبوایە نەدەخرایە سەر ئاگر بۆ چێكردنی گوڵاو. مەگەر نەتبیستووە خەیام گوتی:

---

(١) لەبلەبان: قسەزانی و ڕەوانی لە گفتوگۆ

ئـەو گوڵەی خستیانە ئاگر بــۆ گوڵاو گریا بــە جـــۆش
دەیچریکاند خۆزگە هەرگیز نەمدەبوو من بۆنی خۆش

- بەڵێ بێگومان چاکت لێ تێدەگەم، خۆشحاڵم کە ئەم هۆنراوەیەم لێ ژنەوتی، مادام خوێنەری ئەدەبی کەواتە لێت ئەرخەیانم[١] و گومانم لە دڵ نەرمی و سۆزداریت نییە.

دەمەوێ بەردەوام بم لەسەر قسەکانم. من تەواو شەیدای باڵابووم، هێندەی سەرسامی ناوەڕۆکی بوو بووم ئەوەندە هزرم بەلای جەستەیدا ڕانەدەبورد. ئەو هەمیشە لەمەڕ عیشقێك دەدوا کە ماددە نییە و دوورە لە جەستە، بەبیرم دێ جارێك دێڕێکی مەولانا جەلالەدینی خوێندەوە کە دەیگوت:

عیشقێك سەرچاوەی ڕوخسار و ڕەنگە
هـەر عیشق نییـە، عــاقیبەت نـەنگە

من وازم لە باڵا نەهێنا تا سەرەنجام ئەویشم شەیدای خۆکرد، خۆزگە ئەو ڕۆژە دەمردم و ژیانی ئەوم نەدەخستە کێشەوە، بەڵێ خۆزگە مردبام. ئەوینی باڵا دەستی لەزۆر شت پێ هەڵگرتم، خوێندنەوەی دەقە ئاینیەکان و کتێبی پەڕ زەردی حەکیمە کۆنەکان ببووە پیشەی ڕۆژانەم، تەنانەت کاری لە شێوازی جل و بەرگ و ڕۆیشتنیشم کردبوو. ئێستا تۆ بە جلێکی نیمچە

---

(١) ئەرخەیان: دڵنیا، بێ خەم

ڕووتی دڕاو و کاکۆڵێکی پەرێشانەوە منت بینی ئەوە من نییم، بەڵکو براکانم بەزۆر لەچکەکەیان پێ فڕێدام و ئاوەهایان بەسەرهێنام کە دەیبینی، تەنانەت ئەو دەمەی زانیان خەریکی خوێندنەوەی کتێبێکی ئاینیم لە ژوورێدا بەندیان کردم و زۆر دڕندانە لێوەکانمیان بە دەرزی و داو دروومان کرد تاوەکو چیدی نەتوانم بخوێنمەوە.

بەڵێ ئەمە هەموو ئازادیەکەی من بوو کە لێرە و لەوێ باسی لێوە دەکرێ.

دوای ئەوەی چاودێرەکەم هەستی بەو ئەوینەی من کرد لای براکانم شکاتی لێکردم، ئەو ڕۆژە زۆریان لێدام و نەیان هێشت چیدی پێ بخەمەوە کۆلێژ. دواتر باڵا کەس و کاری خۆی ناردبوو بۆ خوازبێنیم، وەلێ باوکم و براکانم بە شێوازێکی زۆر نامرۆڤانە هەڕەشەیان لێ کردن و دەریان کردن. لە حەژمەتان بەشێك لە کەزیەکانی خۆم بە مەقەست پچڕاند کە زۆر لە ئێستا درێژتر بوون. هەواڵم بە یەکێکدا بۆ باڵا نارد کە ئیدی واز لەمن بێنێ و ژینی لاوەتی خۆی نەخاتە کێشەوە، لێ ئەو هەر جارە و چەند پیاوماقوولێکی دەنارده ماڵمان و بە دڵ شکاوی دەچوونەوە. ڕۆژێکیان تاقیکردنەوەیەکی گرنگمان هەبوو، زۆریان لێ پاڕامەوە کە هەر ئەمڕۆ مۆڵەتم بدەن بچمە کۆلێژ و ئیدی سەری پێدا ناگرمەوە، وەلێ بێ سوود بوو. لەڕاستیدا من هەر بۆ ئەوەم بوو کە باڵا ببینم و قایلی بکەم دووركەوێتەوە بەر لەوەی

شتێکی لێ بکەن. شەوێکیان کە تازە خەو چووبوویە چاوانم، لەنکاو بە دەنگێکی نزمی کەسێکی ئاشنا واگاهاتم کە نەمزانی ئاخۆ خەوە یاوەخۆ هەر لەڕاستیدا ئەوە خۆی بوو! شتێك کە هەرگیز چاوەڕێم نەدەکرد، ئاخر هەر زۆر زۆر سەیربوو، باشە باڵا لەوێدا چی دەکرد و بۆچی هاتبوو خوایە! ئاخر ئەو بەبێ مۆڵەت تەنانەت قسەشی بۆ کەس نەدەکرد چ جای ئەوەی بێ مۆڵەت بڕواتە ماڵێکەوە و ژووری کچێکی گەنجیش! تا ئێستاش لەم پرسیارەدا سەراسیم ماوم! باڵا هەرگیز کاری وا ناکا، نەخێر دڵنیام ئەوە خۆی نەبوو، هەر زۆر لەوە دڵنیام کە ئەو کوڕە فێڵێکی لێ کرابوو، چاوەنووڕی ئەوەم ڕۆژێ ئەم وەڵامە وەچنگ خەم بەر لەوەی بمرم، بەڵێ هەر دەبێ وەچنگی خەم.

من یەکسەر بە باڵادا واق بووم[1] و نەمزانی کە ئەمە ڕاستیە، سەیرەکە لەوەدابوو کە بەر لەوەی باڵا دەم بکاتەوە و پێم بێژێ بۆچی هاتووە یەکسەر لەدواوەڕا یەکێ لە براکانم دەرگاکەی واڵا کرد و دەستی بە فیشەك تەقاندن کرد. من لەبەر هارژن و گریان هەر ئەوەندەم بینی کە باڵا خوێنی پێدا دەهاتە خوارێ و لە پەنجەرەکەوە هەڵهات. ئیدی نازانم چەند فیشەکی بەرکەوتبوو، ناشزانم تا ئێستا ماوە یاخود نا، وەلێ دڵنیام کە فێڵێکی مەزنی لێ کرابوو.

---

(١) واق بوون: سەر سوڕمان



+ گریانەکەت ڕاگرە و بەردەوام بە، دوایی چەندی دەتەوێ بگری، لێ ئێستا بەردەوام بە کچم.

- چۆن بەردەوام بم چۆن لەکاتێکدا جەرگم هەلا هەلا کراوە، ئاخر بۆ خۆم بگریم یان بۆ ئەو، تۆ پێم بێژە تخوا بۆ کامیان بگریم؟ دەبێ ئازاری کەسێك چی بێ کە نازانێ ئازیزەکەی مردووە یان ماوە، ئاخر تاوانی من جگە لە عاشق بوون چی بوو؟ من تەنێ عاشق بووم نەوەك دڕندە.

+ دواتر چی ڕوویدا؟

- دواتر هەر لە ژوورەکەی خۆمدا بەستمیانەوە و هێندەی پێیان خۆشبوو تێیان هەڵدام تاوەکو لە پەل و پۆ کەوتم، سێ ڕۆژ هیچم بۆ نەخورا. ڕۆژێك کە چاوەڕێی مردنم دەکرد لە ژوورێدا هەر هێندەم زانی باوکم و براکانم بە زەردەکەنیەوە لێم وەژووریێ کەوتن و گۆشتی سوورەوەکراویان بۆم هێنابوو لەگەڵ نان و سووپی گەرمدا. لەبەردەمم دایان ناو بە گوتەی خۆش و خەندە ئامێز زۆریان لێ دەکردم تا بیخۆم. سەرم لەوە دەرنەدەچوو! ئاخر چۆن سەرم لێی دەرچێ کە چەند ڕۆژێك بەر لە ئێستا لەبەر دەستیان وەکو مردووم لێ هاتبوو، خوێن بە ڕوخسارمدا دەهاتە خوارێ، ئێستا هەر ئەم برایانە ئاوەها بە خەندەوە گۆشتی سوورەوەکراوم پێ دەدەن!

چەند ڕۆژێك زۆر بە خزمەت ڕایان گرتم و کام خواردنەی چێژ بەخشە و کام جلەی جوانە بۆیان دەهێنام تاوەکو برینەکانم چاك بوونەوە و هاتمەوە سەرخۆ، تەنانەت خانمێکیشیان بە کرێ گرتبوو کە ڕۆژانە ئارایشتی دەدام. من هێندە لەخۆم و لەوان بێزاربووم کە نەمدەویست هۆکارەکەیشی بزانم، لێ دەمزانی چشتێکی لەپشتە. لەتاوی باڵادا جەرگم دەکوڵا، بەڵام نەمدەوێرا هیچ شتێ دەربارەی ئەو کوڕە بێژم.

ئەم خزمەتە تاوەکو ئیمڕۆ بەردەوام بوو، ئیمڕۆ بەیانی زوو واگایان هێنام و خانمەکەی جاران هات و زۆر لە ڕۆژان پتر ئارایشتی دام و کام جلەی جوان و تازەیە لەبەرمی کرد.

لەپڕدا لەدەرگا دراو لە پەنجەرەکەوە ڕوانیم کۆمەڵێ پیاو بە جلی کەشخە و مۆدێلەوە وەژووریێ کەوتن کە لە کەسی ئاسایی نەدەچوون. گوێم لێبوو باوکم گوتەی خزمەتکارانەی بۆ یەکێکیان دووپات دەکردەوە. دوای کەمێ یەکێ لە براکانم لێم وەژووریێ کەوت و پێی گوتم کە ئەمانە بۆ داوای من هاتوون و کەسانی گەورەن و پلەیان لە حکومەتدا هەیە، بۆیە پێویستە زۆر ڕووخۆش دەربکەوم، گوتیشی ئیدی دەرگای بەختت کرایەوە و دەکەویە نێو ژینێکی لێوانلێو لە چێژی جاویدانی. هێندەی نەبرد باوکم لەگەڵ پیاوێکی هاوتەمەنی خۆی هاتنە ژووریێ و بەبێ هیچ پێشەکیەك گوتی کچم لەمڕۆوە تۆ موڵکی ئەم پیاوەی و ئەمەی دەیبینی هاوسەری تۆیە، نووکە لەگەڵیاندا دەڕۆی و

ئومێدی ژینێکی بەختەوەرانەت بۆ دەخوازم. من خۆم بۆ نەگیراو لە هارژنی گریانێم دا، ئاخر ئەو لە تەمەنی باوکم بوو، لەلایەکی دی چۆن دەکرا ئاوا ئاسان باڵا فەرامۆش بکەم. ئەو دەمەی زانیان دەگریم باوکم پیاوە پیرەکەی بە گوتەی خۆش بردە دەرێ و دوو لە براکانمی ناردە لام. سەرەتا هەوڵیان دا بە قسەی خۆش ڕازیم بکەن و شەرمەزاری میوانەکان نەبن، لێ ئەمجارە دەنگی گریانەکەم بەرزتر کرد تاکو میوانەکان بیژنەون و بڕۆن. هێندەم زانی ژاوەژاوێك لەژووری ئەودیو سەری هەڵدا و میوانەکان هەڵسان. براکانم کە دەرکیان بەمەکرد وەکو ئاژەڵ پەلاماریان دام، پاشان دەرگاکەیان لەسەر گاڵەدام و بەپەلە چوون تاوەکو میوانە ڕۆیشتووەکان ئاشت بکەنەوە. ئەمەم بە دەرفەت زانی و لە پەنجەرەکەی پشتەوە خۆم هەڵدایە ئەودیوی خانوەکە و هەڵهاتم. خەریك بوو قاچەکانم بشکێن، لێ هێندە ئازاری دەروونیم هەبوو کە جەستەم لەیاد چووبوویەوە. ئێستاش وا دەبینی لەلای تۆم و سەراسیمەم لەوەی بەرەو کوێ هەنگاو هەڵگرم. هەر ئیمڕۆ سبەیە دەمدۆزنەوە و دەمکوژن، ئاخر بۆ کچێکی لاو لەم زەمەنە پڕ ئاشووبە ماڵێ جوانترین جێگایە، وەلێ گەر لە ماڵەوەش کوشتارگەیان بۆ چێکردبێ دەبێ ئەم کچە ڕوو لە کوێ بکا؟ تۆ وەڵامم بەرەوە ڕوو لە کوێ بکەم؟ ئەی هاوار جێگایەکم پێ بڵێ، یان هەر بمکوژە و با بەدەستی تۆ بمرم چاترە لە دەستی ئەوان.

+ ئۆخژن[1] بەوە کچم، بەرەو جێگایەکی ئارام هەنگاوت هەڵگرتووە، ئومێدم وایە بەیانی بتوانم شتێکت بۆ بکەم. هەردووکمان سەرهاتی ناخۆشمان هەیە، لێ من ئەوەی تۆم بیست و تۆ هی منت نەبیست. دەتوانی کارێکم بۆ بکەی؟

- ئەرێ، من لە خزمەتی تۆم مامە گیان.

+ دەستی نووسینت چۆنە؟ یانی دەتوانی ئەو گوتانەی دەیڵێم بیان نووسیەوە، بەڵکو بتوانین تا بەیانی یاداشتێك، رِۆمانێك، شتێکی لەم بابەتە چێکەین و کەسانێك لەدوای ئێمە بیخوێننەوە؟ من بەر لەوەی تۆ بێی تاکو ئێستا هەر دەنووسم، وەلێ قسەگەلێکی هەڵیت و پەڵیتن و دەمهەوێ ئێستا بیاندرِێنم و سەر لە نوێ بەیارمەتی تۆ دەست بە رِۆمانێکی گرنگ بکەم، چون گەر من بیڵێم و تۆش بنووسی کاتێکی باشمان بۆ دەگەرِێتەوە.

لیا بە پێکەنینەوە: رِۆمان! چەند سەیرە! من لێرەدا چاوەرِێی مردن دەکەم کەچی رِۆمان بنووسم؟!

+ بەڵێ کچم بینووسە، مەرگ چییە؟ تۆ لەبەر مەرگ غەمباری! ئەگەر ئەوە بیرکردنەوەت بێ کەواتە خوێندەواریەکەت چ سوودێکی پێت گەیاندووە؟ چشتێ کە هەموومان بۆی بچین و

---

(١) ئۆخژن: ئارام

هیچ کەسێ تێیدا سەرپشك نەبێ مەگەر غەمباری دەوێ؟ بۆچی نەتبیستووە نێردراوی مەزن فەرمووی: ئەگەر ڕۆژی دوایی هاتە پێش و لەدەستی یەکێکتان نەمامێك بوونی هەبوو با بیچێنێ.

ئێستا لە دڵی من سەدان نەمام هەن کە دەمهەوێ لەسەر کاغەزەکانیان بچێنم، تۆ یارمەتی دەرم دەبی یان نا؟

- ئای ئەم گوتانە چەند جوانن! بەڕاستی هیوا بەبەری مرۆڤی تۆراودا دێننەوە، بێگومان یارمەتی دەرت دەبم. باشە مرۆیەکی وەك تۆ قەشەنگ لەم چۆڵیە چی دەکا خوایە! بۆچی دەبێ ئاوا جوانیەکان فەرامۆش خراوبن؟!

+ ئێستا سەری ژێر زەمینەکە واڵا دەکەم و دەفتەر و پێنووسێکت بۆ دێنم، کاتی ئەوەیە هەندێ نانیش بخۆی، چون مرۆ بێ نان کاری بۆ ناکرێ، ئەوە سەموونێك و تۆزێ شیرە کە من بۆم نەخوراوە و دیارە بەشی تۆ بووە. ئێستا ئەمانە بگرە و دوای پێنج خولەکی تر دەست پێدەکەین.

دوای پێنج خولەکەکە پیرە پیاوەکە هاتەوە گۆ: بەڵێ ئەوە کاتەکە تەواو بوو، پێنووسەکەت لەدەستە؟

- بەڵێ بێگومان، چاوەڕێی زاری تۆم.

+ بەم ناونیشانەی دەیڵێم دەست پێبکە و دواتر بەردەوام ئەوەی لەزارم دێتە دەرێ بیخە سەر کاغەزەکان.



## سەردەمی زێڕین



ئێمە لە مەملەکەتی شاهێن داین، لەوانەیە ئەم ناوەت نەبیستبێ، لێ ئێرە شارێکی تەواو جوداواز و مەزنە. لێرە دیمەنەکان تەواو قەشەنگ تر دەنوێنن، جوانیەکان چەند هێندەن، جێگا ناوازە و شوێنەوارە دێرینەکانی ئێرە لەوەی دەرچوونە بچنە بەر ژمار. ڕۆژانە کەسانێ بۆ گەشت دێنە ئێرە تەنێ بۆ تێڕامانی شوێنەوارەکان، ئەمە جگە لەم هەموو شاخە سەرکەش و تەلان و بەندەن[١] و سەوزاییە قەشەنگەی لێرە بوونیان هەیە. لە بوارانداا دەبینی کە چۆن گوڵە ڕەنگینەکان تێك ئاخنیون و ئامێزی ئەوینیان لێك داوە، تەنانەت لەنێو پووشی وشکیشدا چێنکان[٢] بەدی دەکەی. لەو پەلك و پارەی لە دارەکان دەبوونەوە و ڕۆژانە چەند وێنەکێش بەدیاریەوە ڕووەنیشتن هەر مەپرسە. بۆ ناوەکەشی بەمن وایە هەر لەبەر ئەوەبوو کاتی خۆی ئێرە باڵندەی شاهێنی زۆربووە، گەرچی ئێستا لەچاو جاران قل قلەی لێ دەبینی. ئەوەش بزانە کە خەڵکانێك دێنە ئێرە هی جێگا قەشەنگ و هەڵکەوتەکەیەتی دەنا پێم وانییە هیچ لە شار و وڵاتانی دەوروبەری سەروبەندیان لەگەڵ حوکمی ئێرە خۆشبێ و پێی

---

(١) بەندەن: کێو، کەژ

(٢) چێنکە: پەڵە سەوزایی لەناو پووشی وشکدا

ڕازی بن. لات سەیر نەبێ کە شاهێن لەلایەن پاشایەکەوە بەڕێوە دەچێ کە زۆر حەزی لە حیکمەتە و حەکیمەکان لێرە بایەخێکی یەکجار زۆریان هەیە و چەندین قوتابخانەیان بۆ کراوەتەوە، تەنانەت پاشا خۆی پرس و ڕایان پێدەکا بۆ بڕیاردانەکانی.

ئەگەرچی یاسای ئێرە ئاوایە کە دەبێ هەرچی حەکیمە وەکو هەژاران بژین و ماڵ کۆنەکەنەوە و تەنێ خەریکی خزمەت و گوتنەوەی حیکمەت بن، لێ ئەوەندە هەیە کە خەڵکی هێندە بەرئەمری حەکیمانن لە شتی بچووکیشدا پرسیان پێ دەکەن و لە قسەیان دەرناچن. زۆرێك لە خەڵکی بە سوپاسەوە ئامادەن خواردنیان بۆ چێکەن و یارمەتیان بدەن لە بەرامبەر ئەو خزمەتەی حەکیمان بێ بەرامبەر بە خەڵك و شارەکەی دەکەن.

ڕۆژانە بازێ لە خەڵکی مناڵەکانیان دەنێرن بۆ حیکمەتخانەکان تاکو لای حەکیمان بخوێنن، لێ دەتوانم بڵێم لە سەد منداڵ دانەیەکی دەبێتە حەکیمێکی باش و ئەوەی دی ناچار دەبێ واز بێنێ و دەست بداتە ئیش و کار. ئەمەش لەبەر ئەوەیە حیکمەت زانستێکی فراوانە و هەموو کەس ناگاتە پایەی حەکیم بوون. دەبێ ئەوەش بێژم کە لەم شارەدا ڕاستە حەکیم زۆرن، لێ چەند دانەیەکیان خاوەن حیکمەتی فراوانن و ڕوانینی پاشا و خەڵکیش پتر لەسەر ئەوانە. هەر ئەوانیش بەرنامەی خوێندن بۆ تەواوی قوتابخانەکان دادەنێن و ئەوەی لای ئەوان پێ بگا بە چاوێکی بەرزتر تێی دەڕوانرێ. هەموویان لێرە گوتەی حەکیمی مەزن

و نێردراوەکەی دووپات دەکەنەوە و ڕوونی دەکەنەوە، ئەو حەکیمە مەزنەی کە چاوەکان نەیان بینیوە و بە هەستەوەرەکان هەستی پێ نەکراوە، لێ حەکیمان دەڵێن حیکمەتەکانی ئەو هەموو سەر زەوی و ئاسمانەکانی داگرتوە و هەر ئەویش بنیاتنەری حیکمەتە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم حەکیمە مەزنە نەبینراوە بۆ ئەوەی حیکمەتەکانی خۆی پتر بۆ خەڵکی دەرخا نێردراوێکی ڕێزداری بۆ خەڵکی ناردووە کە ئاگاداریان بکاتەوە لە هەبوونی حەکیمی مەزن و حیکمەتەکانی، کە ئێمە پێی دەڵێین نێردراوی حەکیمی مەزن و لەدوای حەکیمی مەزن ئەو کەسی دووەمی جیهانە کە گوتەکانی بە بەرزی و بەڕێزی ماونەتەوە.

خەڵکی ئێرە بۆ بژێوی ژیانی هێندێکی خەریکی ئاژەڵدارییە و ماست و دۆ و پەنیر و کەشك و کەرە و ژاژی و لۆر و خەستەی خۆش و تامدار چێ دەکەن، بازێکی دیش خەریکی بێستان و جۆت و دورنە و دەستاڕ و ساوار کوتانییە.

ڕۆژانە منداڵان لەژێر ئاسۆکی[١] چیاکان کۆدەبنەوە کە جۆباری[٢] باریکەلە و دڵڕفێنیان بەبەر دەمدا دەڕوا. لەوێدا گۆڕەپانێکی قەشەنگیان سازداوە بۆ یاری کردن و دوای عەسران تا ڕۆژ ئاوا دەبێ خەریکی کێلە بەردانێ و جگانێ و چاوشارکە و گێ

---

(١) ئاسۆك: سێبەر

(٢) جۆبار: جۆگە

فڕكانێ و سێ ڕیزكانێ و چەندین یاری دی دەبن. هێندێ جاریش هاوینان كە دەغڵ و دان دەدرویێتەوە بەنێو گۆڕەپانی جۆخینان وەردەبن و قەنگەڵاشك[١] و بنە سوڕناتكی[٢] گەورە خڕ دەكەنەوە و داوەبەنی لێ گرێ دەدەن و یاری تاژتوولەی پێ دەكەن[٣].

سوهەیل یەكێكە لە منداڵەكانی شاهێن، هەر لە زووەوە لەلایەن باوانیەوە نێردراوەتە بەر خوێندن لە قوتابخانەی مەزنی حیكمەت. دەتوانم بێژم ئەم قوتابخانەیە گەورەترین قوتابخانەی شاهێن بوو كە چەندین حەكیمی مەزن وانەیان تێدا دەگوتەوە. پڕۆگرامی هەموو قوتابخانەكان چونیەك بوو، كە بریتی بوو لە كۆمەڵە كتێبێكی كۆنی حەكیمانی زەمانی زوو. دەستنووسە بنەڕەتیەكەیان لەلای حەكیمێكی گەورە پارێزراو بوو بەنێوی دانیالی حەكیم. هەرچەندە ئەم كتێبانە گەلێ ڕەق و گوپچڕ بوون بۆ قوتابی، لێ گەر قوتابی فێری ئەم كتێبە زەرد و دەستەواژە كۆنە ڕەقانە ببا كەسێكی هێندە بلیمەتی لێ پەیدا دەبوو كە كتێبانی دیكەی وەكو خواردنەوەی قومێك ئاو دەهاتە بەرچاو.

---

(١) قەنگەڵاشك: دڕكی كەنگرە دوای وشك بوونی

(٢) سوڕناتك: گیایەكە لە كۆتایی بەهار و سەرەتای هاویندا لەناو شۆ و وەردان شین دەبێ كە مەڕ و بزن بیخۆن.

(٣) ئەمانە ناوی كۆمەڵێك یارین كە لە زەمانی زوودا منداڵان دەیانكرد.

لەم قوتابخانەیە بۆ هەر وانەیەك حەكیمێكی تایبەت دانرابوو، ڕۆژانە لە كاتی خۆی دەچوویە ژوور و پیت بە پیت كتێبەكەی بۆ قوتابیان شیدەكردەوە بەبێ ئەوەی قوتابی بەژداری لە وانەكە بكا، مەگەر پرسیارێكی بۆ چێ بووبا یاخود لە شتێ حاڵی نەبووبا، دەنا لەسەر چۆك ڕوودەنیشت و نقەی لێوە نەدەهات. ماوە ماوەش قوتابیان تاقی دەكرانەوە و ئەوەی نمرەی زۆرباشی نەهێنابا دەبوایە بەبێ دەنگی لە حیكمەتخانە بڕوا و بۆخۆی كارێكی دیكە بدۆزێتەوە، هێندێكی دیشیان دێنایەوە كتێبی پێشووتر ئەگەر زانیبایان چاك تێنەگەیشتوون. ئەمە وایكردبوو تەنیا قوتابیە زۆر زیرەكەكان شانسی بوون بە حەكیمیان هەبێ. هەفتانە تەنێ دوو ڕۆژ پشووی قوتابیان بوو كە بۆیان هەبوو بچنەوە ماڵێ و تەواوی ڕۆژەكانی دی دەبوایە لە حیكمەتخانە بەسەر بەرن. لە هەمووی سەیرتر لەوێ ساڵ دیاری نەكرابوو بۆ دەرچوونی قوتابی، بەڵكو بەپێی بلیمەتیەكەیان هێندێ بە هەشت ساڵ و هێندێ بە دە ساڵ و هێندێ بە دوانزە و زیاتریش دەیتوانی پڕۆگرامی حیكمەتخانە تەواو بكا و مۆڵەتنامەی حەكیمی وەرگرێ. زۆرجاریش قوتابیە بچووكەكان لەلایەن قوتابیانی مەزنتر و لەپێشترەوە وانەیان پێ دەدرا و پێویست نەبوو حەكیمی گەورە خۆی وانەیان پێ بدا. ئەمەشم لەیادبێ كە ئەو دەمەی بازێ لە قوتابیان پڕۆگرامی حیكمەتخانەیان تەواو دەكرد ئاهەنگێكی مەزنیان بۆ سازدەكرا و بەرگی حەكیمیان لەبەر



دەکردن. زۆرێك لە خەڵکی شاری بەژدار دەبوون و شیرینیان بە یەکدی دەبەخشیەوە.

سوهەیل زۆری حەز لە قوتابخانەی حیکمەت نەبوو، زۆرجار لە قوتابخانە دەچوویە دەر و لەگەڵ منداڵانی هاوتەمەنی دەستی بە یاری دەکرد، تەنانەت بازێ جار کە لەگەڵ یاری مژووڵ دەبوو لەیادی دەکرد بچێتەوە قوتابخانە و ئێوارەی بەسەردا دەهات. ئەم کارە تەواو پێچەوانەی حیکمەتخانە بوو، چون لەوێ قوتابی بۆی نەبوو بچێتە دەرێ مەگەر بۆ کاری پێویستی و بە مۆڵەتی مامۆستا نەبێ، ئەمەش وایکردبوو سەرزەنشتی زۆری بێنەسەر، لێ گەلێ جاریش چاوپۆشی لە سوهەیل دەکرا بەهۆی ناسیاوی بابیەوە بۆ یەکێ لە مامۆستاکان.

زۆرجار سوهەیل لە ڕۆژە پشووەکاندا لەبری بابی شوانی دەکرد و زۆر خۆشی لەم کارە دەهات. تەنانەت بازێ جار لەگەڵ بابی دەچوویە شەوینێش[١]. هێندە شارەزای ئەم پیشەیە بووبوو کە هەموو جۆری ئاژەڵانی لەدوور ڕا لێك جودا دەکردنەوە. دەیزانی کامەی کاوڕە، یان شەکە و بەردیلە و کامەی بەرانە و کامەیشی گیسك و چتر و سابرێنە و کامەی ئاوسە و زاوزێی کردووە و کامەی قسرە[٢]. ئێواران زۆر بە لێهاتوویی مەڕ و

---

(١) شەوین: مەڕ لەوەڕاندن بە شەو.

(٢) بێچووی مەڕ کە لە دایك دەبێ پێی دەڵێن بەرخ، لە شەش مانگی تا



بزنەکانی دەهێنانەوە گەوڕەکە و کار و بەرخەکانی لە کۆزەکە دەکردن.

ڕۆژێك سوهەیل ئەو دەمەی لەگەڵ هاوڕێکانی لە گۆڕەپانەکە خەریکی کێلەبەردانێ بوو، لەنکاوێك چاوی کەوتە سەر مارێکی ڕەشی گەورە کە خۆی ئاخڵە دابوو[1] لە دارێکی باریکی دەو جۆبارەکە و بە سەریشی مڵۆمووشی[2] دەکرد. سوهەیل کە یەکێ بوو لە بەرد هاوێژە شارەزاکان بەردەکەی دەستی بە هێزەوە ڕاوەشاندێ و لە سەری ماری دا و مارەکە بازرەقەی[3] بەست بۆ نێو جۆبارەکە. لەدوای یاریەکە چووە ژێر ئاسۆکی چیاکە و بەتەنیا لەژێر دارێك ڕۆکەوت. ئەو دەمەی خەریك بوو خەو بیباتەوە لەناکاو دەنگێکی نەناسراوی ژنەوت کە بە پرسیارەوە پێی گوت: تۆ لە قوتابخانەی حیکمەتی؟

---

یەك ساڵی پێی دەڵێن کاوڕ، ئەگەر ئەو کاوڕە مێ بوو و ساڵێك بەسەر تەمەنیدا ڕۆیشت پێی دەڵێن بەردیل، ئەگەریش نێر بوو پێی دەڵێن شەك. لە دوای تەمەنی دوو ساڵی بە شەك دەگوترێ بەران. بە بێچووی تازە زاوی بزنیش دەگوترێ کار، کاتێك لە شیر دەبێتەوە پێی دەڵێن گیسك، کاتێك دوو بەهار تێپەڕ دەکات پێی دەڵێن چتر یان چوشتیر، ئەو دەمەی تەواو پێدەگا بە نێرەکەی دەڵێن نێری یان سابرێن، مێیەکەش هەر پێی دەڵێن بزن. ئەگەر مەڕ و بزن لە ساڵێکدا نەزێن پێیان دەڵێن مەڕە قسر، یان بزنە قسر.

(١) ئاخڵەدان: پێچ خواردنی مار.

(٢) مڵۆمووش: گەڕان و مووشەکردن بە شوێن خواردندا.

(٣) بازرەقە: لەپڕ دەرچوونی گیاندار بە چالاکی.

سوهەیل هەڵسایەوە و سەیری چواردەوری خۆی کرد و کەسی بەدی نەکرد، ئاخر ئەو زۆر لە مناڵەکان دوورکەوتبوویەوە، تۆ بڵێی ئەم دەنگە نەناسراوە دەنگی کێ بێ! بەسەر خۆی نەهێنا و دووبارە پاڵکەوتەوە، وەلێ زۆری پێنەچوو هەمان دەنگ هەمان پرسیاری بەرزتر دووپات کردەوە. ئەو دەمەی سوهەیلی بچووك کەسی نەبینی تووشی دڵەڕاوکێ و ترسێکی زۆر هات. ویستی هەڵسێ و ڕاکا بەرەو ماڵێ لەپشتیەوە دووبارە بانگی لێ کرا. سوهەیل بە لەرزینەوە ئاوڕی دایەوە ڕوانی مناڵێکی هاوتەمەنی خۆیەتی، لێ سەرێکی بێ تووك و ڕوخسارێکی ڕەش و تۆزێ ئاڵۆزی هەبوو کە لە منداڵێکی ئاسایی نەدەچوو.

لووتی بەشێوازێکی سەیر لاربووبوویەوە و نەرمایی گوێچکەکانی پێوە نەبوو، چاوەکانیشی هێندە زەق بوون کە دەتگوت وا دێنە دەرێ، ڕاستیەکەی مرۆڤ بەتەنێ با لێی دەترسا.

سوهەیل بە تووڕەییەوە: ئەوە تۆ کێی وەها زراوت بردم منداڵی ناجسن[1]، خەریك بوو لەهۆش خۆم بچم؟

- ناوم قیدارە، تۆم لێرە بینی و پێم خۆشبوو بەیەکەوە کەمێ یاری بکەین، ئەم تووڕەییەی ناوێ.

+ ئەم ناوە سەیرە چی یە! بۆچی پێشووتر تۆم نەدیوە؟ شێوەت زۆر سەیر دەردەکەوێ، ئەوە ڕوخسارت چی لێهاتووە؟

---

(١) ناجسن: نارەسەن

- ئاخر بەهۆی نەخۆشیەکەمەوە دایك و باوکم نایەڵن بێمە دەرێ لە ماڵێ، هەمیشە دەڵێن بەهۆی ڕوخسارەکەت منداڵان ئازارت پێ دەگەیەنن، لێ ئەمڕۆ خۆم لێیان دزیوەتەوە و تۆم لێرە بەدی کرد و خۆشم ویستی. ئەرێ بەڕاست تۆ لە قوتابخانەی حیکمەت دەخوێنی؟

+ بەڵێ لەوێ دەخوێنم، چۆنت زانی؟

- نازانم هەر سەرو سیمای خوێندەواران دیارە، من تەنێ ناوی ئەم شوێنەم بیستووە و زۆر بە ئاواتەوەم بۆی.

+ دەنا من هیچ حەزم لە حەکیمایەتی نییە و ماڵێ ناردوویانم.

- ئەگەر لەگەڵ من ببیە هاوڕێ و یاریم لەگەڵ بکەی زۆر شتی سەیرت فێردەکەم.

+ شتی وەکو چی؟ بابم دەیگوت ئەگەر کەسێ چاك نەناسی مەبە هاوڕێی.

- سەیری من بکە چۆن بەنێو ئەم درەختەدا دەڕۆم بەبێ ئەوەی خۆی لێبدەم.

سوهەیل بە پێکەنینەوە تێی ڕوانی و گوتی بابە شتی وا چۆن دەبێ، مەگەر تۆ تەواوی. وەلێ کە سەیری کرد هەر بەڕاستی قیدار بەنێو درەختەکەدا ڕۆیی!



+ ئای خودایە، ئەمە چیم بینی! هەر بەڕاستی تۆ چۆن توانیت ئەمە بکەی، تۆ کەسێکی ئاساییی؟!

- دەتەوێ فێربی یان نا سوهەیل، ناتەوێ هەموو منداڵەکان سەراسیمە بکەی و بە کەسێکی گەورە و ناودار ناوت بێنن، یان دەتەوێ هەر ئاوا بژی؟

+ نا دەمەوێ فێری بم، تکایە منیش فێربکە چۆن ئەنجامت دا؟

- کەواتە دوام بکەوە و پێویستە ڕاهێنان بکەین. ئەمە هێندە سانا نییە سوهەیل، ئایا بەرزترین کێوی ئێرە پێدەزانی؟

+ بەڵێ کونج بە کونجی ئێرە شارەزام.

- کەواتە با بڕۆین بەرەو بەرزترین کێو، لەمڕۆوە تۆ دەبێ نموونە بی لەنێو منداڵەکانی دی. سوهەیل ڕەگەڵی کەوت تاوەکو گەیشتنە سەر بەرزترین کێوی ناوچەکە، هێندە ماندوو بوو بوو ئەو دەمەی گەیشتن بڕستی لێ بڕا. دوای کەمێ پاڵکەوتن و حەسانەوە پرسیاری لە قیدار کرد کە دەبێ ئێستا چی بکەین.

- جوان تێم بڕوانە سوهەیل، ئێستا من بۆ ماوەی چوار خولەك زارم دەکەمەوە و هەوڵ دەدەم هەوا لەنێو لاشەمدا نەهێڵم، تەنها پێویستت بە کەمێ پەستان هەیە تاکو بتوانی تەواوی جەستەت چۆڵ بکەی لە هەوا، ئەوکات زەوی ناتوانێ ڕاتبکێشێ و دەتوانی لە ئاسماندا بوەستی.

+ شتی وا چۆن دەبێ! من باوەڕ بەوە ناكەم.

- سەیری من بكە چۆن ئەنجامی دەدەم، ئینجا لەدوای من سەرەی تۆیە، وەلێ نابێ بترسی سوهەیل، بۆ بوون بە كەسی گەورە نابێ ترسی هیچ شتێ لە دڵتدا هەبێ.

قیدار بۆ ماوەی چوار خولەك زاری خۆی بە كراوەیی هێشتەوە و دواتر چووە سەر لوتكەی كێوەكە و قاچەكانی پەڕاندەوە بەرەو بۆشایی ئاسمان و لەوێ وەستا. دوای كەمێ وەستان هەر لەوێدا لەسەر گازی پشتێ ڕاكشا و بە دەنگی بەرز قاقای لێدەدا.

ئەو دەمەی سوهەیل ئەمەی بینی چاوەكانی ئەبڵەق بوون و واقی وڕما، بڕوای نەدەكرد كە مرۆڤێك بتوانێ كاری لەم چەشنە ئەنجام بدا، بۆیە تا ماوەیەك زاری تەتەڵەی دەكرد و چی بۆ نەدەگوترا.

- دەی سوهەیل ئێستا سەرەی تۆیە، ئیمڕۆ لەپێش من ئەنجامی دەدەی و بەیانیش لەبەرچاوی هەموو منداڵەكانی دی دەبیتە پاڵەوان، یەڵا مەترسە برا.

+ وەلێ من دەترسم، ئەی گەر كەوتمە خوارێ چی؟

- مناڵێكی ترسنۆك مەبە سوهەیل، تازە نەتبینی چۆن لەپێشت ئەنجامم دا، ئایا من كەوتم؟ تۆش هەمان كار دووبارە بكەرەوە دڵنیات دەكەمەوە ناكەوی، دواتر من لێرەم چۆن دەهێڵم تۆ بكەوی.

سوهەیل هەرچەندە تۆزێ ترسی هەبوو، وەلێ ئاواتی بوون بە پاڵەوان بەسەر ترسەکە زاڵی کرد و خێرا بە هەموو توانای خۆی زاری لێك کردەوە. چوار خولەکەکە تێپەڕی، ترس و لەرز جەستەی سوهەیلی بچووکی داگرتبوو، لێ قیدار لەدواوە ئافەرینی لێ دەکرد و دنەی[1] دەدا کە نەکشێتەوە. لەپڕدا سوهەیل چاوەکانی خۆی نووقاند و لەسەر لوتکەکە قیت ڕاوەستا. قیدار لەدواوە هاندانەکەی پتر کرد و بە پاڵەوانی مەزن ناوی دەبرد.

سوهەیل پێیەکی دەبرد و یەکی دەکشاندەوە، هەرجاری پێی دەهێنایەوە دواوە قیدار بەرزتر هاواری دەکرد. سەرەنجام بەبێ ئەوەی چاوەکانی بکاتەوە خێرا پێیەکی خستە بۆشاییەکە و خەریك بوو پێیەکەی دیکەشی بەدوایدا بچێ، هەر هێندەی زانی لە دواوە بە هێزێکی زۆرەوە دەستیان ڕاکێشا و پاشە و پاش کەوت بەسەر کێوەکەدا.

چاوەکانی کردەوە بینی باوکیەتی و هەردوو لە ترسا ڕەنگیان زەرد بوو بوو.

دوای کەمێ لە هەناسە بڕکێ باوکی هاتە گۆ: ئەوە شێت بووی کوڕم؟ بۆچی دەتەوێ خۆت بکوژی؟! ئەی هاوار خۆ چرکەیەك دواکەوتمایە دەکەوتیتە خوارێ. مناڵەکان گوتیان بینیومانە بە تەنیا بەسەر کێوەکەدا هەڵزناوە، پێم بڵێ چ کەسێ پێی گوتی کاری لەم چەشنە ئەنجام بدەی؟

---

(١) دنەدان: هاندان

سوهەیل کە هێشتا دەنگی پرزەی[١] دەهات ئاماژەی بۆ دواوە کرد و گوتی: ئەمە بوو باوکە، ئەم منداڵە. وەلێ کە ڕوانیان هیچ منداڵێك لەوێ بوونی نەمابوو.

+ هاوار خوایە بمگەیە، کوڕەکەم بەیانی کێشەی نەبوو. ناردوومەتە حیکمەتخانە ببێ بە حەکیم کەچی خەریکە ماڵوێرانم دەکا و خۆی دەکوژێ. لەوانەیە تووشی نەخۆشی دەروونی بووبی کوڕم، پێویستە دواتر یاخود بەیانی بتبەمە لای حەکیم دانیال بەڵکو چارەسەرێکت بکا.

سوهەیل لەگەڵ بابی گەڕایەوە ماڵێ، لێ هەر خەیاڵی لەسەر وەستان بوو لە ئاسماندا، تۆ بڵێی گەر باوکم نەهاتبا توانیبام لەوێدا بوەستم؟ یاخود دەکەوتم و دەمردم؟ لەوەیە گەر باوکم نەهاتبا ئێستا ناودار بووبام لەنێو منداڵەکان، هەر بەڕاستی باوکم لێی تێکدام یاخود ڕزگاری کردم؟ نازانم چ بێژم. باشە ئەی قیدار چی لێهات و بەرەو کوێ ڕایکرد؟ ئەم هەتیوە بۆچی لەم دەمە خۆی شاردەوە. پێویستە بڕۆمە دەرەوە و بیدۆزمەوە، دەبێ ڕاستی ئەم بابەتەم بۆ دەرکەوێ، یان ئەوەیە منیش فێری ببم.

سوهەیل لەماڵەوە زۆر سەرزەنشت کرا لەسەر ئەم کارەی، وەلێ ئەو باسی قیداری نەکرد، هەر هێندەی گوت کە هۆشم لەسەر خۆم نەبووە لەو دەمەیدا.

---

(١) پرزە: هەناسە

ئەو شەوە چەندی هێنا و بردی خەوی لێنەکەوت، خەیاڵی لای قیدار و کارە سەرسوڕهێنەرەکانی بوو، بیری لەوە دەکردەوە کە ئەگەر بتوانم ئەوەی قیدار کردی ئەنجامی بدەم لای هەمووان دەبم بە مرۆیەکی دی، تەنانەت لەوەیە پاشاش ڕێزێکی تایبەتم بۆ دابنێ و پلەیەکی گەورەم پێ ببەخشێ.

بەیانی نەچوویە قوتابخانە، هەر زوو هەڵسا و بەدزی ماڵەوە بەرەو هەمان جێگا وەڕێ کەوتەوە کە یەکەم جار قیداری لێ بینی. بە دەنگی بەرز چەند جارێك بانگی لێ کرد، هەر هێندەی زانی قیدار لەدواوە لێی دەرکەوت و بە تووڕەیی گوتی: ئای سوهەیل چەند بەدبەختی، بەڕاستی باوکت هەموو شتێکی تێکدا، ئەو ڕێگر بوو لەوەی ببی بە پاڵەوان، خۆ خەریك بوو تۆش دەوەستای لەوێ، چەند چرکەیەکی مابوو سوهەیل، بەڵام بەداخەوە کە نەتتوانی ئەنجامی بدەی.

+ ئەو گوتی هەوڵی خۆکوشتنت داوە، ئەی گەر مردبام چی؟ من چۆن باوەڕت پێ بکەم؟ چۆن بزانم تۆ کەسێکی جادووگەر نی؟ خۆ هەمیشە حەکیمەکان دەڵێن جادووگەران فێڵ لە چاوی ئێوە دەکەن.

- من جادووگەرم؟ جا وەرە منالی ئاوەها فێری شت بکە. باشە ئەوا من ڕۆیشتم و دەبێ ئاواتی بوون بە پاڵەوانت لەگەڵ خۆت ببەیتە گۆڕ و هەر ئاوا بەربەرۆشك(١) بی.

---

(١) بەربەرۆشك: مەردوومی بێ ئیش و کار.

+ نا نا قیدار مەبەستم ئەوە نەبوو، توورە مەبە ئیدی برا، تکایە بگەڕێرەوە، خۆت گوتت پێت خۆشە یاریم لەگەڵ بکەی، دەی من ئێستا تەیارم[١] چیت دەوێ دەیکەین، تەنێ هونەرەکانی خۆتم فێرکە.

- یانی هەرچیم گوت دەیکەی؟

+ بەڵێ بە مەرجێ فێری کارە سەرسوڕهێنەرەکانتم بکەی ها.

- باشە سوهەیل، چاك گوێ ڕادێرە بزانە چی دەڵێم، من جەستەیەکی بەهێزم هەیە، تەنانەت ئەگەر بەردی زۆر گەورەشم پێدا بدەی ئازاری نابێ، چونکە کارێکم لەگەڵ جەستەی خۆمدا کردووە کە هیچ شتێ ئازاری پێ نەگەیەنێ. تۆش ئەگەر بتەوێ فێرت دەکەم، سەرەتا با بڕۆینە سەر کانیە گەورەکە، ئەها ئەوەی ئافرەتان جل و بەرگی لێ دەشۆن.

+ بەڵام بۆچی ئەوێ؟!

- ئەوە نهێنیەکی تێدایە و دواتر دەیزانی، بیرت نەچێ بڕیارت دا هەموو شتێ بکەی بۆ بوون بە پاڵەوان، مەگەر بیرت چوو؟

+ باشە با بڕۆین، لەپێناو ئاواتەکەم چیت دەوێ دەیکەین، مەگەر کاری خراپ بێ.

---

(١) تەیار: ئامادە



قیدار و سوهەیل وەڕێ کەوتن بۆسەر کانیەکە و تەژی بوو لەو ئافرەتانەی ڕۆژانە لەوێ کۆریان دەکرد و جل و شتومەکیان دەشۆری. هەرچەندە ئەوێ بۆ پیاوان قەدەغەبوو، لێ ڕێگریان لە منالاَن نەدەکرد. قیدار لە شوێنێك وەستا کە چەند مەترێکی کەم ڕێك بەرامبەر ئاڕاستەی ئافرەتێکەوە دووربوو، وەلێ لەگەڵ ئافرەتەکە پشتیان لە یەکتری بوو، تەواوی ئافرەتەکانی تریش مژووڵی کاروباریان بوون و ئاگایان لەو دوو منالّە نەبوو.

قیدار هاتەگۆ: من لێرە دەوەستم سوهەیل، ئێستا تۆ گەورەترین بەردی ئێرە وەدەست بگرە و بە هەموو هێزی خۆت تێمی گرە، دەبینی کە هیچم لێ نایە.

+ باوەڕ بەوە ناکەم، ئاخر من زۆر بەهێز دەیهاوێژم، تۆ بۆچی خۆت بەکوشت دەدەی، ئەو کارە بەمن مەکە کاکە.

- دەڵێم بیهاوێژە هەی ترسنۆك، مەگەر بڕیارت نەدا هەرچیم گوت بیکەی؟

+ با، بەڵام ئەوە خۆکوژیە.

- هەی بێ عەقڵ، وەك چۆن ڕاوەستان لە بۆشایی ئاسمان خۆکوژی نەبوو، ئەوەیان زۆر لەو ئاسانترە بۆم. ئەگەر ئەنجامی نادەی دەڕۆم و تا هەتایە نامبینیەوە باشە.

+ باشە قیدار زویر مەبە، وەلێ هەرچیت لێهات لە ملی خۆت.

- هیچم لێ نایە ئەرخەیان بە، هەموو شتێك لەملی خۆمە، ئافرەتەکان مژوولّن و کەس ئاگادار نییە کە تۆ ئەو بەردە لەمن دەدەی، بۆیە لەهیچ مەترسە و بیهاوێژە ئینجا دەزانی چ جۆرە جەستەیەکم هەیە.

سوهەیل لە زەویەکە بەردێکی تۆزێ گەورەی هەڵگرت و نیشانەی لەسەر قیدار دانا و گوتی: کە تۆ ئەوەت بوێ من چ حەقم هەیە. ئایا ناترسی؟ بەرد هاوێژێکی شارەزام ها، لێت بدەم خراپ ئازارت دەدەم.

قیدار پێکەنی و گوتی: بیهاوێژە هەی ترسنۆك بیهاوێژە، لە ژیانم کەسی وەك تۆ ڕیوەڵە[1] و بێ هێزم نەدیوە.

سوهەیل لەگەڵ ئەم قسەیە تووڕەبوو، بەردەکەی توندتر کرد لە دەستی ڕاستی و لەگەڵ سووڕانێك و هێزێکی زۆرەوە کە چاوەکانی لەگەڵ نووقاندبوو ئاڕاستەی سنگی قیداری کرد، لێ لەگەڵ زیڕە و هارژنی ئافرەتێك چاوەکانی هەڵهێنا.

ئەو دەمەی چاوەکانی کردەوە قیدار لەوێ نەمابوو، وەلێ ئافرەتێك لەسەر زەوی کەوتبوو لەتاو ئازاری پشتی دەیناڵاند و ژاوەژاو و قەرەباڵغی لەو نێوە پەیدابوو . سوهەیل کە ڕوانی

---

(١) ڕیوەڵە: لاواز

ئافرەتەکان بە جنێو و هاوارەوە بەرەو ڕووی دەهاتن خێرا تێی تەقاند و لەترسی گیانی خۆی هەتا تینی هەبوو ڕایکرد بەرەو ماڵێ.

ئافرەتەکە ئازارێکی زۆری بە پشتی گەیی بوو، هێندەی پێنەچوو هاوسەر و چەند برایەکی چوونە ماڵی سوهەیل و مشتومڕێکی زۆریان لەگەڵ دایك و باوکیدا کرد، وەلێ باوکی سوهەیل زۆری خۆ بەقوربان کردن و گوتی کوڕەکەمان ماوەیەکە تووشی نەخۆشی دەروونی بووە و چەند ڕۆژێ لەمەوبەر هەوڵی خۆکوشتنی داوە، ئیدی لەمەودوا ناهێڵم بڕواتە دەرێ و هەر ئەمڕۆ سەردانی حەکیم دانیال دەکەین.

دوای داوای لێبوردن و ئاشت کردنەوە خێرا دەستی سوهەیلی گرت و بەرەو ماڵی دانیالی حەکیم وەڕێ کەوتن کە خانوویەکی بچووکیان لەدەو زۆنگەکە[1] بۆ چێکردبوو، چون نەیدەویست ڕۆژانە زۆر خەڵکی ببینێ، لەڕاستیدا ئەو تەواو پیر ببوو. ڕیشە سپیەکەی لەبەر درێژی و پڕی سنگی تەواو داپۆشیبوو، تەنانەت مووەکانی سەر کوڵمیشی نەتراشی بوو، وێدەچوو تەمەنی سەدی تێپەڕاندبێ، چاوە زەردەکانی تەواو بەرەو کزی چووبوون و هەمیشە کڵاوێکی سەوزی لەسەر دەنا. جەستەیەکی لەڕو لاوازی هەبوو، لێ هێشتا بۆ ڕۆیشتن پتەوی تێدا مابوو.

---

(١) زۆنگ: زەمینێکی چاڵە کە ئاوی تێدا وەستابێ.



ئەو دەمەی سوهەیل تەواوی بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ وەگێڕا حەکیم گوتی: پێویستە بڕۆینە هەمان ئەو شوێنەی کە منداڵەکەت لێ بینیوە و منیش بیبینم.

دەستی حەکیمیان گرت و هەرسێ وەڕێ کەوتن بۆ ژێر ئەو دارەی کە سوهەیل قیداری لێ دیبوو، لەوێدا هەرچەندی سوهەیل هاواری کرد چ کەس نەهاتە گۆ. ئینجا دانیالی حەکیم بانگی لە قیدار کرد و گوتی کە ئازارت نادەین ئەگەر پیاو بی و پێمان بێژی کە چیت لەو منداڵە داوە.

دوای کەمێ خامۆشی دەنگێ بەگوێیاندا ڕابورد، لێ ئەمجارە دەنگی مناڵ نەبوو، بەڵکو لە پیاوێکی تەواو پێگەیشتوو دەچوو.

- ئەو ئازارێکی زۆری بە براکەم گەیاند، ئەو مارە ڕەشە برا بچووکەکەی من بوو کە سوهەیل لە گۆڕەپانەکە بەردی تێ گرت، منیش ویستم تۆڵەی لێ بکەمەوە.

حەکیم بە تووڕەییەوە لەگەڵی کەوتە گۆ: واز لەو منداڵە دەهێنی یاخود گڕت تێ بەردەم و بتکەمە خۆڵەمێش.

- نەخێر من تۆڵەی تەواوم لێ نەکردۆتەوە و تەمای وازهێنانم نییە.

حەکیم دانیال خێرا دەستی بە خوێندنەوەی چەند دەقێکی ئاینی کرد و قیدار هاواری لێ بەرز بوویەوە. لەگەڵ هارژنی قیداردا سوهەیل

تەواو ڕەنگی پەڕی بوو، خەریك بوو گیان لە جەستەیدا دەچوویە دەرێ، گوێچكەكانی خۆی توند گرتن و ئاگای لە گفتوگۆكەی قیدار و حەكیم نەما. تەنێ ئەوەندەی زانی كە دانیالی حەكیم داوای لە قیدار دەكرد باوەڕ بە حەكیمی مەزن و نێردراوەكەی بێنێ و دەست هەڵگرێ لە خراپەكاری.

دوای ئەوەی دەنگ و ژاوەژاو نەما ســـوهــەیل دەستی لە گوێچكەكانی بەرداو خەریك بوو سەرپاكی گیانی دەلەرزی.

حەكیم تا نەچۆوە مەنزڵەكەی هیچی نەگوت و وەڵامی پرسیارەكانی سوهەیلی نەدایەوە. پاشی گەڕانەوە سوهەیلی لە بەرامبەر خۆیدا ڕوونیشاند و دەستی بە ئامۆژگاری كردنی كرد.

+ كوڕی خۆم ئیدی هیچ ترسێك لەم ناوەدا نەما، ئەو یەكێك بوو لە سەربازەكانی قیترەی[1] نەفرەت لێ كراو. ئەوانە كۆمەڵێكن لە حەكیمی مەزن یاخی بوون و كاریان خراپەكاریە. هەمیشە خەتەرە و خەیاڵی خراپ دەخەنە دڵ و دەروونی مرۆڤەكان تاكو ئەوانیش تووشی بەدی و یاخی بوون بكەن.

- مەگەر كەسانێك هەن بوێری ئەوەیان هەبێ لە حەكیمی مەزن یاخی بین؟!

+ بەڵێ، ئەوان كاتی خۆی قیترەی گەورەیان كڕنۆشی بۆ باوكی مرۆڤایەتی نەبرد و ستەمی كرد، لەكاتێكدا حەكیمی مەزن فرمانی

---

(١) قیترە: یەكێكە لە ناوەكانی شەیتان.



پێدابوو کە کڕنۆشی ڕێزی بۆ ببا. لە بەرامبەر ئەو خۆبەزل زانیەیدا حەکیمی مەزن نەفرەتی لێکرد و لە سۆز و بەزەیی خۆی وەدەری نا.

جا لەو ڕۆژەوە خۆی و سەربازەکانی لە هەوڵی ئەوەدان تۆڵە لە مرۆڤایەتی بکەنەوە، چون مرۆڤ بووە هۆکاری دەرکردنی ئەوان و نەفرەت لێکردنیان لەلایەنی حەکیمی مەزنەوە.

- زۆر سەیرە! یانی ئەوان مرۆڤ نیین؟ بەڵام قیدار ڕێك وەکو مرۆڤێك هەڵس و کەوتی دەکرد!

+ بەڵێ ئەوان مرۆڤ نیین سوهەیل، بەڵکو سەر بە چینی جنەکانن، وەلێ وەکو مرۆڤ خاوەنی عەقڵ و زانیارین. حەکیمی مەزن ئەوانی لە ئاگر چێ کردووە. چەشنی مرۆڤ خواردن و نوستن و نەخۆشی و مردنیان هەیە، زاوزێ دەکەن و هەمیشە لە زۆربوون دان، چون هەزاران ساڵ بەر لە مرۆڤ لە زەوی ژیاون، هەر بۆیە ئێرە بە هی خۆیان دەزانن و ئەگەر دەستیان بڕوا لێرە وەدەرمان دەنێن و لەنێومان دەبەن، ئەڵبەتە مەبەستم ئەوانەیانە کە باوەڕیان بە حەکیمی مەزن نییە.

- بۆچی لەنێو وانیش هەن کە باوەڕیان بە حەکیمی مەزن هەبێ؟

+ بەڵێ هەن سوهەیل، وەلێ بێ بڕواکانیان زۆرترن. ئەوانیش وێنەی مرۆڤ داوای پەرستشیان لێ کراوە و لە ڕۆژی پەسڵانیش زیندوو دەکرێنەوە و پرسیاری کردەوەیان لێ دەکرێ و باوەڕداریان بەرەو بەهەشتە و بێ بڕواکانیشیان دۆزەخ.



- باشە ئەگەر مرۆڤ نیین چۆن دەتوانن وەکو مرۆڤێك دەرکەون؟ خۆ قیدار ڕێك شێوەی لە شێوەی مرۆڤ دابوو؟

+ سوهەیل گیان، وەکو گوتم ئەوان لە ئاگر دروست بوون و دەتوانن خۆیان بخەنە سەر چەندین شێوە و ڕەنگی جۆر بە جۆر، دەکرێ لەسەر ئەم شێوە جۆراوجۆرانە ببینرێن، بەڵام لەسەر شێوەی ڕاستی خۆیان هەرگیز نابینرێن.

- کەواتە ئەوان دوژمنی ئێمەن؟

+ بەڵێ بێ بڕواکانیان دوژمنی سەرسەختی ئێمەن و زۆر ڕقیان لێمانە، وەلێ شوکر بۆ حەکیمی مەزن کە دوای گفتوگۆیەکی زۆر توانیم بڕوا بە قیدار بێنم و ئێستا ئەو یەکێکە لە بڕواداران.

- چەند سەیرە! کەواتە قیدار ئێستا باوەڕدارە؟

+ بەڵێ کوڕی خۆم، لە چاکەی حەکیمی مەزنەوەیە کە توانیومە بڕوا بە چەندین کەس لەوان بێنم. ئێستاش خۆت و باوکت بڕۆنەوە و کارێکتان لای من نەما و زۆر ماندووم.

- یەك پرسیاری دی دەکەم و دەڕۆم جەنابی حەکیم، من لەکوێ بمزانیبا ئەو مارە ڕەشە برای قیدارە تاکو ئازارم نەدابا؟

+ ئەوان زۆر حەزیان بە ڕەنگی ڕەشە و زۆرجار خۆیان دەخەنە سەر وێنەی ئاژەڵە ڕەشەکان، وەلێ تۆش ئەگەر منداڵێکی بزێو نەبی چ حەقت بە مارێکە لە دەو جۆبارەکە، خۆ نەهاتبوو یەخەت بگرێ.



- باشە باشە هەر لێم توورە مەبە ئەوە دەڕۆم مامە حەكیم گیان، سوپاسی هەموو شتێكت دەكەم.

+ سوپاسی حەكیمی مەزن بكە كە ڕزگاری كردی لەو بەڵایە.

- دەتوانم شتێكی دی بێژم؟ باشە چۆن بتوانم منیش ئاوا وەكو تۆ كەسێكی گەورەبم و كێشەی خەڵكی چارە بكەم و وەڵامی پرسەكانیان دەمەوە؟

حەكیم بە بێزاریەوە: هەی هوو، ماندووت كردم ڕۆڵە، وەلێ لەبەر گرنگی پرسیارەكە وەڵامت دەدەمەوە. بخوێنە و ببە حەكیم، ببە حەكیم كوڕم، ئەو دەمەی دەخوێنی و زانستی حیكمەت دەست دەخەی تەنانەت پاشاكانیش شەرمت لێ دەكەن، شەیتانەكان لێت هەڵدێن، خەڵكی بە چاوی ڕێز و گەورەییەوە لێت دەڕوانن، قیترە و سەربازەكانی سەرشۆڕ دەبن بەرامبەر زانستەكەت. ڕۆژانە دەتوانی لە بوارە جیاجیاكاندا سوود بە كۆمەڵگاكەت بگەیەنی. هەموویان دێن لەسەر چۆك بۆت ڕوودەنیشن، تەنانەت ماسیەكانی نێو دەریاش لەبەر زانستەكەت نزات بۆ دەكەن. لە هەمووی گرنگتر ئەگەر لە زانستەكەتدا دڵسۆزی بوونی هەبێ و كاری پێ بكەی و لە پێناوی حەكیمی مەزن دابێ ئەوا دەبیتە كەسێك لە نزیكانی ئەو و خۆشی دەوێی.

- یانی خوێندن و بەدەست هێنانی ئەم زانستە هێندە گەورەیە؟!

+ بگرە زۆر لەوەش گەورەترە كوڕم.

سوهەیل تا گەڕایەوە ماڵێ ئەو قسانەی دانیالی پیری لەنێو هزریدا دێناو دەبرد، یانی گەر من ببمە حەکیم هێندە گەورە دەبم تەنانەت پاشا شەرمم لێ بکا! خەڵك بەرامبەرم لەسەر چۆك ڕووبنیشن! واتا ئەم کارە لە بوون بە پاڵەوان زۆر گەورەترە، بەڵێ دەبێ زۆریش گەورەتر بێ. هەر لە بەیانی ڕا، بەڵێ هەر لە بەیانی ڕا دەست پێدەکەم. چۆن من تا ئێستا بە باشی نەمخوێندووە و هێندە سست بووم لێی؟ لە هاوتەمەنەکانی خۆم زۆر لەپاشترم، ئیدی لەمەودوا نایەڵم هیچ وانەیەکم لێ بڕوا، بەڵێ وازناهێنم تا دەبم بەو حەکیمەی کە مامۆستای گەورە دانیال باسی لێوە دەکرد.

ئیدی سوهەیل بڕیاری یەکلاکەرەوەی دا و لێرە بەدوا بە جەختی[1] و جۆش و خرۆشێکی زۆرەوە وانەکانی دەخوێند، لێ کێشەی وی ئەوەبوو لەچاو هاوتەمەنەکانی تۆزێ دابوویە پاش.

ماوەیەکی کەم دەبوو حەکیمێکی نوێ کە ناوی ناسڕ بوو بە فەرمانی پاشا هاتبوویە قوتابخانەی مەزنی حیکمەت و وانەی تێدا دەگوتەوە. حەکیم ناسڕ داوای کردبوو سوهەیل و چەند قوتابییەکی دی هاوشێوەی ئەو کە لە وانەکانیان دابوویانە پاش لە قوتابخانەکە دایان ببڕێ و لە فێرگەیەکی تری بچووکدا لەدوای عەسران بە تایبەت وانەیان پێ بێژێ، تاوەکو ئاستیان تۆزێ

---

(١) جەختی: چالاکی و چاپووکی.

بەرز دەبێتەوە و شایەنی قوتابخانە مەزنەکە دەبنەوە. ئەڵبەتە حەکیم ناسرِ چون ناسراوی پادشا بوو داواکەی ڕەت نەکرایەوە و سوهەیل و قوتابیەکانی دی ڕەگەڵە خۆیدا برد.

سوهەیل لەلای حەکیم ناسرِدا زۆر کەیفی سازبوو، لەلای ئەودا زۆر بە جوانی وانەکانی پێ دەخوێندرا و ڕۆژانە لەگەڵ هاوڕێکانی هاتووچۆیان دەکرد و شەو لە فێرگەکە نەدەمانەوە.

تەنانەت حەکیم هێندە لەگەڵیان نەرم و نیان بوو کە خۆشەویستیەکی بێ وێنەی لەگەڵ فێرخوازەکاندا چێ کردبوو.

دوای چەند مانگێ مانەوە لای ناسرِی حەکیم ڕۆژێك سوهەیل وەکو هەموو ڕۆژانی دی لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی بەرەو قوتابخانە بچووکەکە کەوتنە ڕێ. لەڕێگادا شەهرامی هاوڕێیان هەڵەنگووت[1] و زۆر خراپ بەربوویەوە، دیاربوو کە یەکێك لە پێکانی ئازارێکی زۆری بەرکەوتبوو. سوهەیل و هاوڕێیەکی دی خێرا چوونە ژێر باڵەکانی و بەحاڵ گەیاندیانە لای مام ساڵحی بەیتار تا چارەسەری پێویستی بۆ بکا. دوای چارەسەری شەهرامیان هێنایەوە ماڵێ، وەلێ ئەو دەمەی ڕوانیان خەریکە دونیا تاری دەبێ و وانەی ئەمڕۆیان لە کیس دەچێ، خێرا هەموو بە ڕاکردن بەرەو قوتابخانە ڕێگایان گرتەبەر.

---

(١) هەڵەنگووتن: ساتمەکردن لە ڕۆیندا.

ئەو دەمەی گەیشتن سەیریان کرد دەرگاکە گاڵە درابوو. چەندی لە دەرگایان دا هیچ دەنگیان وەدی نەکرد. قوتابییەکان ویستیان بگەڕێنەوە، وەلێ سوهەیل وەدەنگ هات.

+ من ناگەڕێمەوە تا وانەکە نەخوێنم، لەوانەیە مامۆستا لە ژوورەوە بێ و خەریکی پەرستشەکانی بێ بۆیە دەرگاکە ناکاتەوە. پێویستە لەسەر دیوارەکەوە ئاودیو بین، خۆ هێندە بەرز نییە.

ئەزمیر گوتی: منیش لەگەڵ ڕایەکەی سوهەیلم، دەی هاوڕێیان دەستتان دانێن با دوو سێ دانەمان بچینە ئەودیو، لێ یەك كەس بەتەنیا نەچێ، چون دونیا تەواو تاری بووە و ترسناکە.

سوهــەیل و ئەزمـــیر و جـــەلال خۆیان ئاودیوی حەوشەی قوتابخانەکە کرد، خێرا لە ژووری وانە وتنەوەکە نزیك بوونەوە و ڕوانیان وا کەسێکی جل سپی لەژوورێیە، لێ لەبەر تاریکی جوان دیار نەبوو.

سوهەیل: ئەی نەموت مامۆستای لێیە کاکە، ئەگەر منتان لەگەڵ نەبێ بەخوا ئێوە فەوتاون.

ئەزمیر: وەڵاهی سوهەیل خۆت سەلماند بەڕاستی، کورە تۆ نەبی ئاویشمان بۆ ناخورێتەوە برا.

مامۆستا.. مامۆستا.. ئەوە هاتین، بمان بوورە کە درەنگ کەوتین پۆزشمان هەبوو، مۆڵەت هەیە بێینە ژووری قوربان؟

دوای ئەوەی هیچ دەنگێك لە مرۆیەكە بەدی نەكرا هەرسێ ترسیان لێ نیشت و بۆ تاوێ بێدەنگی باڵی كێشا بەسەر شوێنەكەدا. لەنكاو سوهەیل بە ترسەوە هاتەوە گۆ:

+ مامۆستا گیان بۆچی دەنگت نی یە؟!

هێشتا سوهەیل قسەكەی تەواو نەكردبوو، كابرایەكی ڕیش سپی بە تووڕەیی ئاوڕی دایەوە و هەموو ئەترەشیان[1] چوو لەجێی خۆیان. ئاخر بەم درەنگە لەكاتێكدا دەرگای قوتابخانەكە گاڵە دراوە ئەمە كێ یە و چی دەكا لێرە!

كابرای ئاتەشی[2] بە دەنگێكی بەرز هاتە گۆ: ئێوە كێن و چیتان دەوێ لێرە؟

سوهەیل بە ترس و لەرزەوە: ئێمە قوتابیین و بۆ خوێندن هاتووین، هیچ شتێكمان ناوێ.

- ئادەی پێم بڵێن لای كێ دەخوێنن؟

دوای كەمێ لە تەتەڵە كردنی زار سوهەیل گوتی: مامۆستا ناسڕ، بەڵێ ئێمە قوتابی ئەوین.

پیاوە پیرەكە هێشتا دەنگی خۆی بەرزتر كرد و پتر هاتە پێش و گوتی: مامۆستا ناسڕ؟ ئەو بە هیچ شێوازێك مامۆستا نییە، ئەو

---

(١) ئەترەش: زراو

(٢) ئاتەشی: مرۆڤی تووڕە و توند.

تەنێ نەزانێکە و هیچی دی، بەڵێ ئەو بابایەکی گەلحۆ و نەفامە، چون خزمایەتی لەگەڵ پاشا هەیە دەیهەوێ قوتابخانەی مەزن بخاتە مەترسیەوە و ڕایە بۆگەنەکانی خۆی تێدا بڵاوە پێ بکا. چیدی لای ئەو مەخوێنن و بڕۆنە لای یەکێ لە مامۆستاکانی تر لە حیکمەتخانەکە.

لەگەڵ ئەم تووڕەییەی پیاوە پیرەکەدا سوهەیل و هاوڕێکانی پتر ڕەنگیان پەڕی و خەریك بوو لە ترسان لەهۆش دەچوون، ئاخر چ کەس نازانێ ئەم بابایە کێ یە و بەم شەوە تاریکە چ دەکا لە ژوورێ. لەپڕدا سوهەیل لە هارژنی دا:

+ کورە هەڵێن هاوڕێیان بەخوا ئەمە مرۆڤ نییە جنۆکەیە هەڵێن. لەگەڵ هاوارەکەی سوهەیلدا هەرسێ تێیان تەقاند و بۆخۆشیان نەیانزانی چۆن بەسەر دیوارە بەرزەکەدا ئاودیو بوون. ئەو دەمەی گەیشتنە ئەودیو ئەوانی تریش بێ ئەوەی بزانن چ باسە ڕەگەڵیان کەوتن و چەشنی ڕاکردن لە دەستی شێر بەرەو لایماڵی حەکیم ناسر بۆی دەرچوون.

لە ڕێگادا چەند جـــارێ سوهـــەیل سەرپەلۆکی[١] دەبرد و هەڵدەستایەوە، پێیەکانی تەواو ڕووشابوون و خوێنیان تێزابوو، لێ هێندە ترساو و هەناسە سوار بوون هەر مەپرسە.

---

(١) سەرپەلۆکی دەبرد: دەکەوت، هەڵدەنگوت.

کاتێ گەیشتنە بەر دەرکی ماڵی حەکیم لە پەشۆکاویان بە توندی چەند جارێك بە دەرگاکەیاندا کێشا و خەریك بوو بیشکێنن.

حەکیم ناسرِ هاتە دەرێ: چی بووە قوتابینە بۆ وا شێواون! هیچی نەخوازراو ڕوویداوە؟!

ئەزمیر: ئە ئە ئەوە پیا پیاوێك نا نا نازانم کێ بوو.....

سوهەیل بە پەشۆکاویەوە کە هێشتا هەناسەی سواربوو گوتی: تۆ ڕاوەستە ئەزمیر، سەرت لە مامۆستا شێواند هەتیو قسەکردن کەی وایە، ئا ڕاوەستە من بیگێڕمەوە. قوربان ئیمڕۆ شەهرامی هاوڕێمان کەوت و قاچی شکا بۆیە درەنگ هاتین، لێ ئەو دەمەی هاتین تۆ لەوێ نەمابووی، پیاوێکی پیری لێبوو نەمان دەناسی. زۆر قسەی نەشیاوی بەتۆ گوت و جنێوی دا، گوتیشی کە چیدی لەلای تۆ نەخوێنین.

بەم قسانە حەکیم تۆزێ پەشۆکاو گوتی: یانی کەستان نەتان دەناسی؟ باشە گەر بیبینن دەیناسنەوە؟

+ نەمان دەناسی، وەلێ گەر بیبینم لەوەیە بیناسمەوە، هەرچەندە تاری بوو، لێ من چاکم سەرنج دابوێ.

- باشە با بڕۆین بۆ ئەوێ، لەوانەیە هێشتا لەوێ مابێ.

ئەو کاتەی حەکیم ناسرِ و قوتابیەکانی چوون بۆ قوتابخانەکە چ کەس لەوێ نەمابوو، حەکیم ئەو دەمە جۆرە ترسێکی پێوە

دیاربوو، خێرا گوتی: ئیدی ئێوە لەلای من ناخوێنن و دەڕۆنەوە بۆ قوتابخانەی مەزن.

لەگەڵ ئەم قسەیەدا منداڵەکان واق بوون و خەریك بوو چاوەکانیان تەڕ دەبوو.

سوهەیل هاتە گۆ: ئەوە چی دەڵێی قوربان، ئێمە چۆن تۆ بەجێ بێڵین، تخوا بڵێ شۆخیم کرد، تخوا مامۆستا ئەوە مەکە لەگەڵمان، ئێمە بەیەکەوە داهاتووین.

- نا سوهەیل، ئەوە باشترە با جارێ ئاوابێ، من هەرگیز گەردەنی ئەم کەسە ئازاد ناکەم کە بەم چەشنە جنێوی پێداوم.

سوهەیل بە چاوی پڕ گریانەوە: ئاخر مامۆستا لەبەر کەسێکی بێ بایەخ بۆچی ئێمە جێ دەهێڵی، ئێمە لەگەڵ تۆ ڕاهاتووین قوربان، تکایە مەمان نێرەوە بۆ قوتابخانەی مەزن تکایە.

مامۆستا دوای تۆزێ تێڕامان بەبێ دەنگی چوو دەرگاکەی کلیل داو پشتی لە مناڵەکان کرد و بەبێ ئەوەی گوێ بدا بەوان وەڕێ کەوتەوە بۆ ماڵێ. لەوێدا مناڵەکان دەستیان کردە گریان و هەنسکە هەنسکیان دەهات. سوهەیل لە هەموویان پتر گریا، سەراسیمە لە شوێنی خۆی ڕەق بوو بوو، فرمێسکی چاوانی ڕێڕەوی خوارو خێچیان لەسەر کوڵمەکانی چێ دەکرد و دەیگوت: ئاخر بۆچی دەبێ ئێستا جێم بهێڵی بۆچی، ئاخر من کە تازە دێمە سەر ڕێچکە و تۆزێ چالاك دەبم بۆچی ڕێگام لێ ون دەکەی.

لەلایەكی دی زۆری سەیر بەخۆی دەهات و دەیگوت: ئەوە منم بۆ مامۆستایەك دەگریم! بۆ خوێندن دەگریم! منێك كە قەت ئارەزووی وانەیەكم نەدەكرد ئێستا ئاوا نووزە نووزم لێوە دێ!

هەموو بە غەمباری و گریانەوە چوونەوە ماڵێ. ڕۆژی دواتر سوهەیل بە ناچاری و دڵێكی لێوانلێو لە خەم چوویەوە قوتابخانەی مەزن و بەردەوامی بە وانەكانی دا. ئیدی سوهەیلی جاران بوونی نەما و وردە وردە بەرەو پێشەوە دەڕۆیی و كتێبەكانی دەبڕی، شەو و ڕۆژ لە كۆشش دابوو، لە تاقیكردنەوەكان نمرەی سەدی دێنا و زیاتر و زیاتر لای حەكیمەكان ئازیز و خۆشەویست تر دەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا تەمەنی كەم كەمە بەرەو سەرێ دەكشا و لە قۆناغی منداڵی دەچوویە دەرێ. وای لێهاتبوو بازێ لە قوتابیە بچووك و سەرەتاكانیان ڕادەستی سوهەیل كردبوو كە لە ژوورێكی تایبەت دا وانەی پێ دەگوتن، بەڵكو هێندێ جار باوكان خۆیان داوای ئەوەیان دەكرد سەرەتا منداڵەكانیان لەلای سوهەیل دابنرێ تاوەكو دەكەونە سەر ڕێچكە.

سوهەیل قەیرێك بوو هەستی بەوە كردبوو كە ئەو حیكمەتەی لەلای حەكیم ناسری خوێندبوو بازێكی جوداواز بوو لەگەڵ شرۆڤەی حەكیمانی فێرگەكە، هەمیشە جۆرە ناكۆكیەك هەبوو لە ڕاو بیر و بۆچوونیان و كەیفیان لەگەڵ یەك ساز نەبوو.

بازێ جاریش دەیبیست کە حەکیم ناسڕ لە خراپی پڕۆگرامی فێرگەکە دەدوا. گەلێ جار تێ ڕادەما و بیری جەنجاڵ دەبوولەوەی کە دەبێ هی کامیان ڕێگا ڕاستەکەبێ، حەکیم ناسڕ کەسێکی خۆشەویستە لەلای و ئەوانی تریش هەموو حەکیم و مامۆستای گەورەی ئەون. لەمێژبوو دەیهەویست ئەم هاوکێشەیە حەل بکا و لەو جەنجاڵیە ڕزگاری بێ، بۆیە بەردەوام پرسیاری لە حەکیمە گەورەکان دەکرد دەربارەی ئەم جیاوازیانە.

قوتابیەکانی سوهەیل زۆربوون، لێ لە هەموویان ژیکەڵە و چاڵاکتر هیلال بوو. هیلال لەگەڵ زیرەکیەکەیدا خاوەن ڕوخسارێکی تۆزێ سەیر بوو. قژێکی سووری ئاگرینی بێ شەپۆلی هەبوو کە تاڵەکانی تا نزیك چاوانی هاتبوون، بازێ جاریش چاوەکانی دادەپۆشی. ئەو دەمەی دەڕۆیشت تاڵە سوورەکان بە چەشنێ هەڵبەز و دابەزیان دەکرد کە دەتگوت نیازیانە دەوروبەریان بسووتێنن. لەنێو هەزاران منداڵدا بە نێڵەی[1] قژی دەتناسیەوە. ڕوخسارێکی لە ڕادە بەدەر سپی لەگەڵ دوو چاوی شینی تۆخ تۆخ و قژێکی تەواو سوور گرد ببوویەوە کە لە ڕوانینی ئەودا پێت وابوو سەیری پەلکە زێڕینە دەکەی. شتێکی حاشا هەڵنەگرە ئەگەر ڕەنگی سپی و سوور و شینی تۆخ لە وێنەیەکدا کۆبکەیتەوە دیمەنێکی ڕەنگا و ڕەنگت

---

(١) نێڵە: کڵپەی ئاگر

بۆ دەردەچێ. زۆرێك لە منداڵەكان بەهۆی ڕوخسارە سەیرەكەیەوە گاڵتەیان پێدەكرد و پێیان دەگوت تۆ نەخۆشی، چون نە ڕەنگی ڕوخسار و نە پرچیشت سروشتی نیین و لە هی مرۆڤی ئاسایی ناچن، بڕۆ لای دكتۆرێك و ئەم ناشیرینیەت چارە بكە.

ئەمەش هەموو جارێ هیلالی دەهێنایە گریان و پێی وابوو كە ئەو ناشیرین ترینی قوتابخانەكەیە. لە ڕاستیدا هیلال ناشیرین نەبوو، تەنێ ئەوەبوو ڕەنگی قژ و ڕوخساری تۆزێ نا سروشتی نیشانی دەدا. هێندێ جار سوهەیل كە لێی توورە دەبوو تاڵە سوورەكانی قژی دەگرت و بە شۆخیەوە دەیگوت: ئادەی پێم بێژە هیلال، چۆن ئەم ئاگرە ئەم كاغەزە سپیەی ڕوخسارت ناسووتێنێ؟ یاخود چۆن بەم ئاوە شینەی چاوانت ناكوژێتەوە و هەر سوورە؟

هیلالیش پێدەكەنی و دەیگوت: ئەگەر حەكیمی مەزن مەیلی لێبێ نە ئاگر دەسووتێنێ و نە ئاویش دەكوژێنێتەوە و فێنكایی دەبەخشێ. ئیدی لەگەڵ ئەم گوتەیەی دا سوهەیل توورەییەكەی نەدەما و هەستی دەكرد ئەم منداڵە حەكیم بوون لە خوێنی دایە.

هیلال هەمیشە لە ئەوانی دی ئازیزتر بوو، لەبەر ئەوەی باوكی نەبوو سوهەیل بەزەیی پێدا دەهات و زیاتر گرنگی پێ دەدا، جگە لەمەش بێگومان هەموو مامۆستایەك هەمیشە ئەوانەیان پتر خۆشدەوێ كە بەهرەیەكیان تێدا بەدی دەكەن و چالاكترن لەوانی دی.



تا قوتابیەك لاپەڕەیەكی دەخوێند هیلال سیانی خوێندبوو، هەمیشە چەند ڕووپەڕێك زیاتر لە واجبەكەی خۆی موتاڵا دەكرد، ئەمەش سوهەیلی تەواو سەراسیمە كردبوو، بە هەموو هێزیەوە خۆشی دەویست و وەك چۆن گرنگی بە وانەكانی خۆی دەدا ئاوەهاش بە وانەكانی هیلالی دەدا. زۆربەی جارانیش لە كاتی نان خواردندا لە ئاتەكی خۆی دایدەنا و زۆری لێ دەترسا كە چاوێنی[1] لێی بدا لەبەر زیرەكیەكەی. ئەڵبەتە خۆشەویستی هیلال بۆ مامۆستاكەی زۆر پتربوو، گەر لێت گەڕابا لەوانەبوو ڕۆژانی پشووش نەچووبایەوە. خەمی ئەوەی لەبەردابوو لە وانەكانی بڕواتە پێش و نەهێڵن چیدی لای سوهەیل بێ.

هەندێ لە قوتابیانی قوتابخانەی مەزن دەستێكی نایابیان هەبوو لە سازكردنی خواردن دا و چێشت لێنان خرابوویە ئەستۆی ئەوان، ئیدی برنج و ئارۆك[2] و نیسكێنە و گەلێ چشتی دیان لێدەنا. ئینجا داب و نەریت وابوو لە ئێوارەی ڕۆژی شەممەدا چەند قازانیان[3] دێنا و لە حەوشی فێرگەكە دایان دەنان و چێشت و پڵاوێكی زۆریان چێدەكرد و هەژارو داماوان دەهاتن و لەگەڵ قوتابیەكاندا ڕوودەنیشتن و بەیەكەوە نانیان دەخوارد.

---

(١) چاوێنی: چاوەزار

(٢) ئارۆك: جۆرە كفتەیەكە

(٣) قازان: مەنجەڵی گەورە

بازێ لە قوتابیان چون بە تەواوی تێر نەدەبوون ئەمەیان تۆزێ لەدڵ گران بوو، خواردنەکەیان بە موڵکی خۆ دەزانی و ژمارەی خەڵکەکەش کە بۆ چێشت دەهاتن ڕۆژ بە ڕۆژ پتر دەبوو، ئەمەش وایکردبوو کە قوتابیان کەمتر بەشە خۆراکیان بەرکەوێ، ئێ زۆرێك لەوانەی دەشهاتن فێربووبوون هەر بۆ پڵاوی گەرم دەهاتن و هەژار نەبوون. بۆیە هێندێ لە قوتابیان بەر لەوەی کاتی خواردن بێتە پێشێ لە ڕۆژانی شەممە، ئەو دەمەی دەیانزانی چێشت لێنەرەکە بێ ئاگایە یاوەخۆ پاڵی داوەتەوە، خێرا فێرخوازێکی بچووکیان لە پەنجەرەکەدا ڕەوانی چێشتخانەکە دەکرد و چەند ڕانێکی مامری لەگەڵ خۆیدا دێنا و بە یەکسانی تێکرا دەکەوتنە سەری. چاودێرێکیش لە دەرگاکە تێی دەڕوانی نەکا کاکی چێشت لێنەر واگابێ و پیلانەکەیان تێك بچێ. ئینجا ئەو دەمەی جەنابی خواردن چێکەر سەری قازانی هەڵدەدایەوە هەرچی مامر بوو بێ ڕان مابوویەوە. لە هەمووی خۆشتر ئەوەبوو یەکێ لە بخۆرەکان هەموو هەفتان داوای ڕانی دەکرد و بابای چێشت لێنەر لەنێو قازانێ ڕادەما و سەری دێنا و دەبرد و دەیگوت: بە حەکیمی مەزن سوێندێ دەخۆم ئەو مامرانە ڕانیان هەبوو، ئاخر کاکی مامر بۆچی بێ ڕان ماویتەتەوە نازانم!





## بەرەو دارمان



ئێستا سوهەیل لە تافی لاوەتی دایە و تەواو لە قۆناغی منداڵی دەرچووە. قوتابییەکی دیار و ناوداری حیکمەتخانەیە. ئاواتی بوون بە حەکیمێکی گەورە لە کەڵکەڵەی دایە و ڕۆژ و شەوی خستۆتە سەر یەکدی. خەونی سوهەیل پۆشینی جلی حەکیمانە و دواتریش هاوسەرگیری و ژینێکی ئارامە لەگەڵ ئەو کەسەی لە خەیاڵیدایە. هەمیشە خەیاڵی وەی دەکرد کە ڕۆژێك دایك و باوك و خزم و کەس بەم جل و کراسەی حیکمەتەوە لێی بڕوانن و هەر ڕۆژێك دوای پۆشینی ئەم جلە ماڵەوەی بنێرێتە داوای پریاسکە خاتوون و بە سواری ماینێکی کەحلانی[١] ڕەختەکراوی[٢] ڕەشەوە کە نێوچاوانی زناکێکی[٣] سپی پێوەبێ و پریاسکە خاتوونیش جلی بووکان و بەلادەر[٤] و خشڵی ڕازاوەی ئەوتۆی لەبەردابێ کە لەسەر ماینەکە بلەرنەوە. لە تەواوی کوێستان و ناوچە ڕەنگینەکانی شاهێندا بسووڕێنەوە، لێ هیچ دەم سوهەیل لەمەڕ ئەم کچە نادیارە و ئەم خەونە قەشەنگەوە بۆ کەس نەدوابوو،

---

(١) کەحلان: ئەسپی ڕەسەن

(٢) ڕەخت: جۆرە خشڵێکی زیوینە بۆ جوانی دەدرێ لە وڵاخ.

(٣) زناك: نیشانە

(٤) بەلادەر: خشڵی زێڕینی سەری ژنان

هەمیشە وای پێ باشبوو کە ئەم بابەتانە هەر لە دڵدا بمێننەوە و تێکەڵی ژینگەی دەرەوە نەبن.

دەی ئەمە خەونی زۆرێك لە تازە لاوانە و ناحەقیشیان نییە کە ئەم جۆرە خەونانە ببینن و هەوڵی بۆ بدەن.

ماوەیەك بوو لەڕێی حەکیم ناسرەوە سێ مامۆستای نوێ ڕوویان لە حیکمەتخانە کردبوو، ئەوان لەگەڵ حەکیم ناسڕدا گرووپێك بوون و ناوە ناوە کۆبوونەوەیان دەکرد و بڕیار و گوتەی سەیر سەیریان دەوروژاند. ئەمەش تەواو حەکیمەکانی تری بێزار کردبوو، وای لێهاتبوو بە ئاشکرا دژایەتی یەکدیان دەکرد و لای قوتابییەکانیش بە باشە ناوی یەکتریان نەدێنا. گرووپەکەی حەکیم ناسڕ داوای گۆڕینی پڕۆگرام و کتێبەکانی حیکمەتخانەیان دەکرد و بەردەوام ڕەخنەیان لە کتێبەکان هەبوو، هەمیشە دەیان ویست کتێبی ئەم حەکیمانە بێننە نێو پڕۆگرام کە لەگەڵ ڕاو بیروبۆچوونەکانی ئەوان ڕێك و گونجاو بوو. لەڕاستیدا تا ئەوان پەیدا نەبوون لە هەموو ناوچەکانی شاهێندا یەك ڕاو بیرو بۆچوون هەبوو، لێ ئەوان وردە وردە پەرەیان بە کتێبەکانی خۆیان دەدا کە لە وڵاتێکی دەرەوەی شاهێن هێنابوویان و کتێبە پەڕ زەرد و کۆنەکانی شاهێنیان بەباش نەدەزانی. ئەمەش وایکردبوو کە جەماوەرێکی زۆر پەیدا بکەن لە شاهێندا و سەرنجی تازە لاوەکان بۆلای خۆیان ڕابکێشن و

تانه و توانج له پەرتووكەكانی شاهێن بدەن و لەبەر قورسی و ڕەقی دەستەواژەكانی بە زمانی تارماییان ناوی بێنن.

كێشەكە لەوە دابوو كە وردە وردە پاشاش دەچوویە سەر بیروڕای ئەوان و پڕۆگرامی ئەم گرووپەی پەسەند دەكرد.

زۆرجار ئەم گرووپە مانای دەقەكانیان بە بیروڕای خۆیان شیدەكردەوە و نەدەگەڕانەوە سەر شرۆڤەی حەكیمانی كۆن، لەگەڵ ئەوەشدا ناویان لەخۆ نابوو سەرخەرانی حیكمەت. چەندین جار حەكیمانی حیكمەتخانەكە شكاتیان دەكرد لەلای پادشا، وەلێ پادشا هەر لای ئەوان دەیگوت چارەی دەكەم و كارەكە بێ ئەنجام دەمایەوە، لەڕاستیدا پادشا خۆشی پێیان كاریگەر ببوو، لێ چونكە ئەم كتێبە كۆنانە ساڵەهای ساڵ بوو ببوونە پڕۆگرامێكی تۆكمەی حیكمەتخانە بوێری ئەوەی نەبوو ڕاستەوخۆ لایان بدا و كتێبی دیكەی نوێیان لەجێ دابنێ، چون ئەمە پشێویەكی زۆری لەنێو حەكیماندا بەرپا دەكرد.

ناوە ناوە بە فەرمانی پادشا وردە كتێبیان لە دەرەوەی وڵات هاوردە دەكرد و بۆ پڕۆگرامەكە زیادیان دەكرد، جگە لەمەش هەوڵێكی زۆر لە ئارا دابوو بۆ دەسكاری كردنی دەستنووسە كۆنەكان، لێ چونكە زۆرێك لە حەكیمە تەمەندارەكان كتێبەكانیان ئەزبەر كردبوو ئەم هەوڵە كەمتر سەری دەگرت.

سوهەیل وردە وردە باشتر بۆی دەردەکەوت کە زۆرێك لەو زانیاریانەی کاتی خۆی لە حەکیم ناسرِی وەرگرتبوو زانیاری هەڵەن و بگرە پشێوی و توندرِەوی بەرپا دەکەن لەنێو کۆمەڵگا.

ئاخر هیچ لۆژیکی نییە ئەم هەموو حەکیمە کۆن و پرِ زانستانە لەسەر هەڵە هاتبن و ئایدۆلۆژیا و بیرورِایەکی تازە پەیدابوو کە هاوردەی دەرەوەی شاهێنە و هەمووی چەند ساڵێکە لەئارا دایە و کەسانێکی گەنجی کەمزانست پشتگیری دەکەن رِێگا رِاستەکەبێ! لەبەر ئەوە وەکو جاران حەکیم ناسرِی لا خۆشەویست نەبوو، لێ چونکە مامۆستای بوو رِێزی لێدەنا و رِقی لێ نەدەبوویەوە، بەڵام بە هەموو توانای خۆی پشتگیری لە حەکیمە کۆنەکان دەکرد و قوتابیەکانی لەم گرووپە نوێیە هۆشیار دەکردەوە.

ناسرِی حەکیم چەندین جار هەوڵی ئەوەی دەدا سوهەیل بهێنێتە سەر رِێچکەکەی خۆی و بۆ ئەم مەبەستە دانیشتنی لەگەڵ دەکرد و لەمەرِ گرووپی سەرخەرانی حیکمەت دەدوا، وەلێ سوهەیل بەرگری زیاتری لە پرِۆگرامی حیکمەتخانەکە دەکرد و نەدەگەیشتنە یەکتر و دواجار حەکیم ناسرِ بە توورِەییەوە دەرِۆیشت.

لە ئێوارەیەکی شەممەدا سوهەیل چێشتی بۆ میوانانی حیکمەتخانەکە تێدەکرد و خەریکی رِێنمایی کردنی هیلال بوو کە بۆ خەڵکەکەی بەرێ، لەپرِدا چاوی کەوتە سەر پیرە پیاوێك کە

لەنێو میوانانیدا ڕوونیشتبوو، دەتگوت لە شوێنێك بینیویەتی. دوای کەمێك تێڕامان بیری کەوتەوە کە ئەوە هەمان ئەو پیرە پیاوەبوو ئەو شەوە لێیان ببوویە جنۆکە و خەریك بوو زیرە بکەن لە ترسانی. سوهەیل ئەو دەمە تێگەیی کە مەرج نییە ئەوەی عەقڵی منداڵێك یاخود نەزانێك بە خراپی دەبینێ لە ڕاستیشدا خراپ بێ.

هێندێ جار کەسانێکی دڵسۆزمان، یاخود باوانی ئێمە جۆرە کارانێکمان لەگەڵ دەکەن کە ئێمە لامان ناخۆشە و بەرپەرچیان دەدەینەوە، لێ لە ڕاستیدا ئەوەی ئەوان دەیلێن خودی ڕێگا ڕاستەکەیە و عەقڵی بچووکی ئێمە بە خوار بینیویەتی.

ئەم پیرە پیاوە هەر لە سەرەتادا ئاگاداری بیر و بۆچوونەکانی حەکیم ناسر بووە و نەیویستووە ئەم منالانە لای ئەو بخوێنن و دواتر دژایەتی حەکیمانی کۆن بکەن، لێ چون منالْ ناتوانێ بە قسە لەمە بگات ناچار بەم چەشنە ترساندنە کردوویەتی.

سوهەیل زەردەخەنەیەکی بۆ کرد و بە هیلالی ڕاگەیاند کە لەم پیاوە پیرە دەست پێ بکا و سەرەتا چێشتەکە بۆ ئەو دابنێ.

سوهەیل بەردەوام بوو لە بەرپەرچ دانەوەی ئەم گرووپە نوێیە و ئاگادار کردنەوەی قوتابیانی کە بەلایاندا نەچن، ئەمەش وایکردبوو لای حەکیمانی قوتابخانەکە زۆر خۆشەویست بێ و لە زۆر کاردا ئازادی بکەن کە بۆ قوتابیەکانی دیکە قەدەغە بوو.



ئەو گەلێ جار دوای نیوەڕۆیان قوتابیەکانی دەبردە سەر گۆمێکی بچووکی پشتەوەی حیکمەتخانەکە کە هێندەی بەژنی پیاوێکی درێژ و بڕێك زیاتر قووڵایی هەبوو، لەوێدا فێری مەلەی دەکردن تا جاڕس[١] دەبوون، لێ لە ڕاستیدا ئەمە بۆ هەموو کەس ڕێپێدراو نەبوو. ڕۆژێك وەکو هەموو جارانی دی قوتابیەکانی بردە دەو گۆمەکە و دانە دانە خەریکی فێرکردنیان بوو. لەبەر قووڵی گۆمەکە خۆی لەگەڵیان دەچوویە ناوێ و ئاگاداریان دەبوو. ئەو دەمەی سەرەی هیلال هاتە پێشەوە بۆ مەلەکردن سوهەیل خۆی لەگەڵی بوو، چون لەوانی دی پتری خۆشدەویست زیاتر بایەخی پێ دەدا. لەپڕدا پیاوێك بانگی سوهەیلی کرد و ڕوانی یەکێکە لە حەکیمانی گرووپەکەی مامۆستا ناسڕ. سوهەیل وەکو ڕێزێك بۆی هاتە دەرێ و هیلالیشی لەگەڵ خۆیدا هێنایە دەر و هیلال گوتی: مامۆستا دە بوەستابای بمزانیبا خۆم توانای هاتنە دەرم هەبوو یان نا.

+ نا هیلال گیان، ئاو مەترسیە و نابێ، با ئازارێکت پێ نەگا کاکە.

هیلال پێداگری دەکرد کە بچێتەوە ناوێ و سوهەیل نەیدەهێشت، لەو گوتانە دابوون حەکیم لێی هاتە پێش و دووبارە بانگی کردەوە و گوتی: حەکیمی گەورەمان ناسڕ دەیهەوێ چاوی پێت بکەوێ،

---

(١) جاڕس: وەڕس

واز لەو منالّە بێنە با بۆخۆی مەلە بکا، دڵنیام چاکت فێرکردووە، مەلەکردن تا بە تەنیا نەبی تەواو فێرنابی.

+ نەخێر ئەو هێشتا زۆری ماوە بۆ ئەمە، تا چاك چاك فێری نەبن نایەڵم تەنیا بڕۆنە نێوی، چون ئاو جێگای باوەڕ نییە.

دوای ئەم گوتانە سوهەیل سەیرێکی منالّەکانی کرد و گوتی بڕۆنەوە بەرەو قوتابخانە.

منالّەکان تێکڕا هەڵهاتن و تێیان تەقاند بەرەو ژووری. مامۆستاکە بە قسان سوهەیلی مژووڵ کرد و ئاگای لەوە نەما کە هیلال لەگەڵ منالاّندا نەچۆتەوە ژوور.

هیلال وەکو هەموو جارانی دی چاوەنوورِی ئەوەبوو مامۆستا دەستێك بە قژە ئاگرینەکەیدا بێنێ و بەتایبەت بەو بڵێ با بچینەوە و لەگەڵ خۆیدا بیباتەوە، بۆیە لە دەو گۆمەکە وەستابوو تاوەکو ئاماژەیەکی مامۆستای پێ دەگات.

سوهەیل لەگەڵ حەکیمەکە بەرەو حیکمەتخانە کەوتنە ڕێ و هەر ئەوەندەی تۆزێ دوورکەوتنەوە هیلال لەدەو گۆمەکە پێیەکانی تووزیان[١] و کەوتە نێوی.

هەوڵێکی زۆری دا بۆ دەربازبوون، وەلێ ئەو هێشتا مایبوو بۆ ئەوەی بە تەنیا مەلە بکا لەنێو شوێنێکی قووڵدا. نزیکەی

---

(١) تووزیان: هەڵخلیسکان

خولەكێك هیلال شەڕی لەگەڵ ئاوەكە دەكرد و دەیهەویست خۆی بگەیەنێتە لێوارەكە و ڕزگاری بێ، لێ دوای كەمێ لە هاوار و هەوڵدان دەستە بچووكەكانی توانای جووڵەیان لێ بڕا و نوقمی ژێر ئاوەكە بوو.

سوهەیل پێیەكانی خستە نێو حیكمەتخانە و بێ ئاگا لەوەی قوتابیە ئازیزەكەی خەریكە تامی مردن دەكات، بێ ئاگا لەوەی ئێستا قژە ئاگرینەكەی گڕەكەی خامۆش بووە و جووڵەی لێ بڕاوە. ئەو دەمەی لە ژوورەكەی حەكیم ناسڕ نزیك بوویەوە هەستی بە چپەیەك كرد لەژێر گوێچكەكانیدا بە دەنگێكی نزم دەیگوت: بە ڕاكردن بگە هیلال، ئەو لەنێو گۆمەكە دایە.

دەرگای ژوورەكەی ناسڕی حەكیم كرایەوە و هەر لە دوورەوە زەردەخەنەی بۆ سوهەیل دەكرد و لەبەری هەڵسایەوە، پیاوەكانیشی فەرموویان لە سوهەیل دەكرد و بە دەست ئاماژەیان دەدایێ كە بچێتە ژوورێ، وەلێ ئەو دەمەی سوهەیل ئەم چپەیەی هاتە بەر گوێ لە شوێنی خۆیدا وەستا و بە سەراسیمەیی هەستی لە خۆی بڕی و گوێچكەكانی سووك كردن تا بزانێ ئەم دەنگە چی یە و ئاگاداری پیاوەكانی حەكیم نەما. ئەو دەمەی دووبارە دەنگەكەی بیستەوە بەبێ ئەوەی هیچ بێژێ و بیر لەوە بكاتەوە كە ئەمە دەنگی كێ یە خێرا پشتی لە ژوورەكەی حەكیم ناسڕ كرد و بە هەموو هێزی خۆی بەرەو گۆمەكە ڕایكرد.

کاتێ گەیشتە سەر گۆمەکە و هیچ شتێ دیار نەبوو، خێرا خۆی تێ هاوێشت و جەستەی ساردی هیلالی لە باوەش گرت و دەری هێنا. جەستەیەکی سارد و بێ جووڵە کە هیچ لەوە نەدەچوو مابێ. سوهەیل خێرا بە گریان و هاوارەوە هیلالی خستە سەر دەم و هەوڵی ئەوەی دەدا کە ئاو لە قوڕگ و بۆڕی و سیەکانی بەتاڵ بکا و بە دەستەکانی دەیکێشا بە پشتیدا و لەهەمان کاتداناڵەی بەرەو ئاسمان بەرز دەبوویەوە لە تاوانی. دواتر بە خێرایی هیلالی خستە سەر پشت و زانی کە لە هەناسەدان کەوتووە، بەبێ وەستان بە دەستی چەپی لووتی هیلالی گرت و بە دەستی ڕاستی دەمی کردەوە و لە ڕێگای دەمیەوە هەناسەی پێ دەدا. خەریك بوو شێت و هار دەبوو لە حەژمەت قوتابیە نازدارەکەی. دوای ئەوەی هەستی کرد کە هەناسەی نییە سوهەیل تەواو پەشۆکاو چەند جارێك پەستانی بەهێزەوە خستە سەر سنگی و لەپڕدا هیلال کۆکی و ژیان بە بەری سوهەیلدا هاتەوە. دوای کەمێ لە کۆکین و هاتنە دەرەوەی ئاو لە قوڕگیدا خێرا سوهەیل لە باوەشی کرد و بەپەلە بردیە ژوورێ و لەسەر چارپاکەی درێژی کرد.

هەر ئەو دەمە بەبێ وەستان چوو بەدوای دکتۆرێکدا و بەرەو حیکمەتخانەکەی هێنا.

ئەم ڕووداوە لەنێو حەکیمان و قوتابیەکاندا بڵاوەی کرد و گرووپی سەرخەرانی حیکمەت لە شتێکی وا دەگەڕان بۆ دوورخستنەوەی سوهەیل و دەرهێنانی قوتابیەکان لەژێر چنگی.

هەر لەبەر ئەمە كارەكەیان زیاد لە پێویست لەسەر گەورە كرد.

ئەو دەمەی هیلال تەواو هاتەوە سەرخۆی و دكتۆر چارەسەری پێویستی بۆ دانا سوهەیل چوویە لای و لەسەر لێوی چارپاكەی دانیشت و گوتی: چی بوو گیانەكەم؟ دەتهەویست بڕۆی و تەنهام بكەی، یان دەتهەویست چیدی دەست لە قژە ئاگرینەكەت نەدەم و بێ گڕوتین ببم. نامەوێ جارێكی دی بچیتە ژێر ئاو كاكە، دەترسم ئەم ئاوە ئەم گڕەی قژت بكوژێنێتەوە، ئاخر بۆچی چوویتەوە نێوی؟

هیلال بە دەنگێكی كزۆڵەوە گوتی: من نەچوومەوە نێوی مامۆستا، من هەرگیز فەرمانی تۆ ناشكێنم، وەلێ من لە دەو گۆمەكە چاوەڕێی زاری تۆ بووم پێم بێژی بڕۆرەوە، نەمزانی لەیادت دەچم، هەر ئەوەندەی تۆ ڕۆیشتی شتێك لەنێو ئاوەكە پێیەكانی ڕاكێشام و خزیمە نێوی.

+ شتی چی هیلال! تۆ دڵنیای لەوە؟ وەلێ ئەمە گۆمێكی بچووكە و هیچی تێدا نییە!

- بەڵێ دڵنیام، لەوە دەچوو دەستی مرۆڤێك بێ، هەرچەندە جوانم نەبینی مامۆستا، لێ بە ئەگەرێكی گەلێ زۆر ئەمە لە دەست دەچوو كە ڕایكێشام، زۆر بمبوورە قوربان زۆر.

لەم گوتانە دابوون دەرگاكە كرایەوە و بە سوهەیلیان ڕاگەیاند كە بەڕێوەبەری حیكمەتخانە كاری پێتە. سوهەیل بە ناچاری

هەڵسا و بەرەو ژوورەکەی حەکیم موڕاد کەوتە ڕێ و دەرگاکەی کردەوە و وەکو قوتابیەکی ملکەچ لەبەردەمیدا ڕوونیشت.

- بەخێرهاتی سوهەیل، کوڕەکەم شتێکی خراپم بیستووە کە هەرگیز حەزم لە بیستنی نەبوو. چۆن هێشتووتە منداڵێك بەتەنیا بچێتە نێو ئاو و دواتر بەجێی بهێڵی؟ ئایا ئەمە کارێکی عاقڵانەیە؟ گەر ئەم مناڵە شتێکی لێ هاتبا چیمان بە خزم و کەسی گوتبایە خۆت وەڵامم بەرەوە؟

لەو دەمەدا سوهەیل باسەکەی بە تەواوی بۆ بەڕێوەبەر ڕوون کردەوە و تێی گەیاند کە دەستێك ئەم کارەی کردووە و ئەو گوناهی نەبووە.

- من باوەڕم پێت هەیە سوهەیل، بەڵام ئایا بڵێینە خەڵکی دەستێك لەنێو ئاوەکە کارێکی وای کردووە بڕوامان پێ دەکەن؟ لە بەیانیەوە گرووپەکەی حەکیم ناسر بەناوی خنکاندنی منداڵێك و بێڕێزی کردن بە ناسڕی گەورەیان داوا دەکەن لێرە دوور بخرێیتەوە و قوتابیەکانت لێ بسەنرێتەوە. ئەگەر ئەم داوایە بۆ لای پادشا بەرزکەنەوە دڵنیام پشتی ئەوان دەگرێ و لەوەیە ئێمەش بکەوینە مەترسیەوە. ئەمە کارێکی کەم نییە سوهەیل، منداڵێك کەوتە ئاویلکە[١] و لێواری مردن، دەزانی مردن چی یە؟ یەك کاژێرە لەگەڵیان خەریکم بەس تا تۆ دەرنەکرێی و تەنێ

---

(١) ئاویلکە: سەرەمەرگ



قوتابیەکانت لێ بسەنرێتەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی یەکێکی لە زیرەك و چاڵاکەکانی ئێرە ئەمەم بۆت پێکرا، ئیدی لەوە زیاتر نەمتوانی کوڕم.

سوهەیل بە پەشۆکاویەوە: واتا ئیدی من ناتوانم وانە بڵێمەوە؟

- بەڵێ کوڕم، بەداخەوە کە وایە.

+ بەڵام ئەمە پیلانە، دڵنیام پیلانی ئەوانە بۆ دوورخستنەوەی من، تەنێ لەبەر ئەوەی لەگەڵ ئەوان نەبووم وایان بەسەر هێنام، ئاخر من چیم کردبوو چی؟

- پیلان بێ و هەو نەبێ تازە کار لەکار ترازا و هیچمان بۆت پێناکرێ.

سوهەیل بۆ تاوێك لە شوێنی خۆی داما و گوێی لە قرچە و کوڵانی نێو هەناوی ڕاگرتبوو، دواتر بە غەمباری و دەنگێکی کزۆڵ گوتی: یانی چیدی قوتابیم نابن؟ ئەی ئەوانەی ئێستا چیان لێدێ؟

- ڕادەستی حەکیمێك دەکرێن، ئەوانەشی لە قۆناغی سەرەتایی دەرچوون پێویست ناکا لای هیچ کەس بن و ڕەگەڵ قوتابیەکانی تر دەخرێنەوە.

سوهەیل بەچاوی پڕ گریانەوە: بەڵام هەندێکیان.... یانی دەمەوێ بڵێم خۆشەویستی لەم نێوەدا هەیە، نە من دەستم لێیان بەردەبێ و نە ئەوانیش.

- کارەکە لەوە دەرچووە سوهەیل، تکایە لێم تێبگە و بڕۆ کوڕم.

لەو دەمەدا فرمێسك لە چاوانی سوهەیل قەراریان نەگرت و غلۆر بوونەوە، بەر لەوەی حەکیم موراد فرمێسکەکانی ببینێ خێرا هەڵسا و بەرەو دەرگاکە چوو، بەچەشنێك دەڕۆیی و ئەملاو لای دەکرد کە دەتگوت ئازیزێکی مردووە و هێشتا باوەڕی نەکردووە و تاساوە بەم هەواڵە جەرگ بڕە.

بە هێدمەیی[1] چوویەوە ئەو ژوورەی هیلالی تێدا پاڵکەوتبوو، هیلال کە ڕوانی مامۆستای هات گرژینەوەیەکی[2] بۆ کرد و هەڵساوە و لەسەر چارپاکە ڕوونیشت، وەلێ سوهەیل نەیهێشت ڕوونیشێ و درێژی کردەوە. هیلال بەر لە ئەو دەستی بە قسان کرد:

- کە تۆم بینی مامۆستا هیچ ئازارێکم نەما بۆیە ڕوونیشتم. تازە بیرم لەوە دەکردەوە کە پێت بڵێم زیاد لە ئەندازە خۆشم دەوێی، هەر بەڕاستی دەبێ لە هەموو جیهاندا مامۆستایەکی وەکو تۆ بوونی هەبێ؟ بڕوا بەوە ناکەم. دەمەوێ داوای لێبوردن بکەم کە ئازارم دای قوربان، دەزانم ئەو دەمەی من بێ هۆش بوومە چ ئازارێك بە دڵت گەییوە، چون دەزانم چەندە کەسێکی پڕ سۆز و هەستی و چەندەش منت خۆشدەوێ.

---

(١) هێدمە: سەرسوڕمان و شۆك بوون

(٢) گرژینەوە: خەندە

ئەوەشم لەیادبێ تازە لە خەیاڵی خۆم دەمگوت کە مامۆستا هاتەوە پێی دەڵێم لەمەودوا وانەکانمان زیاتر بکەین و من بڕیارم داوە لە جاران پتر بخوێنم. بەڵێنیشت پێدەدەم کە چیدی هێندە لە کارەکانمدا جەربەزە[١] نەبم.

لەگەڵ ئەم قسانەی هیلالدا سوهەیل بەبێ دەنگی و ئارامی فرمێسکەکانی دادەبەزین و ئازارێکی هێندەی لەنێو سینەدا بوو کە لە گفتوگۆی خستبوو.

هیلال کە ئەوی بەم چەشنە بینی پەشۆکاو گوتی: چی بووە مامۆستا؟ بۆچی بەم شێوازە دەگری، مەگەر هیچ بووە؟! ئایا نابینی من سەلامەتم، نابینی لەجاران خۆشترم دەوێی، ئەها ئەوە هەڵسامەوە پێوە مامۆستا، بەخوا سوێندت بۆ دەخۆم هیچ ئازارێکم نەماوە، دەتەوێ سوێند بخۆم؟ ها دەتەوێ سوێندت بۆ بخۆم؟

سوهەیل کە لەبەر فرمێسکەکانی بە ئاستەم دەیبینی: سوێند مەخۆ کاکە، سوورەکەی من سوێند مەخۆ، من مامۆستایەکی باش نییم بۆت، لەمەودوا دەبێ لای یەکێکی دی بخوێنی و ئێستا تۆ گەیشتوویتە قۆناغێکی باش و پێویستیت بەمن نەماوە.

هیلال بە سەرسوڕمانەوە: ئەوە چی دەڵێی مامۆستا! تاوەکو ڕۆژی پەسڵان پێویستیم پێتە، من بێ باوك بووم، وەلێ تۆ

---

(١) جەربەزە: بزێو



باوكايەتيت بۆ كردم. من چۆن تۆ جێ دەهێڵم، مەگەر يەكێكی دی هەيە وەكو تۆ دڵسۆزبێ بۆم؟ پێم بێژە كەسی دی هەيە ئاوا قوتابيەكەی خۆی بلاوێنێتەوە و نازی هەڵگرێ و خۆشی بووێ؟ ئەی كێ دەست لە قژە سوورەكانم بدا؟ ئەمە مەحاڵە، تۆ نەشتەوێ هەر لەلات دەخوێنم.

سوهەيل نەيدەويست هيلالی بچووك لە ئەسرينەكانی بڕوانێ، بۆيە ڕووی خۆی لە دەرگاكە كرد و گوتی: كارەكە بەم جۆرە نييە هيلال، من چيدی ناتوانم وانە بڵێمەوە، ئەمە فرمانی بەڕێوەبەرە و دەبێ بەگوێی بكەين.

لەگەڵ ئەم قسەيەدا هيلال دەستی بە كۆكەيەكی توند كرد و خەريك بوو پرزەی بوەستێ. خێرا سوهەيل هەڵسايەوە و چەند جارێك كێشای بە پشتيدا و باديەك ئاوی پێدا و هێنايەوە سەرخۆی.

- مامۆستا تكايە شۆخيم لەگەڵ مەكە، وا دەبينی نەخۆشم و بەرگەی ئەم قسانە ناگرم. ئەگەر منت پێ قوتابيەكی باش نييە هەڵەكانم پێ بێژە دڵنيات دەكەمەوە چاك دەبم، تەنيا ئەو قسانە مەكە، سوێند دەخۆم بەرگەی ناگرم.

+ هێوربەوە ئازيزەكەم، ئەمە ڕاستيەكە و دەبێ قەبووڵی بكەين، كارەكە لە دەستی من نييە، تێبگە كاكە ئەی هاوار تێبگە.

هيلال سەراسيمە و غەمبار لە سوهەيل ڕامابوو، خولەكێك بێدەنگی باڵی بەسەر ژوورەكەدا كێشا و كەوتەوە گۆ: لەبەر

من مامۆستا؟ پێم بێژە لەبەر من تووشی ئەم کێشە بووی؟ یاخوا مردبام و لەبەر من نەکەوتیتایە ئەم حاڵەتە قوربان، یاخوا مردبام.

سوهەیل خۆی نەگرت و لە ژوورەکە هەڵسا و بەگریانەوە گوتی: بەسە هیلال، تکات لێ دەکەم قسە مەکە. تۆ بەو گوتانەت جەرگم هێندەی دی دەبرژێنی، تەواوی گیانم دەسووتێنی، هیچ مەڵێ کاکە هیچ مەڵێ. ئەوە من دەڕۆم جارێ، لە ژوورەکە تەنیا مەبە و با چەند قوتابیەکت لەگەڵ بێ، سەردەم.... هێژا... ئادەی وەرن و ئاگاداری هیلال بن حاڵی کەمێك خراپە.

سوهەیل لە ژوورەکە چوویە دەرێ و کزەی هەناوی دەهات لەتاوی ئەم منداڵە و هیچیشی بۆ نەدەکرا. ئەو شەوە نە خەو چوویە چاوانی و نە لە ئاگایی دابوو. هێندەی چەندین شەوی یەڵدا درێژەی کێشا و کۆتاییەکەی دیار نەبوو.

بۆ بەیانی لەکاتی خوێندنی وانەکاندا لە قوتابخانە ژاوەژاوێکی زۆری لەنێو هۆڵەکەی تەنیشتیدا بەرگوێ کەوت. ئەو دەمەی چوویە دەرێ و ڕوانی کۆمەڵێ لە قوتابی و مامۆستایان لە هۆڵەکەدا گردبوونەتەوە و لەنێویاندا ناڵە و هارژنی منداڵێك دونیای تەنیوە. کاتێك نزیکتر بوویەوە خێرا حەکیم ناسرِ لەنێو جەنجاڵیەکە هاتە دەرێ و دەستی سوهەیلی گرت و گوتی: تەماشاکە هیلال، ئەوە سوهەیلە، ئەو مامۆستا نییە و وەکو تۆ قوتابیەکە لێرە، تەنێ بۆ ماوەیەکی کاتی ئێوەی لەلا دانرابوو، ئێستا ئەو ماوەیە کۆتایی

هات و ئێوە دەچنە لای حەکیمێك. دەی ئێستا لە زاری خۆیەوە ببیستە کە ئەو ئامادە نییە چیدی وانە بە ئێوە بڵێ. ئینجا ڕووی کردە سوهەیل و گوتی:

پێویستە لەسەرت ئەم قوتابییە تێ بگەیەنی، یەك کاژێرە خەریکیمە هەر دەگریێ و دەڵێ لای سوهەیل نەبێ لای کەسی دی ناخوێنم. هەر هاوار هاواریەتی و زۆر زۆری بێزار کردووین و ئەگەر تێی نەگەیەنی بێگومان سزای دەدەین.

سوهەیل بە نەرمی و دیدەیەکی پڕ ئەسرینەوە دووبارە لە هیلال ڕاما و گوتی:

کاکە هیلال، زۆر داوای لێبوردنت لێ دەکەم، من ماوەی وانە وتنەوەم تەواو بووە، بۆیە بڕۆ لای ئەو حەکیمە بەڕێزانە و ئازاریان مەدە تکایە. لەبەر من ئەوە بکە کاکە.

سوهەیل هەستی دەکرد جەرگی زیواڵ زیواڵ[١] دەبێ بەم قسانە، لێ چارەیەکی دیکەی نەبوو.

هیلال بە گریانەوە هاواری کرد: نا نا هەرگیز ناچم، ئەوان تۆیان سزاداوە مامۆستا، دڵنیام تۆ ماوەت تەواو نەبووە دڵنیام، تا ئەم سزایە لەسەرت لانەچێ و نەیەمەوە لات نە نان دەخۆم و نە ئارامیش دەبمەوە. هەمووتان شایەد بن کە نان ناخۆم ئیدی. ئێوە هەر ئازان ئازاری منداڵە یەتیمێك بدەن، چۆن دڵتان دێ چۆن؟!

---

(١) زیواڵ: پارچەی دڕاوی کاڵا و شت.

+ کاکە نابێ نا، بۆچی لێم تێناگەی بۆ، من مامۆستاتم و بەگوێم بکە. تۆ ئازارم دەدەی هیلال، ئازارم دەدەی.

هیلال لەگەڵ ئەم قسەیەدا کەوتە سەر چۆك و وەکو باوك مردوویەك دەگریا. سوهەیل سەری خۆی داگرت و نەیتوانی لەم دیمەنە ڕامێنێ و لێوی خۆی دەکرۆشت لە حەژمەتانی. لەپڕدا هیلال هاوارێکی لێ بەرز بوویەوە کە لەنێو تەواوی هۆڵەکانی قوتابخانەکە دەنگی دایەوە.

ناسری حەکیم هێندە تووڕەبوو بە خێرایی چوو هەتا دەستی گرت شەپا زللەیەکی لە بنی گوێی هیلال داو هێندەی دی ژاوەژاوی پەیدا کرد. سوهەیل لە تووڕەییاندا شێت و هار بوو، ویستی بڕواتە پێش و حەکیمێك لە دواوە دەستی گرت و گوتی:

نەچی سوهەیل نەچی، چوونت کارەکە هێندەی دی ئاڵۆزتر دەکا کوڕم.

هیلال بۆ تاوێك ڕوومەتە کاغەزیەکەی خۆی گرت کە چەشنی گۆمە خوێنێکی لێهاتبوو، لە دوور ڕا وات دەزانی ڕەنگاوێکی سووری پێدا ڕژاوە. لەپڕدا هەڵهات بەرەو یەکێك لە پۆلەکان و دەرگاکەی لەسەر خۆی گاڵەدا. لەم دیوەوە حەکیم ناسر کلیلەکەی دەرهێنا و دەرگاکەی کلیل داو گوتی: تا دەبی بە پیاو لە ژوورەوە دەبی.



ئەم جارەیان سوهەیل خۆی بۆ نەگیراو بە توورەیی هاتە دەنگ: چۆن منداڵێکی بچووك لە ژوورێکی وادا بەند دەکەن، مەگەر ئەمە حیکمەتخانەیە یاخود بەندیخانە؟

ناسری حەکیم لەو توورەتر کەوتە گۆ: هەر قوتابیەك بێڕێزی بەرامبەر حەکیمان و حیکمەتخانە بکا زۆر لەوە خراتر سزای دەدەین. ئەوە ئێمەین بڕیار دەدەین کە قوتابی چۆن بخوێنێ، هەرچی یاساکانی ئێرەی بەدڵ نییە دەتوانێ نەیەتەوە.

سوهەیل ویستی قسە بکا و حەکیم موڕاد دەستی لەسەر دەمی دانا و لەگەڵ خۆی بردیەوە ژوورەکەی.

سوهەیل بە گریانەوە: بەڵام جەنابی حەکیم ئەو منداڵێکی یەتیمە، من وەکو باوك بووم بۆی، سەختە ئێستا من لە ئەو جودا دەبمەوە لێی تێبگە. چۆن دەکرێ ئەو منداڵە بێ کەسە ئاوەها لە ژوورەوە بەند بکرێ، ئەمە چ ویژدانێکە پێم بێژە!

- لە ئێستادا هەرچی بڵێین ئێمە تاوانبارین سوهەیل، لێگەڕێ تا بارودۆخەکە ئارام دەبێتەوە با وابێ. دڵنیام دواتر خۆیان دەرگای لەسەر دەکەنەوە، جارێ ئاوا باشترە کوڕم هێور بەوە، من تێت دەگەم، لێ دەبێ ئەوەش بزانی کە ئەو کوڕە پشێوی لەنێو قوتابیان بەرپا کردووە و وانەی تێك داوە.

+ تۆ بەڕێوەبەری، یانی ناتوانی دەرگا لەسەر ئەم منداڵە بەستەزمانە بکەیتەوە؟

- ڕاستە من بەڕێوەبەرم، لێ قسەی ئەوان پتر لای پادشا دەخوا. جارێ لێگەڕێ با وابێ سوهەیل، دەبێ ڕۆژێك ئەوانە لێرە دەرکەین و حیکمەتخانەیان لێ پاك بکەینەوە، تەنها چاوەڕێ بە کوڕم، منیش چاوەڕێی ئەو ڕۆژەم. تۆ تەنێ ئەوەندەم بە قسە بکە ئێستا بڕۆ، ئەم دوو ڕۆژە بڕۆرەوە ماڵێ با هیلال و ئەوانیش نەتبینن، ئەو دەمەی بارودۆخەکە هێمن بوویەوە دەتوانی بێیتەوە.

+ باشە بە قسەت دەکەم و ئەو دوو ڕۆژە دەڕۆم، بەڵام توخودا ئاگات لەم مناڵە بێ، ئەو یەکێکە لە زیرەکەکان و حەکیم بوون لە خوێنی دایە، باپیرانی حەکیمی مەزن بوون و ئومێدێکی زۆر زۆرم پێیەتی.

- تەواو سوهەیل گیان تەواو، تۆ بڕۆو خەمی هیچت نەبێ.

سوهەیل بە غەمباری و چاوی تەژی لە ئاوەوە ڕۆیی، جگە لە هیلال خەیاڵی لەسەر هیچ چشتێکی دیکە نەبوو، تەنانەت ئەم دوو ڕۆژە نانیشی بە تەواوی بۆ نەدەخورا، بە چەشنێ هیلاك دەینواند کە ماڵەوە وایان دەزانی لە حیکمەتخانە دەرکراوە.

دوای دوو ڕۆژەکە گەڕایەوە حیکمەتخانە، یەکەم کاری چوویە ژوورەکەی حەکیم موڕاد و لە هیلالی پێچایەوە.



- ئەها سوهەیل گیان، لەڕاستیدا زۆر بمبوورە، ئەم دوو ڕۆژە هێندە سەرقاڵ و کەوەڕێ[١] بووم ئەو منداڵەم هەر لە خەیاڵ نەما، تا ئێستا نەمدیوە و نازانم.

سوهەیل بە ترس و واق بوونەوە: چی چی؟! بەڵام من ئەوم بەتۆ سپاردبوو ئەی هاوار.

خێرا دەرگای ژوورەکەی کردەوە و بەرەو ئەو ژوورە ڕایکرد کە هیلالی تێدا بەند کرابوو.

ئەو دەمەی گەیشت دەستی بۆ ئەڵقەی دەرگاکەبرد و ویستی بیکاتەوە، وەلێ نەبوویەوە. جارێکی دی توندتر پاڵی بە دەرگاکە ناو دیسان نەبوویەوە. لە خەیاڵیدا گوتی وێدەچێ هیلالیان هێنابێتە دەرێ و لەدوای ئەو کلیلیان دابێتەوە. خێرا ڕایکرد بەرەو ژووری مناڵەکان لە هیلالی پرسی، یەکێ لەوانەی پێشووتر قوتابی خۆی بوو هاتە پێشەوە و گوتی:

مامۆستا گیان هیلال هێشتا لە ژوورێیە و دەرگاکەی لێ نەکراوەتەوە.

سوهەیل لەگەڵ ئەم قسەیەدا ڕەنگی ڕوخساری پەڕی، هۆشی لە کەللەدا نەما، بۆ تاوێك خوێن لە دەمارەکانیدا ڕەق بوو. لەو کاتەدا منداڵەکە وەدەنگ هاتەوە و گوتی:

---

(١) کەوەڕێ: شەکەت

دوو ڕۆژە هیچ کەسێ نە نان نە ئاوی بۆ نەبردووە، چەند جارێك لەپشتی دەرگاوە پێیان دەگوت ئەگەر پەشیمانی و ئامادەی خوێندنی تا نانت بۆ بێنین، لێ ئەگەر واز لە سوهەیل نەهێنی لێرە دەرت دەکەین. بەڵام هیلال ڕەزامەندی بۆ دەرنەدەبڕین، ئیدی لەو کاتەوە هیچیان پێ نەداوە. ئێمەش زۆر غەمباری ئەوین قوربان، تکایە چارەسەرێکی لێ بکە ئەو زۆر گوناهە.

لەو دەمەدا سوهەیل بە ڕق و تووڕەییەکی لەڕادە بەدەر کە پشی بۆ نەدەخورایەوە ڕایکرد بەرەو ژوورەکە و هەتا توانای هەبوو ژێری پێی بەو دەرگایەدا کێشا کە هیلالی تێدا بەند کرابوو. لەگەڵ یەکەم لێداندا دەرگای تەختی زەوی کرد. ڕوانی وا هیلال لە سووچێکی ژوورەکە کەوتووە و ئاگای لەخۆی نەماوە لەبرسان. خێرا وەکو شێتێك ڕایکرد بەرەو ناندینەکە و پارچە نان و پەنیرێکی هەڵگرت لەگەڵ بادیەك ئاودا و بە ڕاکردن گەڕایەوە ژوورێ.

هیلال لەوە خراتر بوو کە نان و ئاوی بۆ بخورێ. سوهەیل بە گریان و هاوارەوە کە دەنگی دەدایەوە لەنێو قوتابخانەکە ناوی حەکیمەکانی بە زاڵم و ستەمکار دەهێنا و تەواوی قوتابیان و بازێ لە حەکیمەکانیش هاتبوونە دیار ئەم دیمەنە تراژیدیایە.

ئاوی بە سەروچاوی هیلال دادەکرد و سەری خستبوویە سەر ڕانەکانی و دەیگوت لە دەوری سەرت گەڕێم هەڵسەوە کاکە،

ناوە ناوەش لەتە نانێکی لەنێو بادیە ئاوەکە بۆ نەرم دەکردەوە و بە گریانەوە لە دەمی دەخست و هاواری دەکرد هەی زاڵمینە، ئێوە چ ویژدانێکتان هەیە، ئێوە کەی دەزانن خۆشەویستی چی یە، کەی دەزانن ڕێز لە بیروبۆچوونی منداڵێك بگرن، هەمووتان ستەمکارن، ستەمکارانە چییان بەسەر ئەم منداڵەدا هێناوە، ستەمکاریناااااااا.

هێندێ دەمیش بە دەنگێکی هێمن و گریاناویەوە هۆنراوەی بەسەر هیلالدا دەخوێندەوە و دەیگوت:

خـــــۆشەویستـــی تـۆ کە مـایـەی زام و ناسـۆری منـە
ڕەنگی ســـووری تۆ کە مایەی ڕەنگەکەی سۆری منـــە
هەڵسە بەو تاڵی قژانەت بـــا نەسووتێ گـشت هـەنـاو
هەڵسـە دەی لەمنی خەفەتبـــار بـا بمێنێ دەنگ و نـاو
چاوەکەت داخەی ئەمن چۆن داینەخەم ژووری تـەمەن
لێوەکەت گەر نێتە گۆ چۆن هەمبێ من کات و زەمــەن

هەموو لەدیار ئەم تراژیدیایە واق بوو بوون، هەر لە دیمەنی فیلمێك یاخود ڕۆمانێکی خەمهێنەر دەچوو کە کۆتاییەکەی مرۆڤێك بووبێتە قوربانی.

لەو کاتەدا دوو سێ دانە لە حەکیمە تەمەندارەکان هاتن و دەستی سوهەیلیان گرت تاوەکو هێوری بکەنەوە، لێ سوهەیل لە هاوارەکانی نەدەوەستا و دەیگوت شکاتتان لێ دەکەم، بەڵێ



شکات لەهەمووتان دەکەم، بەیانیش لای حەکیمی مەزن دەڵێم ئەمە حیکمەتخانە نەبوو ئەمە ستەمخانە بوو، منداڵێکی یەتیمی تێدا بەند و بێ نان و ئاو کرابوو. مەگەر هەمووتان نەتان بیستووە کە شاعیر گوتوویەتی:

مەی بخۆ، گڕ بەردە مینبەر، خەرقە بۆن سۆی لێوەبێ
لێ نەکەی کارێ بکەی قەت ئێشی خــــەڵکی پێوەبێ.

کۆمەڵەکەی حەکیم ناسر هەموو سەریان لەبەرخۆ نابوویەوە و چ قسەیان نەدەکرد، هێندێ لە حەکیمەکانیش دەیانگوت بەڕاستی زوڵمێکی گەورە لەم منداڵە کراوە و ئێمە لێی بێئاگابووین. ئیدی دەست بە ژاوەژاو و قسە کرا و هەموو بکەری ئەم کارەیان بە ستەمکار ناو دێنا.

هێندەی پێنەچوو حەکیم موراد دکتۆرێکی هێنا سەر هیلال و سوهەیلی بردە ژوورەکەی خۆی تا هێوڵەی[1] بکاتەوە.

- سوهەیل گیان، سوێندت بۆ دەخۆم لەبەر مژووڵی ئێمە ئاگامان لەم منداڵە نەما، ئاخر من گوتم تەنێ دوو سێ کاژێرە و دەرگای لێ دەکەنەوە، چووزانم بێ ویژدانانە ئاوا بەندیان کردووە، خۆ ئەو کوڕەش نقەی نەدەکرد لە ژوورێ، هەرنا دەنگێکی لێوە هاتبا و بمانزانیبا.

---

(١) هێوڵەبوون: هێوربوون

+ تەواو هەموو شتێك ڕۆیی ئیدی، دواتر هەواڵ دەدەمە ماڵێیان ئیدی کەیفی خۆیانە دەیهێڵنەوە یان لە قوتابخانە دەری دێنن. ئەگەر شکاتیش بکەین هەر بێ ئەنجامە.

- هێندەی بزانم ئەوان قەرار نییە دەری بێنن، چون خۆم لە دایکیم بیستووە دەیگوت هەموو ئاواتی ژینم ئەوەیە ئەم کوڕەم ببێتە حەکیم، تەنانەت ئەگەر هەرچی هەمە لەسەری دابنێم. ئەوەی لەسەر تۆیە هەر هێندەیە کە نابێ ئەم کوڕە بتبینێ چیدی، پێویستە ئەم خۆشەویستیە بکوژرێ جارێ، هەر ماوەیەکە لەیادت دەکا و تەواو، لەبەر بەرژەوەندی وی پێویستە ئەوە بکەی سوهەیل.

+ باشە ئەوە خۆم لێ ون کرد، ئەی گەر ئەو مناڵە خەڵەتا و بەیانی گەورەبوو بە بیروباوەڕی ئەوان کاریگەر بوو چی؟ یان گەر دووبارە لەژوورێیان کردەوە و کوشتیان چی؟

- ئێمە لێرەین کوڕم، هەر ئێستا لەبەردەمی تۆ حەکیمێك ڕادەسپێرم بۆ ئەوەی ئاگای تەواوی لە هیلال بێ و تا بتوانین ناهێڵین قوتابیەکان کاریگەربن بەم بیروڕا نوێیە و ئاگاداریان دەکەینەوە، دوای ئەوەش هەموو هەوڵێکم دەدەم کە پادشا ئەوانە لێرە لابا و قوتابخانەیەکی سەربەخۆیان هەبێ.

+ یانی وەکو جارەکەی دی لەیادی ناکەی؟

- بەڵێن بێ بەڵێنی برایانە کە هەر ئێستا حەکیمێك ڕاسپێرم و ئاگاداری بێ.

سوهەیل هێندە غەمباربوو کە دەتگوت دڵیان بە چەقۆیەکی برندە پارە پارە کردووە، ئیدی دەبێ بە ناچاری دەست لە قوتابیە ئازیزەکەی هەڵگرێ و بە هەموو چەشنێ خۆی لێ وەشارێ.

ئەو ڕۆژە چوویە ماڵی هیلال و دایکی ئاگادار کردەوە کە بێ و کوڕەکەی بەرێتەوە تا چاك دەبێ و بەسەرهاتەکەی بۆ وەگێڕا. ئیدی بڕیارە گوپچڕەکەی دا و چیدی بەدوای هیلالی بچووکدا نەچوویەوە و بەتەواوی خۆی لێ ون کرد. ئەگەرچی جەرگی بۆ ئەم منداڵە کزەی لێوە دەهات، چەند ڕۆژبوو لە حەژمەتان ڕووی لە چیاکان دەکرد و بەسەریان دا هەڵدەزنا، لەدەو جۆبارەکاندا[١] تەنیا ڕوودەنیشت و هۆنراوەی ئەویندار دەخوێندەوە، هێندێ بۆ دووری پریاسکە خانم و هێندێ بۆ دووری هیلال.

چەند ڕۆژبوو حەجانی نەبوو، دەم نا دەمێك دادەما و فرمێسکی تەڕ و تازەی وەکو بارانی بواران دادەباراند. سێ ڕۆژ بەسەر ڕووداوەکەدا ڕۆیی بوو، بەیانیەك سوهەیل لەکاتی پشوودا لە قوتابخانە هاتبوویە دەرێ و بەوێنەی جاران لەژێر ئاسۆکی چیایەکی بەرزدا پاڵی دابوویەوە.

---

(١) جۆبار: جۆگە



چەشنی هەموو دەمانی دی خەیاڵی لای ئەو ڕۆژە بوو کە پریاسکە خانم دەگوازێتەوە، ناوە ناوەش ئاخێکی قووڵی بۆ هیلال هەڵدەکێشا و ڕۆندك لە چاوە ماندووەکانی دەزا.

لەپڕدا گوێی لە خشپە خشپێ بوو، سەری بەرز کردەوە و هێندەی زانی دوو پیاوی دەمامکدار هاتنە سەری. سوهەیل تەکانێکی دا خۆی تا هەڵسێتەوە خێرا یەکێ لەوان پێی لەسەر سەری دانا و تا هێزی هەبوو سەری سوهەیلی بە زەویەکەدا کێشا. سوهەیل هاوارێکی کرد و هەستی کرد خوێن لە پشتە سەری فڕکەی کرد، خێرا دەستێکی بە برینەکەوە گرت و خۆی غلۆر کردەوە نێو جۆبارەکە و هەڵسایەوە.

دوو پیاوە نەناسراوەکە هێرشیان بۆ بردەوە و سوهەیل ڕایکرد و خۆی بەنێو داروباری جەنگەڵەکە دادا. ئەو بەردەوام بوو لە ڕاکردن بەنێو دارستانەکە و پیاوەکانیش بە خێراییەکی زۆرەوە وەدوای کەوتبوون. سوهەیل لە ترسان بە چەشنێ ڕایدەکرد کە سەرو چاو و پێیەکانی هەمووی ڕووشابوون و خوێنیان لێ دەتکا هێندەی خۆی بە دڕك و چقڵەکان دا بدا، لێ پیاوەکانی دواوەی هەوڵیان دەدا لەو بەهێزتر ڕابکەن و بەزوویی بیگرن.

لەپڕدا پێکانی لە دارو دڕووی سەر ڕێگاکە گیربوون و زۆر بە خراپی بەسەر دەمدا بەربوویەوە و دەمامکدارەکان خۆیان خستە سەری و دەستیان کرد بە لێدانی. ئەوان هێندە بە خراپی

دەستیان دەوەشاند کە بەڕوونی دەتزانی بۆ کوشتنی هاتوون. سوهەیل چون لە ژیانیدا شەڕی نەکردبوو، دەستەکانی هەر پێنووسیان گرتبوو، هەر هێندەی دەزانی دەست بە سەرو چاویەوە بگرێ تاوەکو زەبرەکان بە شوێنە کوشندەکانی نەکەون، لێ هێندەیان پێ خستبوویە سەر دەستی نزیك بوو لەوەی ئەوانیش تواناى بەرگریان نەمێنێ. سوهەیل لەگەڵ هەر زەبرێکدا ئاو لە چاوانی دەهاتن، ئەو لە ئێستادا نەیدەویست بمرێ، ئاخر هێشتا ئاواتەکانی بەجێ نەگەیاندووە، دایك و باوکی بە جلی حەکیمان نەیان دیوە، ئەی ئاهەنگەکەی پریاسکە بە سواریماینە ڕەشەکە، خۆ ئەویش لەو ئاواتە مەزنانەیە کە هێشتا بەرگی بوونی بەبەردا نەکراوە. ئەی گەر لەدوای مەرگی وی پریاسکە شوو بکا چی؟ ئەم خەیاڵانە هێزیان بەبەردا کردەوە و خێرا بە هەموو تواناییەوە تەکانێکی تری بەخۆیدا و دووبارە خۆی لەژێر چنگی بکوژەکان دەرهێنا و دەستی بە ڕاکردن کردەوە، لێ ئەمجارە زۆر بێهێز ببوو، هەستی دەکرد سەری دەسووڕێ و دونیا لەلای چەپ و چێڕ دەبێتەوە[١].

پیاوەکانیش دەیان زانی ناتوانێ زۆر ڕاکا و هێزی تیا نەماوە، بۆیە هێواشتر وەدوای کەوتبوون و خۆیان وەکو جاری یەکەم ماندوو نەدەکرد. سوهەیل گەیشتە سەر ڕووبارێکی گەورە

---

(١) چەپ و چێڕ: سەراو گێڕ

و لەسەر چەولگەکە[١] وەستا و ویستی خۆی بخاتە نێوی سا بەڵکو ئەوان مەلە نەزانن و نەتوانن بەدوایدا بێن، لێ هەر ئەوەندەی ویستی خۆی هەڵدا لەدواوە یەکێ لەوان کراسەکەی گرت و ڕایکێشا بۆ دواوە و دڕاندی. دووبارە بە هەردووکیان دەستیان بە لێدانی کردەوە، ئەوان زۆر نامرۆڤانە و بەبێ ویژدانی لێیان دەدا. سوهەیل هەستی بە خوێنێکی زۆر دەکرد کە لە دەم و لووتیدا فڕکەی دەکرد و لەسەریشی دەهاتە خوارێ. زیخ و چەوەکەی دەو ڕووبارەکە بە خوێنی سوهەیل نەخشێنراو و ڕەنگ کرابوو، جلەکانی بەری سەرپاکی لەنێو خوێندا بوون و سوور داگەڕابوون. لەو دەمەدا بیستی کە یەکێکیان دەیگوت ئا ئەمە سزای بێ ڕێزی کردنە بەرامبەر حەکیمی گەورەمان. کەسانی وەك تۆ نەفام و لادەر لەڕێی ڕاست هەر دەبێ ئاوا بە ئازارەوە بمرن. بژی سەرخەرانی حیکمەت، مردن بۆ ئێوەی لادەر لەڕێی حەق.

هێندەی نەبرد سوهەیلی تازە لاو لەبەر زەبرە کوشندەکان خۆی نەگرت و هۆشی لەسەردا نەما، لەنێو خوێنی خۆیدا گەوزابوو. ئەو دەمەی تەواو جەستەی لە جووڵە کەوت یەکێ لە پیاوەکان گوتی: وابزانم نەماوە و دڵی لێنادا، با بڕۆین و تەرمەکەی لێرە جێ بێڵین، بەر لەوەی کەسێك بمان بینێ و تووشی کێشەبین.

---

(١) چەولگ: شوێنێك زیخی زۆربێ.

+ نەخێر، هێشتا لە مردنی ئەم هەتیوە دڵنیا نیم، ئەمە زۆر دژایەتی گرووپەکەمانی دەکرد و ڕۆژ و شەو قوتابیەکانی لێمان دنە دەدا[1]، بۆیە دەبێ تەرمەکەی بخرێتە نێو ئاو و ببێ بە پەند بۆ هەموو ئەوانەی دی.

لەم کاتەدا بە هەردووکیان سوهەیلیان بەرز کردەوە و تێیان هەڵدا بۆ نێو ڕووبارەکە.

ئا لەم ساتە خاتوو لیا هەستی کرد دەستەکانی تەواو شل بوون و توانای جووڵە و نووسینیان نەماوە.

- دەستم تەواو شل بووە مامە گیان، دەکرێ کەمێ ئەم نووسینە ڕابگرین؟

+ ئەی بۆنا کچم، هەر خۆم خەریك بوو ئاگادارت کەمەوە کە پشوویەك بدەین.

- وابزانم چیرۆکەکە دوای مردنی سوهەیل چێژێکی وای تێدا نامێنێ، بەڕای تۆش وانییە؟ بەڕاستی من بۆی نیگەرانم.

+ هەموو دەڕۆین و چیرۆکی هەموومان کۆتایی دێ کچم، هیچمان لەمەدا ناتوانین خۆمان دەربازکەین و لەم بڕیارەدا چ کەس جوداواز نییە لەوەی دیکە. ئەم تاقیکردنەوەی ئێرە هیچ نییە و تاقیکردنەوەی مەزنمان لەپێشە.

---

(١) دنەدان: هاندان

- هەر بەڕاستی خەریکە کێشەی خۆم لەیاد دەکەم، دەمەوێ بزانم دوای سوهەیل قوتابخانەی حیکمەت چی لێ بەسەر هات و هیلال بەرەو کوێ ڕۆیی، هەر بەڕاستی دایکی دەری هێنا لە حیکمەتخانە یاخود هێشتیەوە؟ ئەی خاتوو پریاسکە، ئەم کچە جوان و نادیارە چی لێهات و شووی بەکێ کرد؟ داوام لە حەکیمی مەزنە پاداشتت بداتەوە مامە گیان، هێندە ئاوێزانی ئەم چیرۆکەت کردم، خەریکە لەیادم دەچێتەوە کە من کێشەیەکم هەیە و نازانم بۆچی هاتوومەتە ئێرە. دەکرێ لەمەودوا بە مامۆستا بانگت بکەم؟

+ بەڵێ کچم، ناو گرنگیەکی ئەوتۆی نییە، بە هەر ناوێك دەتەوێ بانگم بکە. ئێمە لەو کەسانەین کە گرنگی بە کرۆك دەدەین نە توێکڵ.

- دەمەوێ بەر لەوەی دەست پێبکەینەوە سەبارەت بە شتێك لێت بپرسم، بەبیرم دێ باڵا هەموو جارێ زۆر دەربارەی شاعیرێك دەدوا کە کەسایەتیەکی ڕۆحی هەبوو. ئەها وابزانم ناوی بوسیری بوو، زۆر زۆر بەو کەسایەتیە و هۆنراوەکانی سەرسام بوو. دەکرێ باسێکی ئەم مرۆڤەم بۆ بکەی ئەگەر زانیاریت دەربارەی هەبێ؟

+ زۆرم پێخۆشە لەمەڕ کەسێکی وەها ڕۆحیەوە لێم دەپرسی، ئەمە نیشانەی ئەوەیە لە مادده بێزاری و دەتهەوێ ئاشنای ڕۆحانیەت ببی. بەڵێ پێشەوا بوسیری هەم مرۆڤێکی گەورە

و هەم شاعیرێکی گەورە بوو. ئەو بە تەواوی لەنێو عیشقدا ڕۆچووبوو، توابوویەوە لە مەعشووقەکەی خۆیدا. لە ڕۆژی سێشەممە دابوو، سەرەتای مانگی شەووالی ساڵی (٦٠٨)ی کۆچی کە ڕێك دەکاتە (١٢١٣)ی میلادی، لە ناوچەی دەلاسی وڵاتی میسری ڕۆژئاوای نیلی شینەوە سەرمەشقی عاشقان لەدایك بوو، ئەو پیری ئەوینداران و هەڵگری سەری بوڕکانی عیشق بوو، هەڵدەرەوەی ڕووپەڕی جوانی و قەشەنگی بوو، تەقێنەری کانیاوی شیعر و هۆنینەوە بوو، بناغەی خانووی عیشق و فوو پێداکەری کەڕەنای زیندوو بوونەوەی هەست و سۆز بوو. ئەوبوو سەر لە نوێ کانیاوی شیعری تەقاند، بە دەم و زاری یادی دولبەری دەکرد و بە دەستەکانیشی نەخش و نیگاری ناوازەی بە هۆنراوە و ستایشی مەعشووق بەرز دەکردەوە و دەیشەکاند. بە هۆنینەوەکانی هەرچی لەمپەر بوو لەنێوان خۆی و لەیلەکەیدا تێکی شکاند و بەرەو دەریای فەنا بەڕێی کرد. بە دڵێکی تەژی لە عیشق بەرەو جیهانی ڕۆحانیەت هەنگاوی ناو جیهانی ماددەی نەویست و لەپێی کرد. بەڵێ لەم ساڵەدا ئەم کەڵەپیاوە مەزنە هاتە دونیاوە بەناوی موحەممەدی کوڕی سەعیدی کوڕی حەمادی بوسیری. ئەم زانا مەزنە لەئەسڵدا خەڵکی وڵاتی مەغریبە و لە خێڵی سەنهاجەی بەربەریە کە گەلێ میر و خاوەن دەسەڵاتیان تیا هەڵکەوتووە. ئەم بەڕێزە بە بوسیری بەناوبانگ بوو، بوسیر یەکێك بوو لە شارۆچکەکانی میسر. ئەو زانایەکی مەزنی ئاینی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا بە پێشەوای شاعیرانی ئاینی و

عیشق داندرابوو. ئەم شاعیرە مەزنە لە بەلبیسی میسڕدا لەلایەن پادشای ئەوکاتەوە فەرمانی کۆکردنەوەی باجی پێ سپێردرابوو. لەبەر وریایی و زیرەکی و دەست پاکیەکەی لەلایەن میر و فەرمانڕەوایانی ئەم سەردەمە زۆرترین ڕێزی لێ گیراوە.

لە سەرەتادا زیاتر ژیانی خۆی لەلای میر و پادشا و دەسەڵاتداران بەسەر بردووە و ستایشی پیاوە گەورە و پادشاکانی بە شیعر کردووە و هۆنراوەکانی لەخزمەت کردنی ئەواندا بەکار هێناوە. ئەو کەسەی دژی ئەم میرانەش بووبێ بە شیعرەکانی هەجووی کردوون و قسەی پێ گوتوون، وەلێ ئەو بۆ کارێکی گەورەتر لەوە ئامادە کرابوو، بۆیە نەدەبوو لە خزمەتکردنی دەسەڵاتداران بەردەوام بێ و نیوەکەی تری ژیانیشی بەفیڕۆ بڕوا.

- باشە دواتر چی لێ بەسەرهات، ئایا پەشیمان بوویەوە لە خزمەتکردنی ئەوان؟ ئینجا دەمەوێ چەند دێڕە شیعرێکی ئەویشت لێ بژنەوم، بەڵکو دڵم پتر ئارامی ڕووی لێ بکا.

+ بەڵێ کچی خۆم، ڕۆژێك ئەم شاعیرە مەزنە لەماڵێ دێتە دەر تاکو بچێ بەرەو ماڵی پادشا، لە ڕێگادا تووشی پیاوێکی نوورانی و عاشق دەبێ، ئەم پیاوە عاشقە پێی دەڵێ ئایا تۆ تا ئێستا نێردراوی حەکیمی مەزنت لە خەودا بینیوە؟

بوسیڕی لەم پرسیارەدا سەری سوڕ دەمێنێ و دەپەشۆکێ، چون تا ئێستا کەس پرسیاری وای بۆ نەوروژاندووە، بۆیە بە



سەرسامیەوە دەڵێ نەخێر نەمدیوە، من و نێردراوێکی وەها مەزن کوجا مەڕحەبا، وەلێ بەڕاستی ئەو پرسیارەی تۆ کوورەی دەروونمی سوور کردەوە و داغی پێوەنام و ئارامی نەهێشتم. کابرای عاشقی نوورانی کە ئەم وەڵامەی لە بوسیرِی بیست ماڵئاوایی لێکرد و چ قسەی دی نەکرد و لێیدا ڕۆیشت.

لەو کاتەدا پێشەوا بوسیرِی گوتەی ئەو پیاوە عاشقەی لەدڵدا بوویە گرێ و تەواوی هزر و بیری داگرت و هۆشی لەلای خۆیدا نەهێشت. ئیدی خەیاڵی شێواو نەیتوانی بڕواتە مەجلیسی پادشا، هەر لەو ساتەدا بە تاڵووکە[1] گەڕایەوە ماڵێ و بڕیاری دا کار لەسەر گوتەی ئەم مرۆیە نوورانی و عاشقە بکا و هەوڵی بینینی نێردراوی مەزن بدا. بۆ ئەم مەبەستە دەبوایە واز لە هاتووچۆی پادشا و دەسەڵاتداران بێنێ، چون هاتووچۆی ئەوان دڵ ڕەش دەکات و مەیلی مرۆڤ بەلای دونیادا دەبات و لە هەرچی بابەتی ڕۆحیە دووری دەخاتەوە. هەر ئەم کاتەش بە زوویی ئەم بڕیارەی دەرکرد و دەستی بە خواناسین کرد، سا بەڵکو حەکیمی مەزن لێی ببوورێ و بە خزمەتی نێردراوی بەڕێزی بگەیەنێ.

- ئینجا دواتر چی کرد؟ ئایا نێردراوی مەزنی بینی لە خەودا؟

+ بەڵێ کچم، هەرکەسێك لە ئێمە کار بۆ هەر شتێك بکەین پێی دەگەین، پێ نەگەیشتن بوونی نییە، ئەوەی هاتە سەر ڕێگا

---

(١) بە تاڵووکە: بەپەلە

بێگومان دەگا، لێ هەر ئەوەندەی دێتە سەر ڕێ زەحمەتە و جووڵانی گەرەکە.

هەر ئەو ڕۆژەی دەستی بە خواناسین کرد شەوەکەی لە خەودا بینی ئەوا نێردراوی مەزن بە وێنەی کێوێکی تۆکمە کە سەرتاپای نووربێ وەستاوە و هاوڕێکانی دەورەیان لێ داوە. ئەو دەمەی پێشەوا بوسیری چاوی لەم دیمەنە کرد دڵ و دەروونی بە چەشنی مەنجەڵ هاتە جۆش، خۆشەویستی ئەم نێردراوە مەزنە وەکو کراسێك کرایە بەری و لێی جوێ نەبوویەوە. لە خۆشی ئەم خەوەدا خەبەری بوویەوە و ئیتر بەجارێ وازی لە مادده و دونیا هێنا. پەشیمانی دەربڕی بەرامبەر هەموو ئەو دەقە شیعرانەی ڕۆژێ لەڕۆژان بۆ ئەمیر و کاربەدەستێکی نووسیوە، بۆ هەموو ئەو هەجوانەی لە دژی نەیارانی پادشاکان نووسیویەتی. فرمێسکی پەشیمانی وەکو باران و جۆگەلەی باریك لە چاوانی دەتۆران و دەخزینە خوارێ. دواتر لە خۆشەویستی و عیشقی نێردراوی مەزندا چەند هۆنراوە و چەکامەیەکی نووسی بەڵکو بتوانێ قەرەبووی ئەو ساتانە بکاتەوە کە تێیدا بێ ئاگا بووە. هێندەی پێنەچوو دوای نووسینی ئەم هۆنراوانە پێشەوا بوسیری تووشی نەخۆشی ئیفلیجی بوو، لەنێو ئەشکەوتێکی شارەکەدا زۆر بە زەحمەت و گوپچڕی دەژیا. وای لێهات نیوەی جەستەی لەکار کەوت و چارەسەرێکی نەبوو. هەموو ئەو پادشا و ئەمیرانەی شیعری بە باڵادا دەخوێندنەوە سوودێکیان پێی



نەگەیاند و دکتۆرێکیان نەهێنایە سەر. بە غەریبی و نارەحەتیەوە ڕۆژەکانی بەڕێ دەکرد و وەکو نیوە مرۆڤی لێ هاتبوو. ڕۆژێکیان ئەوەی بە خەیاڵدا هات کە من هێندە ستایشی نێردراوی مەزنم بە شیعرەکانم کردووە، چۆن دەبێ ئەو نەیەتە هانام و کۆمەکیم نەکا، بێگومان ئەو ئێستا ئازارەکانم دەبینێ و ئاگادارە پێی. واچاکە هۆنراوەیەکی تریش لە ستایشی ئەم خۆشەویستەم بنووسم کە لە هەموویان تایبەت تر و درێژتر بێ، بەڵکو حەکیمی مەزن بەهۆی ئەم هۆنراوەیە چارەم بۆ بنێرێ و لەم ئازارە ڕزگارم بکا. لەم کاتەدا پێشەوا بوسیری دەستی کرد بە نووسینی چەکامە بەناوبانگەکەی و ناوی نا(ئەستێرە مرواریەکان لە ستایشی چاکترین مرۆڤ)[1]. ئەو دەمەی لە نووسینی چەکامەکە بوویەوە بەخاتری ئەو چەکامەیە لە حەکیمی مەزن پاڕایەوە تاوەکو شیفای بۆ بنێرێ.

هەر لەم ئەشکەوتەدا شەو بە گریانەوە خەوی لێکەوت، لەخەودا بینی کە سەرداری مرۆڤایەتی، نێردراوی مەزن ئەوا لە ژوورێکدا ڕوونیشتووە. دەفەرموێ منیش چوومە خزمەتی و بە دڵێکی زۆر گەرمەوە سەلامم لێی کرد و دەم و زاری بە چەشنی خونچەی تازە لێك کردەوە و بە ڕوویەکی لەڕادە بەدەر گەش و جوانەوە وەڵامی سەلامەکەمی دایەوە. من لەم کاتەدا هۆنراوەکەم لەلابوو، چوومە بەردەمی پیرۆزی ڕوونیشتم و لە

---

(١) ناوە عەرەبیەکەی بریتیە لە(الكواكب الدرية في مدح خير البرية).

یەکەم دێڕیەوە تا کۆتایی بۆیم خوێندەوە. لەکاتی خوێندنەوەی دێڕەکاندا نێردراوی مەزن هێندەی شیعرەکە لەلا جوان و شیرین بوو جەستەی پیرۆزی خۆی لەگەڵدا بەملاو لادا دەهەژاند. ئینجا دەستی نازك و پیرۆزی بەسەر جەستەمدا هێنا و پەشتەماڵەکەی خۆی لێ وەرپێچام. لەم کاتەدا لە خۆشیاندا خەبەرم بوویەوە و ڕوانیم جەستەم هیچ نەنگی و کەم و کوڕیەکی نەماوە و لە جاران چالاك تر و لەش ساغ ترم. ئینجا لە ئەشکەوتەکە هاتمە دەرێ و ڕێگەی ماڵەوەم گرتە بەر. لەڕێگادا هەمان مرۆڤی عاشق و نوورانی کە پرسیارەکەی لێ کردم و یەکەم جار تووشم بوو دووبارە هاتەوە سەر ڕێگەکەم و هەر منی بینی یەکسەر گوتی:

ئەی موحەممەد چەکامەکەم بدەرێ. منیش گوتم کام چەکامە دەڵێی، خۆ من چەندین چەکامەم هەن. ئەویش گوتی ئەوەیان دەڵێم کە ئیمشەو بۆ نێردراوی مەزنت خوێندەوە و ناوەکەی فلانە و سەرەتای دێڕەکەی بەم شێوازە دەست پێ دەکات. بەو مەرجەی کە ئیمشەو دەتخوێندەوە نێردراوی مەزن هێندەی لەلا شیرین بوو لە چەند دێڕێکدا جەستەی پیرۆزی لەگەڵدا دەلەراندەوە.

پێشەوا بوسیری کە ئەمەی بیست لە شوێنی خۆیدا واق بوو! ئاخر من هەر ئەمشەو ئەو خەوەم بینی و بۆ چ کەسم نەگێڕاوەتەوە! دواتر هیچ کەس ئاگاداری ئەوە نییە کە ئیمشەو ئەو چەکامەیەم لەنێو ئەشکەوتەکەدا نووسیوە و من تەنیا بووم و تازە هاتوومەتە دەرێ!



ئینجا پێشەوا بوسیرِی بە عاشقە نوورانیەکەی گوت هەموو ناونیشانەکەت تەواوە و بەڵێ من ئیمشەو ئەو چەکامەیەم نووسیوە، وەلێ ئەوەندەم پێ بێژە کە تۆ چۆنت ئاگا لەم باسەیە؟ بەڕاستی من سەرم تێدا سوڕماوە!

کابرای عاشق گوتی: دوێنێ شەو بیستم، یانی لە خەودا ئاگادار بووم کە لەلای نێردراوی مەزن ئەم چەکامەیە دەخوێنرایەوە و ئەویش خۆی لەگەڵی دەهەژاند و ئەملاولای بە جەستەی پیرۆزی دەکرد.

پێشەوا بوسیرِی دەفەرموێ کە وای گوت چارەیەکم نەما و چەکامەکەم ڕادەستی کرد و لە سەرەتاوە تا کۆتایی بۆیم خوێندەوە.

ئیدی ئەم باس و خواس و خەوە لەنێو خەڵکیدا بڵاوەی کرد و دەنگی دایەوە و ڕۆژانە خەڵکی دەهاتن بۆ چەکامەکە و بۆ شیفای نەخۆشەکانیان دەیان خوێندەوە و بەکاریان دێنا. دواتر ئەم چەکامەیە لە هەموو جیهاندا بڵاو بوویەوە و ناویان نا (قەسیدەی بوردە)، بوردە یانی پەشتەماڵ، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کە نێردراوی مەزن لە خەوەکەدا پەشتەماڵەکەی خۆی لە پێشەوا بوسیرِی وەرپێچا. لەم ڕۆژەدا تا ئێستاشی لەگەڵ بێ عاشقان لە هەموو کونج و کەلەبەری جیهاندا بە وێنەی لەنگێزە[1] ئەم چەکامەیە دەخوێننەوە و لەگەڵی دەگرین و چەندین بارەی دەکەنەوە و لێی

---

(١) لەنگێزە: بارانی خوڕەمی بەتاو

تێر نابن. لەگشت شار و وڵاتاندا کەسانێکی عاشق مەستی ئەم دێڕانەن و لەگەڵیدا چەشنی لقی دارەکان لەبەر بادا جەستەی خۆیان دەلەرێننەوە و هەڵبەز و دابەز دەکەن. ئەم چەکامەیە بوو بە شەڕابی عاشقان و ڕۆژانە لە هەموو لایەکدا دەیخۆنەوە و مەستی نێو ئەوینی دولبەریان دەبن. هەرچەندی جامەکەیان لێوانلێو دەکەن لەم شەڕابە کەچی هێشتا دڵ و دەروونیان داوای زیاتر و زیاتریان لێ دەکا.

زانایان دەیان شرۆڤە و شیکردنەوەیان بۆ کردووە و چەندین کتێبی قەبە و گەورەیان لەسەری داناوە. ڕەنگە شرۆڤەکانی بگەنە نزیکەی (٢٠٠) دانەش، ئەمە جگە لەوەی بۆ چەندین زمانی جیهان وەرگێڕدراوە.

- زۆر سەیرە! قەت نەمزانیوە چەکامەیەکی هێندە بەرز هەبێ و پێیم نەزانیبێ! باشە مادام شتێکی وا گرنگە چۆن لەنێو خەڵکیدا باسی لێوە ناکرێ، یاخود ڕاگەیاندنەکان بایەخی پێ نادەن؟! چۆن کەسێکی وەکو من کە قوتابی کۆلێژم تا ئێستا نەمزانیوە شتێکی لەم چەشنە بوونی هەیە! ئای خوایە من چەندە غافڵم.

+ کچی خۆم، هەمیشە شتانێکی بێ نرخ لەبەر چاوی خەڵکیدا نرخدار و بە بایەخ دەکرێن، دەبینی ئەم گۆرانی و هۆنراوانەی کە بایەخ بە جەستە و لاشە و شتانێکی ماددی و دوور لە ڕۆح دەدەن، سەرواو کێشێکی لار و لەوێریان هەیە و خاڵین لە مانای



جوان و ڕەوانبێژی، لە ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەکاندا دەنووسرێنەوە و زەق و بەرز دەنرخێنرێن. خەڵکیش هەمیشە لە بازاڕی دینار و دراو و حەز و ئارەزووەکانیانن و ئاگاداری بابەتە ڕۆحیەکان نیین و لێی تێناگەن، بۆیە بەم شتە پڕوپووچانە دادێن و وادەزانن ئەمە گەوهەرە سوورو نایابەکەیە، چون هێشتا نایابەکەیان نەدیووە. ئەگەر بێت و ڕۆژێ لە ڕۆژان نایابەکە ببینن ئەوکات تێدەگەن کە هی ئەوان چشتێکی بێ کەڵکە و بۆ فڕێ دان باشە.

بەڵێ مرۆڤێك کە زێڕی نەدیبێ دەکرێ فێڵی لێ بکرێ و پارچە ئاسنێکی بێ بەهای بە زێڕ نیشان بدەن، وەلێ ئەو دەمەی زێڕەکە دەبینێ تێدەگا کە هی ئەو زێڕ نییە و چەندین ساڵە فێڵی لێ کراوە.

مەحوی مەزن لەم بارەیەوە زۆر جوانی فەرمووە:

ئیمڕۆ لەکن زەمانە هونەر بۆتە قەشمەری

شێری ژیـــانی بۆ چییە مەیمونیە گــەرەك

بەڵێ ئیمڕۆ زەمانە وەهای لێهاتوە تاوەکو مەیموونی هەبێ کاری بەسەر شێردا نییە و نایهەوێ.

- باشە تۆ شتێکت گوت لەلام بوویە گرێ و دەمەوێ دەربارەی بپرسم، ئەها تۆ گوتت خەڵکی تا ئێستاش ئەم چەکامەیە بۆ شیفای نەخۆشی بەکار دێنن، باشە چەکامەیەك توانای هەیە چارەی مرۆڤ بکا؟

+ ئافەرین کچم، پرسیارێکی جوانت وروژاند، بێگومان چەکامەیەکی بێ گیان هیچ دەسەڵاتێکی نییە لە چارەکردنی مرۆڤدا، هەتا ئەگەر گیانیشی هەبێ هەر بێ دەسەڵاتە. دەسەڵات تەنێ دەسەڵاتی حەکیمی مەزنە و هیچ کەسی دی بۆی نییە لە بەرامبەر ئەودا باسی دەسەڵات بکا، وەلێ حەکیمی مەزن هەندێ هۆکاری داناوە کە مرۆڤ دەست بەم هۆکارانەوە بگرێ، وەك چۆن ئەگەر کەسێ نەخۆش بێ دەچێتە لای دکتۆر و بە هۆکاری دکتۆر و حەبەکان حەکیمی مەزن شیفای دەدا، ئەمە مانای وا نییە کە حەبەکان چارەیان کرد، بەڵکو ئەمە تەنێ هۆکارێك بوو. ئەم چەکامەیەش هێندە بە دڵسۆزی و ڕاستگۆییەوە نووسراوە لە ستایشی حەکیمی مەزن و نێردراوەکەیدا ئومێد وایە حەکیمی مەزن بە هۆکاری زۆر خوێندنەوەی ئەم چەکامەیە چارە بۆ مرۆی نەخۆش بنێرێ وەك چۆن بۆ پێشەوا بوسیرِی نارد.

- ئەی باشە دەکرێ کەسێك بگاتە ئەم پلەیە کە هەندێ لە نهێنیەکان بزانێ، بۆ نموونە ئەم پیاوە عاشقە چۆن بە خەوێك ئاوا ئاگادار کرایەوە لەم چەکامەیە؟ ببوورە کە ئەم پرسیارانە دەوروژێنم، بەڕاستی ئەم چشتانە لای من نوێن و بایەخدارن.

+ کچەکەم... ئەو دەمەی مرۆڤ وازی لە ئاکاری ئاژەڵی هێنا و بەدوای سك و دامێنی و ئارەزووە کاتیەکاندا ڕای نەکرد، ئەو دەمەی هەنگاوی نا بەرەو خۆشەویستی حەکیمی مەزن و لە عیشقی دونیایی خۆی وەدوور گرت و تەنێ لە عیشقی ئەودا خۆی

تواندەوە. کاتەکانی بە پەرستش و بیرکردنەوە لە دروستکراو و داهێنانەکانی ئەو پڕکردەوە. ئەو دەمە چەشنی فریشتەیەك حەکیمی مەزن لە ماددە دووری دەخاتەوە و ئاشنای جیهانی ڕۆحی دەکا و بەرز و پاڵفتە دەبێتەوە، ئەوکات نوور بە جەستەیدا پەرش و بڵاو دەکاتەوە و بەهۆی ئەم نوورەوە کە حەکیمی مەزن پێی بەخشیوە شتانێك دەبینێ و دەیان زانێ کە من و تۆ ئاگاداری نیین و سەری لێ دەرناکەین.

- کەواتە من تا ئێستا لەنێو ئەم ئارەزووە ماددیانەم و ئاگاداری ئەو جیهانەی تر نییم، تکایە چۆن یارمەتیم دەدەی بۆ ئەوەی ئاشنای ئەو جیهانە ڕۆحیە بم و وێنەی فڕندەیەك[1] تێیدا بگەڕێم؟

+ پەرستشەکانت بەجێ بێنە و لە ڕێگای خۆشەویستیەوە لەو نزیك بەوە. خۆشەویستی خێراترین ڕێگایە بۆ گەیشتن بەو، هەر ئێستا لەم ژێر زەمینەوە لەگەڵ ئەو بدوێ، دەی هەر ئێستا بدوێ بەر لەوەی کات درەنگ بکەوێ.

نزیکەی نیو کاژێر بێدەنگی باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشا و کەسیان نقەیان نەدەهات، تەنانەت جریوەی پاساریەکیش لەم نێوەدا نەدەبیسترا، لەپڕدا کچەی هەڵاتوو هاتەوە دەنگ.

- بەڕاستی ئێستا هەست بە ئارامیەکی لەڕادە بەدەر دەکەم، بۆچی تا ئێستا نەمدەزانی کە گفتوگۆ لەگەڵ حەکیمی مەزندا

---

(١) فڕندە: باڵندە

هێندە پڕ چێژ و شادومانیە. پێم خۆشە لێرە نەیەمە دەرێ و تا بەیانی لەگەڵی بدوێم و یادی ئەو بکەم. ئاخر من پێشووتریش دەقە ئاینیەکانم دەخوێناوە، لێ تەنێ زارم لەگەڵی دەجوولا و دڵ و ڕۆحم بێ ئاگابوو. ئاخ لەم غافڵیە، بۆچی کەسانێك پێشتر نەبوون ئاشنای ئەم جیهانە ڕۆحیەمان بکەن و دەربارەی ئەم چێژە بۆمان بدوێن، بەڕاستی زۆر درەنگ بەمەمان زانی. مامە گیان، ببوورە مامۆستا، مەراقێك لە دڵمی داوە ڕەنگە پێم پێبکەنی، نازانم چۆن بیڵێم.

+ بێژە کچەکەم بێژە، هەرچی لە دڵت دایە بێژە.

- لەڕاستیدا دەمهەوێ منیش نێردراوی مەزن ببینم، ئاخر بۆچی تەنێ دەبێ هەر بەندە چاکەکان لێی بڕوانن، چی دەبێ ئەگەر جارێك منێکی گوناهباریش سەیرێکی بکەم، توخودا پێم بڵێ چی بکەم؟ دەمهەوێ تەنها جارێك سەرنجی بدەم و هەرچی ئێش و ژانی دڵمە لەیادم بچێتەوە، هەموو ئەو ستەمانەی باوکم و براکانم لێمیان کرد لەیادم بچێتەوە. ئەوسا بشمکوژن باکم نییە. ئەو کاتەی گەڕامەوەش بۆلای حەکیمی مەزن پێی دەڵێم کە ئافرەت لێرە چ ستەمێکیان دەرحەق دەکرێ و چۆن کەسانێك بەبێ ویژدانی عیشق و خۆشەویستی دەکوژن و بنبڕی دەکەن.

+ ئومێدم وایە ببینی کچم ئومێدم وایە، ئێستا واز لە گریان بێنە و با دەست بە ڕۆمانەکەمان بکەینەوە و درەنگ نەکەوین.

- وەلێ تۆ هیچ دێڕێکت لە چەکامەکە بۆ نەخوێندمەوە؟

+ دواتر کچم، گەر حەکیمی مەزن مەیلی لەسەربێ کاتی ئەوەشمان دەبێ.

- زۆر چاکە، بەڕاستی مەراقم کردووە بزانم دوای سوهەیل چی ڕوویدا و حیکمەتخانە بەکوێ گەیشت و هیلال چی لێهات، پریاسکە خانیش لەملاوە بوەستێ. دە بێژە مامۆستا تا بینووسم.

## کچێك لەنێو بێستانی تەماتان

لەگەڵ باوکیدا ببوویە بێستانەوان و خزمەتی شووتی و تەماتە و خەیار و باینجانەکانی دەکرد، لەگەڵ ڕنینی تەماتە و خەیارەکاندا قژە ڕەشە خاوەکەی وەك شەوی تار لەژێر لەچکە پەمەییەکەی کە تەواو توندی نەکردبوو دەهاتە سەر ڕووە مانگەکەی. بە بێزاریەوە بە دەستی چەپی تاڵەکانی لادەبرد و ئارەقەکەی کە چەشنی مرواری و خوناوی سەر گوڵان بوو هەر بە لەچکەکەی دەسڕی. هێندێ جاریش قژەکانی دەکردنە پەلکە تاوەکو نێنەوە سەر چاوی. لەبەر ئەوەی کچە تاقانەی ماڵێ بوو چ برای نەبوو کار بکا ناچار جگە لە کار و کابانی ماڵێ ئەرکی دەرەوەشی لە ئەستۆ گرتبوو.

بەیانیان لەگەڵ دەنگی کەڵەشێر واگا دەهات و بەرەو بێستانەکە وەڕێ دەکەوت بۆ ئاودان و ڕنینی میوەکان و یەك یەك لە سندووق خستنیان هەتا زەردەپەڕی ئێوارە. هەمیشە پەڕۆیەکی سەوزی لەلابوو بەر لەوەی میوەکە بخاتە نێو سندووقەکە بە پەڕۆکە پاکی دەکردەوە، هێندێ جار تەماتەکانی هێندە دەسڕیەوە کە لەوەبوو بتوانێ ڕووی جوانی خۆی لەنێودا بەدی بکا و چەشنی ئاوێنە خۆی لەبەردا ئارایش بدا. ئەو دەمەی ماندوو دەبوو دەچوو لە ناوەڕاستی بێستانەکە لەچکەکەی لادەدا

و قژەکەی کە بە پەڕۆیەکی سووری چەشنی تەماتەکان بەستبوو دەکردەوە و بەشەرمەوە ڕۆدەکەوت و بۆ تاوێ لە دیمەنی ئاسمان ڕادەما. هێندە شەرمن بوو دەم نا دەمێ سەیری چوار دەوری دەکرد نەبادا کەسێ قژەکانی ببینێ.

لە دیمەنی ئاسمانی شیندا وێنای خۆی و ئەو شازادەی دەکرد کە لە خەون و خەیاڵەکانیدا چێی کردبوو. ئاسمانە شینەکە ببوویە دەریایەکی بێ بن و لەگەڵ شازادەدا لە کەنارەکانی گیرسابوونەوە و لەمەڕ داهاتوویان دەدوان و قاچیان بۆ نێو ئاوەکە درێژ کردبوو. دەم نا دەمێك شەپۆلێك بە نەرمی لە قاچەکانیانی دەدا و تەڕو تازەی دەکردنەوە، دەنگی قاقاکانیان لەگەڵ شەپۆلەکاندا ئاوێزان دەبوون و بەرەو ئەو ماسیانە دەچوون کە لە نێوەندی دەریا بێ بنەکەدا بەرەو خۆراك دەگەڕان بۆ بەچکەکانیان.

هەموو جارێ کە لەوێدا پاڵدەکەوت تەماتەیەکی لەگەڵ خۆیدا دەبرد و وردە وردە لەگەڵ خەیاڵەکاندا قەپی لێ دەگرت. هێندێ جاریش لە ماندوویەتیان لێوە سوورە یاقووتیەکەی کە لە خڕی و بچووکیدا چەشنی سەری پیتی میم وەهابوو هیشك دەبوو، وەلێ چون تینی لێ بڕابوو هەر لە جێی خۆیدا تەماتەکەی دەگوشی و ئاوەکەی دەخواردەوە. ددانە سپیەکانی لەنێو ئەم سندووقە سوورەدا وێنەی مرواری گەشاوەی ڕیزکراو شەوقیان دەدایەوە. جار جاریش لەبەر خۆیدا لێوەکانی دەبزواندن و شیعری مام هێمنی دەگوت، هەر دەتگوت شەکر دەڕژێنێ بەسەر



جیهاندا. بازێ جاریش کە لە تێڕامانی ئاسمانەکان دەبوویەوە سەیرێکی نێو تەماتەکەی دەکرد و خوێنی گەش و ئاڵی ئەو کچە کوردانەی تێدا دەدی کە لەسەر هەڵەیەکی بچووکی لاوەتی بەناوی شەرەف ببوونە قوربانی و خوێنیان چەشنی ئاوێکی زەلاڵ و ساف بەنێو دەشت و بێستانەکاندا بڵاوەی کردبوو. بیری لەوەی دەکردەوە کە دەبێ چەند میوەی قەپ لێگیراو هەبووبن بە خوێنی ئەو کچانە ئاودرابن.

هێندێ دەمیش چاوە قاوەییە گەورەکانی کە دەتگوت چاوی مەهان[1] دەنووقاندن و تەماتە سوورەکەی لەسەر هەردوو دەستی دادەنا و وەك بڵێی ئەمە دڵە سوورەکەیەتی و پێشکەشی شازادەکەی دەکا، ئاخر ئەو تەماتانەی کە بە دەستەکانی خۆی ئاوی دابوون و ڕۆژ بە ڕۆژ لە پێگەیشتنیانی دەڕوانی لەلای ئەو چشتانێکی بە بایەخ بوون.

ئەگەر شازادەکە دڵەکەی لێ وەرگرتبا برۆ هیلالیەکانی بەرز دەکردنەوە و چاوەکانی لەژێریدا تیشکیان دەدایەوە لە خۆشیان، هێندێ جاریش لە خەیاڵی خۆیدا شازادە مژوولی کچانی دی بوو، بۆیە دڵەکەی وەرنەدەگرت و لەگەڵ خاتوونێکی دیکەدا بەسواری ئەسپەکەی دەڕۆیی. لەو دەمەدا لە تووڕەییان برۆکانی وێك دێنانەوە و بە تیرە ژەهراویەکانی جەنگێکی سەختی بەرپا

---

(١) مەها: جۆرە ئاسکێکی چاو جوانە.

دەكرد. ئەم تیری موژە[1] و برۆ قەوسانە یەك یەك بەرەو ئاسمان دەڕۆیشتن و هەر خوا دەیزانی دڵی چ بەدبەختێكی پێ دەپێكرا.

دڵارا كچێكی تەواو جوان و سادە بوو، بە چشتێكی بچووك و بووكەڵەیەك دەكرا چێژێكی زۆر وەرگرێ، ئاخر ئەو تەنێ ماڵەوە و بێستانەكەی دیبوو، بۆیە خۆشی و دیمەنێكی بچووك لەلای ئەو چێژێكی بێ ئەندازەیان دەبەخشی.

مام وسوی باوكی پیاوێكی خراپ نەبوو، وەلێ دەربارەی كچان مرۆیەكی تەواو دڵ پیس و ڕەق و لەدوا بوو، تەنانەت بە هاتنی كچێكی هاوڕێی دڵارا قەڵس دەبوو و وایدەزانی ئاكاری كچەكەی تێك دەدا. ئەو لەو مرۆڤانەبوو كە لای وابوو كچ تەنێ ئامێرێكە و دەبێ پیاو خزمەتی خۆی پێ بكا. لای وی وابوو كچ ئەو گوڵەیە كە ئەحمەد هەردی دەیگوت:

كچ لەلای ئێمە گوڵێكە بۆیە پەروەردەی دەكەن
تـــــا بـــــڕازێنێتەوە مـێزی شەڕابی دەوڵەمەن

وەلێ خاتوو ڕەعنای دایكی ژنێكی تا بڵێی بە سۆز و میهرەبان بوو، هەمیشە دەیهەویست كچەكەی فێری چشت بێت و پێ بگا. گەلێ جاران لەسەر دڵارا هەراو گارەگاری لەگەڵ مێردەكەی دەكرد كە زۆری كار پێدەكا و ماندووی دەكا.

---

(١) موژە: برژانگ

خاتوو ڕەعنا چون کاتی خۆی تۆزێکی لای باوکی خوێندبوو ئەو دەمانەی کچەکەی لە کار دەگەڕایەوە دایدەنیشاند و فێری خوێندەواری دەکرد. هەمیشە باسی قوتابخانەی مەزنی حیکمەتی بۆ کچەکەی دەکرد و نزای دەکرد کە یەکێ لە دەرچووانی حیکمەتخانە ببێتە نەسیبی. دڵارا جگە لە بێستانەکە زۆرترین وشە کە درابوویە بەر گوێچکەی حیکمەتخانە بوو. تەنانەت ئەو دەمەی یەکێ لە هاوڕێکانیشی دەهات بابەتی حیکمەتخانەکەی دەکردەوە و دەیهەویست زۆرترین زانیاری لەسەر ئەم قوتابخانەیە وەدەست خا. خەیاڵ و ماخۆلانی ئەم کچە ئەوەبوو ڕۆژێ لە ڕۆژان بچێتە حیکمەتخانە و شان بە شانی کوڕەکان بخوێنێ. ئارەزووی چوونی بۆ ئەوێ موددێکی زۆربوو لە کەڵکەڵەی[1] دابوو. دەیهەویست بە هەر چەشنێ بێ ڕۆژێك خۆی بگەیەنێتە بەرێوەبەر و داوای لێبکا کە کارێك بکا تاوەکو کچانیش مافی خوێندنیان هەبێ. ئاخر بۆچی دەبێ هەر کوڕ بخوێنن و کچ لەم پڕۆسەیە بێ بەش بن. مەگەر ئەمە ستەمێکی گەورە نییە کە لە کچ دەکرێ؟ مەگەر ئەوانیش دروستکراوی حەکیمی مەزن نیین و چەشنی کوڕان مرۆڤ نیین؟ مەگەر سەر بە چینێکی ترن لە گیانداران؟ ئەوە کێ یە ئەوی لە خوێندن بێ بەش کردووە لە کاتێکدا حەکیمی مەزن ڕێزی لێ ناوە و وەکو مرۆڤێك پێی فەرمووە بخوێنە.

---

(١) کەڵکەڵە: خولیا کەوتنە سەر بۆ شتێك.

هەمیشە گوتەکانی دایکی لە هزری خۆیدا وەکو کاسێتێك لێ دەدایەوە کە دەیگوت کچم ئاواتم ئەوەیە ڕۆژێك حیکمەتخانە بۆ کچانیش بکرێتەوە و ببینم کە لەگەڵ کوڕێکی ئەوێدا هاوسەرگیری بکەی. بیری دەکردەوە کە دەبێ کوڕانی ئەوێ چۆن بن کە دایکم هێندە لێیان دەدوێ، ئەوانەی لەوێ دەردەچن دەبێ چ شازادە و بلیمەتێك بن! تۆ بڵێی کەسێك دەرچووی ئەوێ بێ ڕازی بێ بەمن؟ ئاخر بۆ ڕازی نابێ، خۆ هەمیشە دایکم دەڵێ تۆ زۆر زۆر جوانی. ئیدی لەگەڵ ئەو بەیەکەوە دەچینە بێستانی میوەکان و تەماتەکان دەڕنین. هەر لەوێدا ئەو دەمەی ماندوو بووین پاڵی لێ دەدەینەوە و لەبری ڕوانین بەرەو ئاسمانە شینەکە باس لە کتێبەکانی حیکمەت و دەقە ئاینیەکان دەکەین. ئای کە چەند دیمەنێکی دانسقەیە لەگەڵ شازادە لەمەڕ حیکمەت بدوێین. لەگەڵ ئەم خەیاڵانەدا خێرا دەچوویە سەر حەوزە چوارگۆشەکەی نێو حەوشە و لەنێو ئاوەکەدا لە ڕوخسار و زوڵفەکانی خۆی ڕادەما. پەلکەکانی دەگرتن و دانە دانە دەیکردنەوە، دەیهەویست بزانێ هەر بەڕاستی ئەو جوانەیە کە دایکی باسی لێوە دەکا یاخود گوتەکانی دایکی هەر بۆ دڵدانەوەی ئەوە.

دوای کردنەوەی پەلکەکان و تێڕامانی لە ڕوخسار و خاڵە وردیلەکانی کە دەتگوت قەترەی میسکن و ڕژاون بەسەر مانگدا، ڕازی دەبوو بەوەی کە بەڵێ ئەو لە جوانەکانە و دەگەڕایەوە ژووری. چەند جارێك لە هێلینی هاوڕێی باسی کوڕێکی بەرگوێ

کەوتبوو بە ناوی سوهەیل، هەمیشە هێلین دەیگوت ئەو سوهەیلە یەکێکە لە زیرەك و یەکەمەکانی حیکمەتخانە و بە نەسیبی هەر کەس بێ خەنی لەخۆی. تەنانەت جارێ لەگەڵ هێلیندا بەدزی ماڵێ بەرەو سەر کانی چووبوون و لەوێ کوڕێکی لاویان کەوتبوویە بەر چاو و هێلین دەیگوت ئەمە سوهەیلە. لەڕاستیدا هێلینیش سوهەیلی نەدیبوو، تەنێ بە گوێرەی ئەو وەسفانەی بۆی کرابوون ئەم قسەیەی دەکرد. ئیدی لەم کاتەوە ئەو سوهەیلە وەکو فەنتازیایەکی[1] لێ هاتبوو لای دڵارا و گەلێ جار خەیاڵی لەسەر چڕ دەکردەوە و خەوی پێوە دەبینی. بە نهێنی لەنێو دڵە بچووکەکەیدا دایینابوو، ئەگەرچی لەوەش دڵنیابوو کە گەیشتنی بەم کوڕە یەکێکە لە کارە ئەستەمەکان و مەگەر بە پەرجۆیەك ڕوویدا.

ڕۆژێك کە تەنێ باوکی چووبوویە بێستان و دڵارا لەماڵێ بوو هێلین فرسەتی بۆ هێنا و هاتە لای و دەستیان بە قسان کرد.

+ گوێ بگرە دڵارا، ئێمە هەر ئاوات بخوازین بۆ حیکمەتخانە هیچ بە هیچ ناکەین، پێویستە بۆ ئەم مەبەستە کار بکەین و بجوڵێین، ئەینا دەبێ هەر ئاوا بە نەزانی بمێنیتەوە و بەیانیش کوڕێکی نەخوێندەوار دێتە داوات و تا ماوی دەبێ لە بێستان کار بکەی.

---

(١) فەنتازیا: خەیاڵ

- باشە ئێمە چیمان پێ دەکرێ؟ لە ئاوات و نزا زیاتر دەبێ چی بکەین، هەر ناوێرین ئەم باسە لای پیاوان بشکەینەوە، ئەگەر باوکمان ئەمە ببیستێ هەر دەشمان کوژێ کچێ.

+ تۆ تەنها گوێ بۆ من بگرە، من پیلانم هەیە پیلان کچەکە، وادەزانی هەر لەخۆڕا هاتووم، پێویستە ئێمە شۆڕش بەرپا بکەین شۆڕش، ئاوا چاوەڕێ بین کەس هیچمان بۆ ناکا.

- شۆڕش چی یە! ئەم وشە سەیرانە لەکوێ دێنی تۆ؟

+ شۆڕش ئەوەیە دەبێ هەموو ببینە یەك دەست و ڕاپەڕین، ناڕەزایی خۆمان بە پادشا بگەیەنین و وەکو کوڕان داوای مافی خوێندن بکەین.

- بەڵام ئەمە چۆن دەکرێ؟ خۆ ئەگەر تەنیا لە ماڵێ بچینە دەرێ و پێمان بزانن دارکاری دەکرێین، ئیدی کۆببینەوە و بچینە بەردەم کۆشکی پاشا! نا نا ئەمە مەحاڵە، دیارە تۆ سووت لە ڕۆحی خۆت نییە، ئەمەی تۆ دەیڵێی تیاچوونە. مەگەر دەتهەوێ خۆت بە کوشت دەی؟ هەر کوفرە لە شاهێندا کچ باسی ئەم چشتانە بکا.

+ کەواتە تۆ دەتەوێ هەر ئاوا بە نەزانی بمێنیتەوە و پیلانەکەی منت بە دڵ نییە، باشە خودات لەگەڵ، دیارە من هاتوومەتە شوێنێکی هەڵەوە.



- نا نا کچێ ڕاوەستە مەڕۆ، بۆ ئاوا زوو تووڕە بووی، بەخوا من مەبەستم هیچ نەبوو، تەنێ دەمهەویست بڵێم ئەم شۆڕشەی تۆ لێی دەدوێی کارێکی قوڕسە و پێهان ناکرێ. بەیانی بە ناوی بێشەرمی و دەرچوون لە عورف و عادەت لە سێدارەمان دەدەن.

+ تۆ شتێکی گەورەت دەوێ و ناشتەوێ قوربانی بۆ بدەی؟ پێم بڵێ ئەمە دەبێ؟

- باشە من بۆ ئەم ئاواتەم ئامادەم قوربانی بدەم و بە قسەت دەکەم، هەرچەندە دەشزانم یەکەم کەس باوکم دەمکوژێ و کپم دەکاتەوە، وەلێ پشت بە حەکیمی مەزن کۆڵ نادەم لە ئامانجەکەم.

+ زۆرچاکە، سەیرکە بزانە چی دەڵێم دڵارا، ئێمە ئێستا دوو کەسین، من لەمڕۆوە هاوڕێیانی تریش بەم باسە ئاگادار دەکەمەوە و ژمارەمان زۆر دەبێ، ئینجا هەر یەکێك لەم هاوڕێیانەم هاوڕێکانی خۆیان ئاگادار دەکەنەوە، تاوەکو وای لێدێ هیچ کچێك لە شاهێن نامێنێ ئەم باسەی پێ نەگا و دەبینە هەزاران کەس. کاتێك ژمارەمان بووە هەزاران ڕۆژێك تەرخان دەکەین و هەموو تێکڕا ڕادەپەڕین و دەچینە بەردەم کۆشکی پادشا. ئەو دەمە هیچ کەس ئەم بوێریەی نابێ شەڕ لەگەڵ هەزاران کچ بکا و بیان کوژێ. دەبێ هەموو بزانن کە ئەمە بێ شەڕەفی و بێ ڕەوشتی نییە، بەڵکو تەنها مافێکی سەرەتایی خۆمانە داوای دەکەین.



- وااای کچێ، ئەم پیلانە دۆزەخیەت چۆن داناوە، وا هەموو گیانم لەگەڵی دەلەرزێ! ئەمە بوێریەکی زۆر زۆری دەوێ. چەند سەیرە کە بیر دەکەمەوە کچان بچنە سەر ڕێگا و بەردەم کۆشك، دەبێ چ هەستێك بێ! بەخوا زۆر زۆریش دەترسم ها.

لەو دەمەدا خاتوو ڕەعنا گوێی ڕادێرابوو بۆ باسەکە و لەپڕدا وەژووری کەوت و گوتی:

ئەوە چی دەڵێن نەقۆراینە[١]، دەنگتان هێواش بکەنەوە کچێ دیواریش گوێی هەیە. بەو خوایە دڵارا بابت لەپڕدا بێتەوە و گوێبیستی شتێکی وابێ نەك تۆ منیش فەلاقە دەکرێم. پیلانەکەتان زۆر تۆکمە و باشە، من تا سەر ئێسقان لەگەڵتانم کچینە، ئەوە یەکێکە لە ئاواتە بەدی نەهاتوەکانی من، نامەوێ کچەکەشم وەکو من نەشارەزابێ، وەلێ ئاگاداری خۆتان بن و تا ڕۆژی خۆی دێ چ کەس لە پیاو و ژنانی شاهێن پێتان نەزانن.

هێلین لێی وەرگرتەوە: ئەی خوا ماڵت ئاواکا پوورە ڕەعنا، خۆ خەریك بوو ڕۆحم دەربێ لە سینەم و گوتم ئێستا ئاشکرامان دەکا، باشە باشە تۆش هەر لە خۆمانی. هیچ خەمت نەبێ پووری، بە چاوەکانی خۆت دەبینی چۆن کچەکەت دەنێرمە حیکمەتخانە.

---

(١) لە شێوەزاری هەولێرێ ئەگەر کەسێك زۆر زان و بەفێڵ بێ پێی دەڵێن کەسێکی نەقۆرایە.

لەم قســـانە دابوون لەنكاو لە دەرگـــا درا و پوورە ڕەعـنا بە پەشۆكاويەوە گوتی:

كچێ هێلین هەڵسە خۆت لە پشتی دەرگاكە بشارەوە، بەو خوایە وسو هاتەوە، ئێستا تۆ لێرە ببینێ دەست دەكاتە گارەگار.

هێلین خێرا خۆی لە پشتی دەرگاكە نا تاوەكو مام وسو هاتەوە ژووری و لە ژوورەكەی تەنیشتیدا ڕاكشا. لەنكاوێك وەكو سوسكەی دەرپەڕیە دەرێ و خشەی لێوە هات. مام وسو وایزانی خشە خشی پشیلەیە و گوتی: پەكوو پشیلەی چەقاوەسوو لە دورِ ژووریێش وازمان لێ نایینی.

ئیدی كچەكان دەستیان بە جێبەجێ كردنی پیلانەكەیان كرد و وردە وردە ئەو كاتانەی بۆیان هەڵكەوتبا و بابیان لە ماڵێ نەبا ڕەگەڵ یەك دەكەوتن و كچانی شاهێنیان لەم باسە ئاگادار دەكردەوە. هەردوو ببوونە سەردەستەی كچان و بەهەر كچێ دەگەیشتن لەسەریان دادەنا كە ئەویش لای كەم هەواڵ بداتە دە كچی دیكە. وردە وردە ژمارەیان لە زیادبوون دابوو، ئەمەش دڵارای جوانی تەواو دڵخۆش كردبوو.

مام وسو ئەو ڕۆژەی كاری لە بێستانەكە نەبا دەستی دەكردە تۆڕەكەی و دەچوویە ڕاوە ماسی و زۆری حەز لە گۆشتی ماسی بوو. بەیانیەك كە زانی كاری بێستانی نییە نەیویست ئاوا لەماڵ ڕووبنیشێ و وەكو جاران قولابەكەی خستە سەر

شانی و گوشەکەی وەدەست گرت و بەرەو ڕووباری ماسیەکان وەڕێ کەوت. لە لێواری ڕووبارەکە ڕوونیشت و قولابەکەی خستە نێوی و گوشەکەی لە تەنیشتە خۆی دانا و چاوەنووڕی پێوەبوونی ماسیەکی گەورە بوو. ئەو ڕۆژە پێچەوانەی ڕۆژانی دی نزیکەی کاژێرێك لەوێ مایەوە و هیچ ماسیەك بە قولابەکەی وەنەبوو. بەتەواوی سەری سوڕمابوو، هەستی بە بێتاقەتی و جاڕس[1] بوونێکی ئێجگار زۆر دەکرد. ئاخر جاران هەر ئەوەندەی قولابەکەی دەخستە نێو ئاو چەند خولەکێکی نەدەبرد خێرا ماسیەك پێیەوە دەبوو، تۆ بڵێی ئەم جارە چی ڕوویدابێ و ماسیەکان بەرەو کوێ کۆچیان کردبێ! لەنکاو لە وەڕەزیان قولابەکەی دەرێنا و حەزی چوویە مەلەکردن لەنێو ڕووبارەکە. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و جلەکانی سەرەوەی داکەند و چەند هەنگاوێك لە ڕووبارەکە دوور کەوتەوە و بە ڕاکردنەوە بازێکی بەهێزی بۆ نێو ئاوەکە دا و شرپەی لێوە هات، لێ هەر ئەوەندەی خۆی خستە نێو ئاوە ساردەکەوە دەنگی چەند کەسێکی ژنەوت کە بە خێرایی بەرەو ئەوێ دەهاتن.

سەری خۆی دەرێنا و ڕوانی وا کەسێك بە جلی خوێنینەوە بەرەو ڕۆخی ڕووبارەکە دێ و دوو پیاویش لەدوایەوەن. مام وسو لەو دەمەدا ترسێکی زۆری لێ نیشت، خێرا تاوەکو ئەوان نەیبینن سەری خۆی خستەوە ژێر ئاوەکە و لەوێ خۆی حەشاردا.

---

(١) جاڕس: وەڕس

دوای کەمێ لە تێپەڕبوونی کات سەیری کرد جەستەیەکی خوێناوی فڕێ درایە نێو ئاوەکە و دوو پیاوەکە دەنگیان بڕا. هەر لەدوای ڕۆیشتنی دوو پیاوەکە مام وسو خێرا بە ترسەوە خۆی گەیاندە جەستە خوێناویەکە و لەنێو ئاوەکە دەری هێنا. لە کەناری ڕووبارەکە درێژی کرد و دەستی لەسەر دڵ و لاملی دانا و بۆی دەرکەوت کە هێشتا زیندووە. لە ترساندا ناوە ناوە ئاوڕی دەدایەوە نەبادا کەسێ ببینێ و وابزانێ ئەو بکوژەکەیە. چەند جارێك ویستی لەوێ جێی بێڵێ و خۆی تووشی کێشە نەکات، چون دەترسا دوژمنەکانی بێنەوە و ئەویش بە دەردی ئەم بەرن، وەلێ ویژدانی ئەمەی نەویست و خێرا جلەکانی کردەوە بەر و جەستەی لاوەکەی خستە سەر شانی و قولاب و گوشەکەی لەوێدا لەیاد کرد.

دوای تۆزێ ڕۆیشتن هاتە خەیاڵی کە ئەگەر ئەم جەستە خوێناویە بەرمەوە و کەسانێك لە ڕێگادا بمبینن ڕەنگە کێشەم بۆ چێ بکەن. لەپڕدا لەبەر خۆیەوە گوتی: بەڕاست خۆ من گوشێکی گەورەم لابوو، ڕەنگە جەستەی ئەم لاوە لەنێو گوشەکەدا جێی ببێتەوە. خێرا گەڕایەوە دەو ڕووبارەکە و جەستە خوێناویەکەی خستە نێو گوش و لەپشتی خۆی هەڵیدا.

مام وسو خۆی و جەستەیەکی خوێناوی بێ جووڵە بە پەنا و پەسیواندا بە ترس و لەرز چوویەوە ماڵێ و نەیهێشت کەس پێی بزانێ.



ئەو دەمەی گەیشتەوە گوشەکەی لە نێوەڕاستی حەوشەکە دانا و خێرا پوورە ڕەعنا و دڵارا هاتن تاوەکو ماسیەکانی لەگەڵ دەربێنن. وەلێ کە ڕوانیان مام وسو ڕەنگی گۆڕاوە و وەکو چۆلەکەی بەر بارانێ دەلەرزێ خێرا پوورە ڕەعنا هاتە دەنگ:

ئەوە چی بووە پیاوەکە! بۆچی ئاوا ڕەنگت پەڕیوە و بۆ ماسیەکان دەرناهێنی؟!

مام وسو لە پەشۆکاویان نەیدەزانی چ بێژێ، لەنکاو گوشەکە بەربوویەوە و سەری خوێناوی پیاوێکی لەنێودا دەرکەوت و پوورە ڕەعنا و دڵارا لە هارژنێیان دا[1].

کابرا خێرا هەردووکی بێدەنگ کردن و بردنیە ژووریێ و پوورە ڕەعنا لەتاوان لەخۆی دەدا و دەیگوت وسو ئەمە چی یە ئەم مەیتەت هێناوەتەوە، ئەی هاوار خۆ شەڕێك شتێکت نەکردووە؟ مام وسو تا تێی گەیاندن کە ئەمەم لەنێو ڕووبارەکە هەڵگرتۆتەوە و کێشەم لەگەڵ چ کەسدا نەکردووە گەرووی وشکی کرد. خێرا چوو جەستەکەی دەرێنا و لە حەوشەکەدا ڕایکشاند، دواتر بە چەند پەڕۆیەك خوێنەکانی بۆ سڕی و شوێنە شکاوەکانی سەری بە لەفاف بۆ بەست و لە ژوورێدا لەسەر جێگاکەی خۆی درێژی کرد. بە خێزانەکەی گوت کە هیچ نەڵێن و ئاسایی ڕەفتار بکەن تا دەچم ڕەقیبی هاوڕێم دێنم کە کاری دکتۆری و برین پێچی دەکا.

---

(١) هارژن: هاوار، لە هارژنیان دا: هاواریان کرد.

مەڕۆنە ژوورەکەی ئەو و لە ژوورەکەی تر ڕووبنیشن، گەر هەر کەسیش لە دەرگای دا مەیکەنەوە. هێندەی پێنەچوو مام وسو دکتۆری لەگەڵ خۆی هێنا و دەستیان بە تیمارکردنی لاوەکە کرد.

دکتۆر برینەکانی بۆ پاك کردەوە و مەڵهەمی لێدا و هەرچی چارەسەری پێویستی بوو بۆی ئەنجام دا و گوتی: وسو گیان گوێ بگرە، یەکەم من ئەمەم لەبەر خاتری مرۆڤایەتی کرد دەنا نازانم ئەم لاوە کێ یە و کێ وای بەسەر هێناوە، دووەمیش چون تۆ هاوڕێی کۆنی منی و ڕێزێکی زۆرت لەلام هەیە، دەنا ناچمە ماڵی کەسێك کە نەزانم بۆچی وای بەسەر هاتووە و دوژمنداری لەگەڵ کێ هەیە، چون لەوەیە تووشی کێشەی بم. ئەمە ئازارێکی زۆری پێ گەییوە و هەناسەدانیشی تۆزێ زەحمەت بۆ دەدرێ، ناڵێم دەمرێ و ناشڵێم دەمێنێ. ئەوەی پێویستی بێ بۆم کردووە و ئەم دوو سێ دەرمانەش بگرە و ئێستا پێت دەڵێم ڕۆژانە چۆن پێی بدە ئەگەر ما و نەمرد. ئیدی کاری من تەواو بوو، ئینشاڵا یەك دوو ڕۆژی دیش دێم سەری لێ دەدەم لەبەر خاتری تۆ.

دوای ڕوونکردنەوەی بەکار هێنانی دەرمانەکان دکتۆر ڕۆیشت و ئەوانیش هەرسێ بە غەمباری و ترسەوە لەدیار نەخۆشەکە ڕوونیشتبوون.

مام وسو گوتی: با ئەو لەم ژوورەبێ تا چاك دەبێتەوە، ئەم چەند ڕۆژە منیش لە ژوورەکەی ئێوە دەخەوم. ئەم کارەم لەبەر

حەكیمی مەزن كردووە بەڵكو بەم هۆكارەوە لە هەڵەكانمان ببووریٚ و بتوانین ژیانی كەسێك ڕزگار بكەین.

گوێ بدە من دڵارا، تۆ بۆت نییە بچیتە ژووری ئەم كوڕە هەتا لێرەبێ، تۆش ئافرەت مەگەر من لەماڵ نەبم و شتێكی نەخوازراو ڕوویدا دەنا مەچووە ژوورەكەی ئەو. ئێستا بڕۆ هەندێ شیر بكوڵێنە با شتێك بچێتە گەدەیەوە بەڵكو بەهۆش خۆی بێتەوە. بزانە چشت لێناوە نانێكمان بدێ و با تۆزێك پاڵكەوم. دوای هێنانی شیرەكە مام وسو چوویە ژووریٚ و زاری لاوەكەی لێك كردەوە و وردە وردە شیری پێدەدا تاوەكو گڵاسەكەی بەتاڵ كرد، دواتر خاتوو ڕەعنا خواردنی دانا و چەند پارە نانێكیان خوارد و لەنكاو لەدەرگا درا و هەموو ئەترەشیان[١] چوو. مام وسو بە ترسەوە بەرەو دەرگاكە ڕۆیی، ئەو دەمەی ڕوانی یەكێك لە هاوەڵەكانی خۆیەتی ڕۆحی بەبەردا هاتەوە. میوانەكە مام خدر بوو، ئەویش لە ماڵ و منداڵی وەڕەز ببوو، بەم نیوەڕۆیە هاتبوو تا وسو پیاسەیەكی بێستانی پێ بكا. دیاربوو كە تێریشی خواردبوو. وسو لەم حاڵەتەدا خوا خوای بوو لەماڵێ دەرنەچێ، وەلێ مام خدر لێی نەگەڕا و تووشی كرد.

هەر ئەوەندەی مام وسو چوویە دەرێ خێرا هێلین تەقەی لە دەرگاكە هێنا، دیاربوو لە پەنجەرەی ماڵی خۆیان تاقیبی كردبوو

---

(١) ئەترەش: زراو

هەتا مام وسو دەڕوا. دڵارا چون لە دەرگا دانی هێلینی دەناسی بە پەلە لێی کردەوە و هێنایە ژوورێ.

- دڵارا گیانەکەم هەواڵی خۆشم لایە، کچێ هەروا ژمارەمان زیاد دەبێ، ئاوا بڕوا ئەم شارە دەهەژێنین خەنی لە خۆمان. با بچینە ژووری ئەودیو دانیشین ئینجا پێت دەڵێم چەند کەسمان بۆ زیاد بووە. ئەوە چی یە دەڵێی زۆر تەواو نی کچێ، ڕەنگت بۆ وا زەرد بووە؟

+ کچێ هێلین ڕاوەستە ئەو ژوورە گیراوە، کەسێك لە ماڵمانە.

- میوانتان هەیە! چۆن من لە پەنجەرەکە نەمدیوە؟!

+ کوڕە گەنجێکە نایناسم کێ یە، باوکم بە برینداری لەنێو ڕووبارەکە هەڵی گرتبوویەوە و لە خێری خۆی هێناویەتیەوە تا چاك دەبێتەوە. کچێ بە کەس نەڵێی ها، وای دانێ هەر نەتبیستووە. بەخوا تۆ نەبای دایکم نەیدەهێشت دەرگا لەکەس بکەمەوە چون زۆر دەترسین، وەلێ تۆش هەر هی خۆمانی.

- ئای ئای دڵارا، کوڕی گەنجتان هێناوەتەوە! لەکۆتاییدا باوکت هاوسەرێکی بۆ دۆزیەوە، وەڵا ئافەرین مام وسو چ باوکێکی.

+ کچێ کچێ وس با دایکم نەیبیستێ بۆ وا حەیابەری، خەریکە دراوسێکان تێگەیەنی، کوڕەی غەریب بەس هەناسەی ماوە و چاوەڕێی مردنە کردتە زاوا.

لەپڕدا خاتوو ڕەعنا لەژووریَ هاواری کرد: کچم نەچنە ژووری ئەودیو، هەر لە حەوشەکە ڕووبنیشن.

دڵارا بە دەنگێکی بەرز: بەسەرچاو دایە هەر وامان کردووە خەمت نەبیَ.

هێلین هاتەوە دەنگ: ئیَ دڵارا، باشە دەبیَ کیَ ئەم کوڕەی بریندار کردبیَ و دەنێو ڕووباری خستبیَ؟ ئەدی باشە مام وسو لەو دەمە چی دەکرد لەویَ؟

+ چووزانم کیَ وای لێکردووە کچیَ هێندە بە پرسیاری، فەقیرەی حاڵی زۆر خراپە. باوکم ئەو دەمە بۆ ڕاوە ماسی چووبوو. زۆر دەترسم بمریَ یان بە هۆیەوە تووشی کێشەیەك بین، ئەگەر دەتدیت جەستەی لە خوێن گەوزابوو، وەڵا من و دایکم هەر نەمان وێرا سەیری بکەین، ئێستاش وا دەلەرزم لە ترسان.

- دڵارا دەزانی چی یە، بەخوای من ئەم کوڕە نەبینم ناحەوێمەوە، هەستە لە پەنجەرەکەوە سەیری بکەین.

+ ئەریَ دە دانیشە با دوو قسەی خۆش بکەین، وەڵا من بە برین و شت تێك دەچم.

هێلین دەستی گرت و بە پێکەنینەوە گوتی: کا وەرە، بەخوای لەگەڵم دێی، چەند ساڵە بە دڵی خۆم سەیری کوڕێکم نەکردووە.

هەردوو لە پەنجەرەکەوە تێی ڕامابوون و لەنکاو هێلین هاتەوە دەنگ: کچێ دڵارا وەڵاهی من لە جوانی و چشت دەزانم، هەرچەندە سەری لەفافی پێوەیە و باش دیار نییە، بەس لەوە دەچێ لە گەنجە زۆر قۆزەکان بێ.

دڵارا بە خەندەوە: کچێ تۆ زۆر بێ شەرم بووی ها، هەر ڕۆژێکە ئەم شۆخی و شتە سەرت بە قوڕدا دەبا، کوڕە وا نیوە مردی بووە باسی چم بۆ دەکا.

- ئێ کچێ وەڵاهی تۆ لە هیچ نازانی هێندە نابەڵەدی[1]، ئەمڕۆ وایە و بەیانی هەڵدەستێتەوە، ئەها ئەو دەمەی چاوی کردەوە هەوڵدە خۆتی لێ نزیك کەیتەوە، با لە یەکەم چاو کردنەوەی تۆ ببینێ، ئێ دە تۆزێ ڕۆمانسی بە و هەندێك لە بازاڕی تەماتە و باینجان وەرە دەرێ. کچێ ڕسقێکت بۆ هاتووە ڕسق با لە دەستت نەچێ بۆ وا غەریبی.

+ ئەی هاوار شتەکەت چەند گەورە کردووە، تخوا ئەمە ڕۆمانسی بوونی دەوێ؟ چما بابم ببینێ بەس بچمە ژوورەکەی نامکوژێ.

- دەزانی چی یە دڵارا، بیر لە شتێك دەکەمەوە بەس پێنەکەنی ها کچێ.

---

(١) نابەڵەدی: نەشارەزایی

دڵارا بە پێکەنینەوە: ئێ دە بڵێ پێ ناکەنم، بەخوا دەشزانم لە قسەکانی دیت بێ سەر و بەر ترە.

+ تەماشای تەماشای جا وەرە قسەی بۆ بکە، کچێ دەزانی چی یە، وا بیر دەکەمەوە چۆن دەرگایەکمان لێ ناکرێتەوە و ئەم کوڕە شازادەیەك شتێك دەرچێ، بەخوا پارووەمان دەکەوێتە ڕوونی، ئەها وەکو ئەوەی چیرۆك و فیلمەکان دەڵێم.

- هاهاها، وەڵاهی هێلین بیرت بۆ شتی سەیر دەڕوا، وەلێ من نامەوێ شازادە بێ، هیوادارم قوتابیەکی حیکمەتخانە بێ.

+ ئەی هاوار چەند سادەلۆحی[1]، من باسی شازادەت بۆ دەکەم تۆ دەڵێی حیکمەتخانە، کچێ ئەگەر شازادە بێ هەزار حیکمەتخانەت بۆ دەکڕێ.

لەو قسانەدا بوون لەنکاو کوڕەی لاو لەژوورێدا دەستی بە کۆکین کرد و هەردوو لە ترساندا ڕاپەڕین و هەڵاتن بۆ نێوەڕاستی حەوشەکە. دواتر بە سەرسامی و خەندەوە لە یەکیان ڕوانی و هێلین گوتی:

- کچێ دڵارا هەر بەڕاست ئەمە زیندوو بوویەوە! خۆ خەریك بوو زراومان بچێ، چم گوت من ها چم گوت، گاڵتەت پێم دەهات کە دەمگوت هەڵدەستێتەوە، ئەوە هەڵسایەوە.

---

(١) سادەلۆح: سادە و بێ هۆش

+ ڕاوەستە دایكم ئاگادار كەمەوە كچێ، كەمێك دەنگت نزم كەرەوە خۆ منیش نەمگوتوە مردووە، وەڵا ئەتۆ زەندەقی منیشت برد وەها ڕاپەڕی هەی زراوت بچێ.

دڵارا خێرا چوویە ژووریێ و دایكی لە واگاهاتنی نەخۆشەكە ئاگادار كردەوە. خاتوو ڕەعنا كە ئەمەی زانی خێرا چوویە لای كوڕە و ڕوانی چاوەكانی كردوونەتەوە، وەلێ لەبەر ئازار تواناى قسەی نییە و تەنێ ناڵە ناڵێكی كزی لێوەدێ.

خاتوو ڕەعنا بەزوویی تۆزێك ئاوی لەنێو كوپێكدا بەسەر زاری وەكرد تاوەكو لێوەكانی تەڕ ببنەوە، ئەو دەمەی زانی نەخۆشەكە سەراسیمەیە لەوەی ئێرە كوێ یە و لە ماڵی كێ دایە خێرا بۆی كەوتە قسە: هیچ مەترسە كوڕەكەم، دیاربوو چەند كەسێك ئازاریان پێ گەیاندبووی، پیاوەكەم پێش نیوەڕۆ تۆی هێنایەوە ئێرە و چارەسەری پێویستمان بۆ وەرگرتووی، ئینشاڵا بە زووترین كات چاك دەبیەوە و دەچیەوە ماڵی خۆت، ئێستا هەوڵدە جووڵە نەكەی و پشوو بدە، ئەوە من دەچم شۆربایەكت بۆ چێكەم.

ئەو دەمەی خاتوو ڕەعنا ئەم قسانەی بۆ لاوەكە دەكرد هێلین لە پەنجەرەكەوە سەیریانی دەكرد و لەبەر خۆیەوە دەیگوت: چێیكە چێیكە، ئێ بابە بۆ چێی ناكەی، زاوای داهاتووتە.

دوو ڕۆژبوو ئەم لاوە لە ماڵی مام وسودا چارەسەر دەكرا، دكتۆر ڕەقیب دەهات و دەرمانی پێویستی پێ دەدا، خاتوو ڕەعناش زوو

زوو شۆربای بۆ لێدەنا و وردە وردە حاڵی بەرەو باشتر دەچوو، وەلێ هێشتا توانای هەڵسانەوە و گۆکردنی نەبوو بەتەواوی. گەلێ جار مام وسو دەیهەویست بیدوێنێ و بزانێ چ کەسە، لێ هەر ئەوەندەی دەیویست یەك دوو وشە بێژێ خێرا ماندوو دەبوو.

ڕۆژی سێهەم مام وسو بەیانیەکەی زوو بەرەو شینایییەکە ڕۆیی و لەبەر ئەوەی کاری کەم بوو ئەم چەند ڕۆژە دڵارای نەدەبرد، لێ هەمیشە وەکو ڕۆژان خاتوو ڕەعنای ئاگادار دەکردەوە کە نەهێڵێ کچە بەرەو ژووری نەخۆشەکە بڕوا.

دڵارا زۆری سك بەم لاوە دەسووتا، بە تایبەتی کە بازێ جار لە پەنجەرەکە دەیدی باوکی چەند کەوچکێك لە شۆربای پێدەدا، چون هێز لە دەستەکانی بڕابوو و نەیدەتوانی خۆی بیخوا.

ئەو ڕۆژە چوویە بەر پەنجەرەکە و بۆ تاوێ لە لاوەکە ڕاما، ئەو دەمەی ڕوانی وا لاوەکەش سەری بۆ لای وی دەسووڕێنێ خێرا دڵارا سەری خۆی داگرت و شەرمی لەخۆی کردەوە و ڕۆیشتەوە لای دایکی. لەو کاتەدا خاتوو ڕەعنا گوتی:

کچم ئادەی بڕۆ بزانە کراسە شینەکەم لەودیو نییە، پێم وابێ ئەو دەمەی شۆریم لەسەر مێزە سپیەکەم دانا.

- ئێ دایە باوکم نەیگوت نەچیتە ئەوێ؟

+ چ نییە نا کچم خۆ ناتخوا، کوڕە لەسەر جێگایە و نەساغە، بڕۆ بۆم بێنە و خێرا وەرەوە، من وا کەوتووم لەگەڵ ئیشی ماڵێ.

دڵارا بە ئەسپایی دەرگاکەی واڵاکرد، خێرا بێ ئەوەی سەیری لاوەکە بکا بەرەو لای مێزە سپیەکە هەنگاوی نا و کراسە شینەکەی دەست کردێ، ویستی بڕوا لەدواوە دەنگێکی کزی ژنەوت کە گوتی: ناوت دڵارایە؟

دڵارا لەگەڵ ئاوڕی دایەوە هەموو گیانی کەوتە لەرزە و ئارەقەی پێدا هاتە خوارێ لە شەرمان، بۆ تاوێ لە شوێنی خۆی وەستا و کەمێ بەسەر شەرمەکەیدا زاڵ بوو، دواتر سەری داخست و گوتی: بەڵێ ئەوە ناوی منە.

+ ناوێکی جوانە، هیوای سەرکەوتنت بۆ دەخوازم دڵارا، ئەوەی ئێوە لەگەڵتان کردم هەرگیز مزدەکەی[١] نادرێتەوە.

دڵارا کە زانی لاوەکە بەزۆر قسە دەکا و ئازاری هەیە بە شەرمەوە گوتی: نا نا ئەوە ئەرکێکی مرۆڤانەیە، تکایە ئێوە پشوو بدەن با ئازارتان پێ نەگا، دواتر ئەم هەواڵە خۆشە بە باوکم دەگەیەنم کە تۆ هاتوویتە گۆ.

خێرا کچە بەرەو دەرگاکە چوو، هەستی دەکرد تەواو سوور بۆتەوە، وەلێ هەر ئەوەندەی پێی لە ناوەڕاستی دەرگاکە دانا

---

(١) مزد: پاداشت

لاوەکە هاتەوە گۆ: ئێوە چەند ڕۆژە بە نەخۆشەکە بانگم دەکەن، لەڕاستیدا ناوم سوهەیلە.

دڵارا لەگەڵ ناوی سوهەیلی بیست کراسەکەی لە دەستی کەوتە خوارێ و بە سەرسامیەوە ئاوڕی دایەوە. بۆ تاوێ بیر و هۆشی لەسەردا نەما و لەنێو دەرگاکەدا ڕەق ڕاوەستا.

دواتر لەبەر خۆیەوە گوتی سوهەیل! وەك ئەوەی ڕووی لە کوڕە نەبێ و لەگەڵ خۆیدا قسان بکا.

سوهەیل بە ناڕەحەتیەوە: بەڵێ سوهەیل، دەڵێی سەیرت لە ناوەکەم دێ؟ لەمەوبەر نەتبیستووە؟

کچە بە سەرسامیەوە: بەڵێ بیستوومە بەڵێ، ناوەکەت لە ناوی کەسێکی ئاشنا دەکا ببوورە.

دڵارا بۆ تاوێ لە جێگاکەی خۆیدا وەستا و هیچی تری نەگوت، دواتر زۆری لەخۆی کرد و بە شەرم و پەشۆکاویەوە هاتەوە قسە: ببوورن بەڕێز، دەکرێ بپرسم کە ئێوە چ کارەن؟ پێدەچێ مرۆیەکی خوێنەواربن بۆیە وا دەڵێم.

سوهەیل هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: بەڵێ خوێنەوارم، لە قوتابخانەی مەزنی حیکمەت دەخوێنم.

لەگەڵ ئەم قسەیەدا دڵارا لە شوێنی خۆیدا هۆشی فڕی و بەڕوودا کەوتە خوارێ. خاتوو ڕەعنا کە گوێی لە گرمە بوو خێرا

ڕای کرد و ڕوانی کچە لەوێدا کەوتووە و خوێن لە گەردەنیدا جاری دەبێ. بە پەشۆکاویەوە ڕوونیشت و سەری دڵارای لەسەر ڕانی خۆی دانا و بە پەڕۆیەکی سپی کە لەوێدا کەوتبوو گەردنی کچەی گرت و دەستی بە گریان کرد لەسەری.

+ ئەی هاوار کچم چیت بەسەرهات، بۆ وا کەوتی ڕۆڵە جوانەکەم، هەڵسەوە دایکت قوربانت بێ هەڵسەوە.

ئەمجا بە شێواویەوە چوو کوپێك ئاوی هێنا و بە دەستەکانی دەیپژاندە دەموچاوی تاوەکو کچە خەبەری بوویەوە. سوهەیلیش پێیاندا واقی وڕ مابوو، ئەویش نەیدەزانی چ باسە و کچە بۆ وا بە یەك دوو قسە کەوتە خوارێ، بۆیە نقەی لێوە نەدەهات و تەنێ سەیریانی دەکرد.

خاتوو ڕەعنا دڵارای هەڵساندەوە و بردیەوە ژوورەکەی خۆیان، چەندی هۆکاری کەوتنەکەی لێ پرسی دڵارا هەر دەیگوت خۆشم نازانم بۆ وا لەپڕدا سەرم سووڕا.

هێندەی پێنەچوو دووبارە هێلین لە دەرگای دایەوە، ئەمجارە خاتوو ڕەعنا خۆی چوو دەرگاکەی کردەوە. هەر ئەوەندەی دەرگای واڵاکرد بەبێ چاك و چۆنی هێلین کەوتە گۆ:

ئەوە چی یە پووریێ، مەگەر دڵارا لەماڵ نییە! چۆن تۆ دەرگات کردەوە؟!

+بەرێ وەڵا کچم لەماڵە، وەلێ تۆزێ نەساغە و کەمێ لەمەوبەر بەڕوودا بەربوویەوە و چەناگەی شکاوە.

- ئەی هاوار ئەمە بۆ وای لێهات فەقیرەی؟ لە نەخۆشێکتان کەم نەبوو بوویە دوو، ئاوا بڕوا دەبێ نەخۆشخانە بکەیتەوە پووری.

+ دە وەرە ژووری کچێ تۆ هەر لەسەر بەزمی خۆتی، وڵات ئاو بیبا تەقەی سەرت دێ، وەرە بەڵکو تۆ لەلای ڕوونیشی من خەریکی چێشت لێنان دەبم.

هێلین چوویە ژووری و ڕوانی دڵارا پەڕۆیەکی بە چەناگەیەوە گرتووە و پاڵی داوەتەوە، خێرا چووە لای و گوتی: ئەوە چی بووە گیانەکەم؟ دایکت دەڵێ بەربوویەوە خێرە؟ نەکا لە ڕوانینی ئەم لاوەدا هۆشت لای خۆ نەمابێ، کچێ شەرمەزارمان نەکەی.

+ ڕاوەستە هێلین هێشتا نەهاتوومەوە سەرخۆ، ئای من چەند بە بەختم خوایە، بڕوا ناکەی چی ڕوویداوە، بڕوا ناکەی!

- ئێ دە چی بووە دڵم تەقی دە بڵێ.

+ کچێ قسەم لەگەڵ سوهەیل کرد سوهەیل.

- کام سوهەیل؟ ئەوەی حیکمەتخانە دەڵێی؟

+ بۆ مەگەر سوهەیلی دیکە هەیە ئێمە بیناسین؟



- ئەی ئەی، کچێ مەکربازی بەربێژ[١] چۆنت قسە لەگەڵ سوهەیلی کردووە و من نەمزانیوە، ئاخر لە کوێ سوهەیلت دیت؟ تۆ هەر لە ماڵێ نەچوویتە دەرێ!

+ سوێندت بۆ دەخۆم کردم، ئەی خوایە هێشتا بڕوا ناکەم، ئەوەی بە خەونم دانابوو چۆن بوویە ڕاستی!

- ئەرێ دە بدوێ کچێ، وەڵا زویر دەبم و دەڕۆم خۆ دڵمت تەقاند.

+ هێلین باوەڕ ناکەی نا، ئەگەر ئێستا وا بکەم قسە لەگەڵ سوهەیل بکەی چیم دەدەییێ؟

- چیت دەدەمێ؟ ئەم لەچکە سوورەی خۆمت پێ دەدەم دەی، بەخوا زۆریشم خۆشدەوێ و گران کڕیومە.

+ ئاخر پەشیمان نابیەوە؟

- وەڵاهی گەر تۆ کچێکی هێندە زیندووبی و بتوانی وا بکەی سوهەیل ببینم قیرو سیا لەم لەچکەش.

+ نەخۆشەکەی ئەودیو، هێلین ئەو لاوەی ئەودیو سوهەیلە، سوێندت بۆ دەخۆم خۆیەتی.

- قسەی قۆڕ، سوهەیل وا لە حیکمەتخانەیە، تۆ هێشتا لەم خەونانەت واگا نەهاتووی، کچێ من شۆخیم دەکرد کە دەمگوت شازادە و شت بێ، ئەم چشتانە تەنێ خەونن فەقیرحاڵ.

---

(١) بەربێژ: چەنەباز

+ خەون نییە هێلین، ئەو خۆی وایگوت، حەزدەکەی خۆشت قسەی لەگەڵ بکە، دڵنیات دەکەمەوە سوهەیلە.

- باشە هەڵسە با بچین، دیارە کوڕە وە قسە هاتۆتەوە؟

+ بەڵێ کەمێك پێش ئێستا بوو، من چووم کراسەکەی دایکم بێنم ئەو قسەی کرد و گوتی ناوم سوهەیلە، دواتر گوتی کە لە حیکمەتخانە دەخوێنم.

- کچێ کچێ دڵارا، وەڵا گەر ئەمە ڕاست بێ پارووت کەوتە ڕوون، بەخوا من باوەڕ ناکەم کا هەڵسە بچین.

+ ئێ لەبەر دایکم چۆن بچینە ئەوێ، دواتر شەرمە بۆ ئێمە، بەخوا من زۆر شەرم دەکەم.

- سەیرکە دڵارا، هەرچەندە باوەڕم بەم شتە نییە، بەڵام گەر ئەمە سوهەیل بێ دەتوانێ یارمەتی شۆڕشەکەمان بدا و دەنگمان بە مامۆستاکان بگەیەنێ، یاوەخود خۆی و هاوەڵەکانی لە پشتمان بن لەکاتی شۆڕشەکەدا، بۆ ئەوەی تەنێ کچ نەبین و دەنگی کوڕانیشمان بێتە پاڵ. هەڵسە بە فێڵێك دەچینە ئەودیو دایکت لە ناندینەکەیە.

+ وەلێ چۆن بچین؟ ئەها من یەك شت ناڵێم و تۆ قسە بکە باشە.

- ڕاوەستە ڕاوەستە، نەکا ئەو دەمەی کوڕە گوتویەتی سوهەیلم لەبەردەم ئەودا بەڕوودا کەوتبی و حەیامانت بردبێ؟

دڵارا بە خـــەندەوە: ڕێك وابوو هـــێلین، ئێ کچـــێ زۆر لام هەژەند[١] بوو، چاوەڕێی ئەوەم نەدەکرد.

- ئەی هاوار جا وەرە ڕوومان هەبێ بچینە بەردەمی، خاتوون چۆن ئابڕووومانی تکاندوە، ئاخر دەڵێم من نەبم ماتەل دەبی دەڵێی نا. تەماشاکە بزانە پیلانم چی یە، ئێستا دەچینە ئەودیو، تاوەکو کوڕە نەزانێ بۆلای وی هاتووین من دەڵێم ئەرێ دڵارا لەچکە سەوزەکەی پێتم دابوو لەم ژوورەت دانەناوە، تۆش بڵێ وەڵاهی وا سەیرێکی دەکەم بزانم لێرەیە. ئیدی کەمێ خۆت بە کەلوپەلەکان مژووڵ بکە و ئەوەی تر بۆمن لێگەڕێ.

+ کچێ لە ئێستادا سوور بوومەتەوە بەخوا، بەس لە پێناو شۆڕشەکەمان لەگەڵت دێم دەنا من ئەو ڕووەم نییە بەرامبەر کوڕان ڕاوەستم و قسان بکەم، دەمێدی هەر بە دوو سێ قسەی لەهۆش چووم.

هەردوو لە بێئاگایی خاتوو ڕەعنادا خۆیان بە ژوورەکە دادا و پیلانەکەی هێلین دایانابوو جێبەجێیان کرد. لەنکاو هێلین گوتی: ئەرێ دڵارا ئەم لاوە دەبێ حاڵی چۆن بێ؟ وە قسە نەهاتۆتەوە؟

بەر لەوەی دڵارا دەنگی لێوەبێ سوهـــەیل هـــێزی دایە خۆو گوتی:

---

(١) هەژەند: سوپرایز، شتی لە ناکاو کە سەرسامت بکا.

شوکر ئێستا باشم، دڵگران بووم بە کەوتنی خاتوو دڵارا و هۆکارەکەم نەزانی، هیوام وایە سەلامەت بن. هەوڵ دەدەم تۆزێ باشتر بم بڕۆم و پتر نەبمە بارگرانی بۆتان، چاکەی ئێوەم هەرگیز پێ نادرێتەوە.

لەو دەمەدا دڵارا لە شەرمان سەری داگرتبوو، وەلێ هێلین دەستی بە قسان کرد:

ئینشاڵا بەم زووانە هەڵدەستیتەوە و چاك دەبیەوە، دڵارا کەمێك پێش ئێستا باسی تۆی دەکرد و گوتی کە ناوت سوهەیلە و لە حیکمەتخانە دەخوێنی؟

+ بەڵێ بەڵێ، لە حیکمەتخانەم.

- بەڕاستی! هەمان ئەو سوهەیلەی کە دەیان گوت قوتابی زیرەك و یەکەمی حیکمەتخانەیە؟!

سوهەیل زەردەخەنەی هاتێ و گوتی: لەوێدا هەر من هەم ناوم سوهەیل بێ، دەڵێی ئێوە شتێکتان لەگەڵ ئەم ناوەدا هەیە، بۆ سەرتان سوڕ دەمێنێ وەك ئەوەی کە بمناسن؟ ئایا هیچ شتێك هەیە؟! لەو دەمەدا سوهەیل چەند جارێك کۆکی و هەستی دەکرد ئازاری زۆرە و قسەکردن پتر ئێشی پێ دەگەیەنێ. هێلینیش واق ببوو بە دیاریەوە و دەستی لەسەر دەمی خۆی دانابوو، لەپڕدا هاوارێکی نزمی کرد و گوتی: ئەی هاوار لەم هەژەندە! کچێ من سەراسیمەبووم دڵارا، خۆ ئەوە دەڵێ سوهەیلم!



دڵاراش ئارەقەی پێدا دەهاتە خوارێ و خۆی لە هێلین مۆڕ دەکردەوە[١] و بە دەست

ئاماژەی بۆ دەکرد کە دەنگی نزم بکاتەوە.

سوهەیل کە بە زەحمەت پرزەی بۆ دەدرا هێزی دایە خۆی و هاتەوە قسە:

من لەم حاڵە تێناگەم! یەکێ تێم گەیەنێ چی ڕوویداوە کچینە؟!

هێلین خێرا وەڵامی دایەوە: کورە چۆن چی ڕوویداوە، من و دڵارا ماوەیەکی زۆرە دەمانەوێ بتبینین و ناتوانین، ئەی خوایە ئەی خوایە ئەمە چی دەبینم! ئادەی دڵارا بزانە خەون نییە کچێ دەست لە سەروچاوت بدە.

+ من ببینن!

- ئەرێ ئەرێ تۆ سوهەیل، لە شاهێندا باس باسی زیرەکی و هۆشیاری تۆیە کوڕە ئاگات لە چی یە، ئێ ئێمەش حەزمان دەکرد بتبینین و دەربارەی حیکمەتخانە لەگەڵت بدوێین. ئێمە هەزاران کچین لێرە کە مافی خوێندنمان پێ نەدراوە و قەرارە شۆڕشێك بەرپا بکەین و ئێمەش بۆمان هەبێ لە حیکمەتخانە بخوێنین. ئەگەر تۆ یارمەتی دەرمان بی و بتوانی وابکەی کوڕانیش پشتگیرمان بن

---

(١) مۆڕبوونەوە: چاو زەق کردنەوە لە یەکێك بە تووڕەیی.

زۆرت لێ مەمنوونین، بەخوا لای دڵاراش هەر باس باسی تۆ و بێستانی تەماتەکانە، هیچ باسی دی لەگۆڕێ نییە.

لەگەڵ ئەم قسەیەدا دڵارا هێندەی دی سەروچاوی سوور هەڵگەڕا و ئارەقەی تك تك بە گۆنا سێویەکانیدا دەهاتنە خوارێ و لە ژێرەوە خۆی لە هێلینی تووڕە دەکرد. هێلینیش بەبێ ئەوەی خۆی تێك بدا ڕووی لە دڵارا کرد و گوتی:

ئەی وانییە دڵارا؟

دڵارا بە شەرم و پەشۆکاویەوە: بەڵێ ئەگەر قسە لەگەڵ حەکیمەکان بکەی تا کچانیش وەرگرن چاکەیەکی گەورەمان لەگەڵ دەکەی، ئەوە ئاواتی گەورەی من و دایکمە.

هێلین: شۆڕشەکەمان زۆر گەورەترە لەوەی لە خەیاڵت دایە کاك سوهەیل، وانەزانی ژمارەمان کەمە، وەلێ یارمەتی تۆشمان پێویستە و تکایە داواکەمان ڕەت مەکەرەوە.

سوهەیل بە سەرسامیەوە گوتی: شۆڕشی کچان!

- بەڵێ بەڵێ شۆڕشی کچان.



## شۆڕشی کچان



کچەکان لەگەڵ سوهەیلدا ڕێك کەوتن تاوەکو لەکاتی شۆڕشەکەدا یارمەتی دەریان بێ و کات و وادەکەیان ڕاگەیاند. سوهەیلیش نزیکەی هەفتەیەك لە ماڵی دڵارا مایەوە و هەر ئەوەندەی تۆزێ هەستی بە باشی کرد و هەڵسایەوە زۆر سوپاسی خێزانەکەی کرد و منەتباریان بوو. لەگەڵ مام وسودا زۆر دوان و تێی گەیاند کە ئەو قوتابیە و کەسانێك بە ناحەق هاتوونەتە گیانی. ئینجا ماڵئاوایی لێ کردن و بەرەو ماڵی خۆیان وەڕێ کەوت.

سوهەیل بە دایك و باوکی شادبوویەوە و بە تەواوی بۆیانی ڕوونکردەوە کە بۆچی ئەم ماوەیە ون بووە. ئەوان بە بینینەوەی ڕۆڵەکەیان ژیانیان هاتەوە بەر، چون چەند ڕۆژبوو بە ون بوونی حاڵیان بە تەواوی شپرزە بوو بوو، باوکی جێگا نەمابوو کە لێی نەگەڕێ.

سوهەیل هەر دوای ئارام بوونەوەی ماڵێ دەستی بە دانانی پلان کرد بۆ ڕۆژی شۆڕشەکە. ئیدی بەبێ وەستان بەم حاڵەوە هەر ڕۆژە و سەری لەچەند هاوڕێیەکی دەدا و بابەتەکەی بۆ ڕوون دەکردەوە و ڕازی دەکرد کە پێویستە فڵانە ڕۆژ لەبەردەم کۆشکدا ئامادەبێ و کچانیش لەم پڕۆسە مەزنە بێبەش نەبن.

لە کۆتاییدا ڕۆژە گەورەکە هاتەپێشێ، هەموو کچانی شاهێن یەك یەك و دوو دوو لەماڵێ دەردەهاتن و ڕەگەڵ یەك دەکەوتن بۆ بەردەم کۆشك. وردە وردە ژمارەیان زیادی دەکرد و بە لێشاو شۆڕ دەبوونەوە لەژێر درووشمی خوێندن هەر هی کوڕ نییە و بۆ کچانیشە. تەنانەت ئەو کچانەی ئاگاداری بابەتەکەش نەبوون کە دەهاتنە بەر دەرگا و لە لێشاوەکەیان دەڕوانی خێرا خۆیان دەخستە نێوی.

خەڵکی شاهێن بە ورد و درشتی، بە پیر و جەوانی هاتبوونە دیاریان و پێیاندا واق بوو بوون. زۆربەی زۆری خەڵکەکە ئەمەی بە بێ شەرمی و لادان لە نەریتی باوك و باپیران ناوزەد دەکرد، تەنانەت بازێ لە باوکان و کوڕە گەنجەکان دەیان ویست ئازاری کچ و خوشکەکانیان بدەن و بیان گێڕنەوە ماڵێ، وەلێ هەر ئەوەندەی لە کچێك نزیك دەبوونەوە سەدان کچ گەلە کۆمەیان لێ دەکرد و کەس چی پێ لەگەڵ نەدەکران.

وای لێهات تەواوی کۆڵانەکانی شاهێن تەژی ببوو لە کچ، بە چەشنێ هەر دەتگوت کچ ڕژاوە بەسەر کۆڵانەکاندا، یاوەخود لەگەڵ لێزمەی باران دابەزیون و دابەشی سەر کووچە و ڕێگاکان بوون. لە هیچ دەم و زەمانێکدا ئەوەندە کچە لە شاهێندا نەبینراوە. بازێ لە باوکان کە ئەمەیان دەدی بەر لەوەی کچەکەیان بێتە دەرێ خێرا دەچوون دەرگاکەیان لەسەر گاڵە دەدا و نەیان دەهێشت لەم دیمەنە بڕوانن. ئەمە ئەو شیعرەی مام هێمنی دەخستەوە یادم کە دەڵێ:

دەرکی داخستووە لە تۆ بابت کەچی دەرکی نییە
دەرکە داخستن لـەتـۆ دەرکی ئـومێد داخستنە

ئاخر لە شاهێندا کوفر بوو کچ بێتە دەرێ و باسی مافی خوێندن بکا. تا ئێستا چشتی وەهایان بە چاوی خۆیان نەدی بوو کە کچ بەم چەشنە لە دەرێ بێ، بۆیە زۆربەی پیاوەکان تێکرا دژی ئەم کارە دەوەستانەوە و بە ئابڕوچوونیان دادەنا. لێرە و لەوێ مرۆیە تەمەندارەکان هاواریان دەکرد کە تازە ئابڕووی شارەکەمان تکا.

ئەو ڕۆژە هەڵلایەك بوو لە شاهێندا هەر مەپرسە، تەنانەت لەم هات و هۆریایە منداڵی ساواش زیڕەی دەهات و سەراسیمەبوو. ئاخر نەبوونی مافی خوێندن ئەم کچانەی هێنابوویە دەرێ، دەنا کچ لەنێو ماڵی خۆی و بە کاروباری ماڵەوە جوانە. ئەو گەوهەرێکە کە لەنێو سەدەفەکەی خۆیدا دەدرەوشێتەوە و نابێ گەوهەر دەستی هەموو کەس کەوێ و هەموو بە سانایی تێی بڕوانن.

لە کۆتاییدا بە هەزاران کچ گەیشتنە بەردەمی کۆشکی پادشا و لەوێدا گردبوونەوە، هێندێ لەوان خوێن بە سەرو سیمایاندا دەهاتە خوارێ و لەلایەن کەس و کاریانەوە ئازار درابوون. لەم لاوەش بە هەزاران ژن و منداڵ و پیاو هاتبوونە دیاریان و هێندەی دی قەرەباڵغی و ژاوەژاو زیادی کردبوو. تەنانەت هەندێ لە حەکیمەکانیش ئەو ڕۆژە حیکمەتخانەیان جێ هێشتبوو تاوەکو لەم دیمەنە سەیرە بڕوانن. لەپڕدا خەڵکەکە ڕوانیان ئەوا سەدان

گەنج و لاوی کوڕ بە پێشڕەوی سوهەیل هاتنە مەیدان و شان بە شانی کچەکان لەبەردەم کۆشکدا گردبوونەوە. هێشتا ئاسەواری برین و ڕەنگ زەردی لە ڕوخساری سوهەیلدا بەدی دەکرا، ئەمما هێندە بە جەختی[١] و چاپووکیەوە بە دارەکەی دەستی دەڕۆیی کە دەتگوت لە مەیدانی جەنگ دایە. لە دەستێکیدا ئاڵایەکی سپی بەدی دەکرا کە نیشانەی ئاشتیە و لە ئەوەی دیکەش گۆچانەکەی بوو کە پێی دەڕۆیی، چون تەواو چاك نەبوو بوویەوە. تەواوی سەربازەکان لەسەر دیوار و بەردەمی کۆشکدا حەپەسابوون، پادشا لە پەشۆکاویان چووبوویە سەربان و هێشتا نەیدەزانی چ باسە. کۆمەڵەکەی حەکیم ناسرِ ئەو دەمەی چاویان بە سوهەیل کەوت کە لە پێشەوەی کوڕەکان وەستاوە هەموو سەیری یەکیان دەکرد و سەراسیمە ببوون.

سوهەیل هەر چاوی لە دڵارا دەگێڕا و دەیهەویست بزانێ ئەم کچە شەرمنە لە کوێی ئاپۆڕاکەیە[٢]. کاتێك ڕوانی هێلین لە پێشەوەی کچەکان وەستابوو، ئەمما چ باسێك لە دڵارا وجوودی نەبوو، خێرا خۆی گەیاندە نزیك ئاپۆڕاکەی کچان و لە دوورەوە بانگی هێلینی کرد و پرسیاری دڵارای لێکرد، لێ ئەویش بە دەست ئاماژەی دا کە نازانێ کچە لە کوێ یە.

---

(١) جەختی: چاڵاکی

(٢) ئاپۆڕا: قەرەباڵغی و گردبوونەوەی خەڵك.



سوهەیل ئەو دەمەی دڵارای نەبینی تەواو دڕدۆنگ[1] بوو، خێرا خۆی لە هێلین نزیك كردەوە و هاواری كرد: ئێوە چەند كەسێكتان بڕۆن بەدوایدا بگەڕێن، نەبادا كێشەیەك شتێكی تووش بووبێ.

هێلین بە دەنگی بەرز و پەشۆكاویەوە: ئەو لەگەڵ مندا هاتە دەرێ و لە ڕیزی پێشەوەی ئاپۆڕاكەبوو، لێ هەر ئەوەندەی جەنجاڵی پەیدابوو نەمزانی چی لێ بەسەرهات. قەرارمان دابوو تا كۆتایی بە یەكەوە لە ڕیزی پێشەوەبین!

سوهەیل كە ئەمەی بیست نارەحەتی دایگرت، خێرا خۆی لەنێو جەنجاڵیەكە دزیەوە و بەو ڕێگایەدا ڕۆیی كە كچەكانی پێدا هاتبوون. ئەو دەمەی تۆزێ لە خەڵكەكە دوور كەوتەوە ڕوانی گەنجێك هاتە بەردەمی و گوتی: دەڵێی بەدوای كەسێكدا دەگەڕێی؟ كچێكە وانییە؟

+ بەڵێ بەڵێ خوشكێكی خۆمە و ونم كردووە، ئایا دەزانن لە كوێ یە؟

- بەڵێ دەزانم، ئەو لەنێو ئاپۆڕاكەدا تۆزێ ئازاری پێ گەییبوو، بەدوامدا وەرە تا بتبەمە لای.

سوهەیل بەدوای كوڕە گەنجەكەدا ڕۆیی تاوەكو بەتەواوی لە قەرەباڵغی دووركەوتنەوە و لە شوێنێكی چۆڵدا گەیشتنە خانوویەكی بچكۆڵە و كوڕەكە هاتەوە دەنگ:

---

(١) دڕدۆنگ: دوو دڵ



- چون قاچی بە خراپی ئازاری بەرکەوتبوو لێرە لای خاتوونێك چارەسەرمان بۆکرد، فەرموون بڕۆنە ژووریٚ، دڵنیام ئەویش تامەزرۆی بینینی ئێوەیە.

سوهەیل هێندەی پەلەبوو تاوەکو زوو بگەڕێتەوە نێو شۆڕشەکە خێرا خۆی بە ژووریٚ دادا و هەر هێندەی زانی لەدواوە دەرگاکەی لەسەر گاڵە درا و بەزوویی تێگەیی کە فێڵی لیٚ کراوە.

دەستی بە هاوار و خۆ کێشان بە دەرگاکە کرد، لیٚ دەرگاکە لە ئاسنێکی زۆر پتەو چیٚ کرابوو کە لە توانای مرۆڤدا نەبوو بیشکێنیٚ. وەکو شێتێك خۆی بەملاولای دار و دیوارەکان دادەدا و چاوی لە پەنجەرەیەك یان دەرچەیەك شتێکی لەم بابەتە دەگێڕا، وەلیٚ بیٚ ئەنجام بوو. نزیکەی بیست خولەك بەبیٚ وەستان دەهات و دەچوو لەنێو خانوەکەدا و لە هارژنی دەدا بەڵکو کەسیٚ لە دەرەوە دەنگی ببیستیٚ، ئینجا بە مەچەك و پێیەکانی بە دیوارەکانیدا دەکێشا تاوەکو شەکەت بوو. لە کۆتاییدا هێندە ماندوو بوو سەری سووڕا و بەربوویەوە، بە غەمباری و کزۆڵیەوە لەنێو ژوورەکەدا ڕاکشا و فرمێسك لە چاوانی غلۆر بوونەوە و لەبەر خۆیدا بە گریانەوە دەیگوت:

ببوورە خاتوو دڵارا، ئێوە چاکەیەکی مەزنتان لەگەڵدا کردم و ژیانی منتان ڕزگار کرد، لیٚ من نەمتوانی شتێکی بچووکتان بۆ بکەم، دووبارە ببوورن. هیوام وایە سەلامەت بن و چ کەس ئازاری



پێ نەگەیاندبن. دەترسم لەدوای من کوڕەکانیش پاشەکشە بکەن و پەژیوان ببنەوە لە شۆڕشەکە. ئەوە کێ یە دەیهەوێ ئازارم بدا لە کاتێکدا من زیانێکم بۆ ئەو نەبووە! داوام لە حەکیمی مەزنە کە ڕزگارم بکا و بە هانامەوە بێ. ئەی حەکیمی هەموو حەکیمان، بەندەیەك لە بەندەکانت دوای ئەوەی پیلانی کوشتنیان دانا ئێستا لە خانوویەکی چۆڵدا بەندیان کردووە. ئەگەر خۆت بە هانام نەیەی چ کەس ئاگادارم نییە و لێرە تێدا دەچم. چەندین ساڵە بۆ بەرزکردنەوەی پەیامی تۆ حیکمەت دەخوێنم، دەسا تۆش بە هانام وەرە.

سوهەیل لەم ناڕەحەتیە دابوو کە هیچ دەرچەیەکی وەدی نەدەکرد و نەرم نەرم چاوەکانی ئاوی تەڕ و ڕەوانیان بەسەر ڕوویدا دەڕژاند. لەم لاوەش کوڕە لاوەکان پەشۆکابوون و بەدوای سوهەیلدا دەگەڕان تاوەکو پێشڕەوی شۆڕشەکەیان بۆ بکا، ئەمە لە کاتێکدا هێلینیش کە سەردەستەی کچەکان بوو کەوتبوویە حاڵەتێکی تەواو دڕدۆنگیەوە و دەترسا دڵارا شتێکی لێ هاتبێ. چەند جارێك ویستی ئاپۆڕاکە جێ بهێڵێ و بچێتە دوای دڵارا، ئەمما کە سەیری کرد ئەو سەردەستەی کچەکانە و قسەکەری شۆڕشەکەیە و ئەگەر بڕوا ڕەنگە ئەوانی دیش وردە وردە پەرتەی لێ بکەن و شۆڕشەکە هەرەس بێنێ. بڕوا کە یەکێك بوو لە هاوەڵە نزیکەکانی سوهەیل، ئەو دەمەی ڕوانی ڕیزی کوڕەکان پشێویەکی زۆری کەوتۆتە ناوێ خێرا چوویە

پێشەوە و دەستی بە هاوار کردن کرد: بەڵێ بۆ خوێندنی کچان، بەڵێ ئەوانیش مرۆڤن و مافی خوێندنیان هەیە، ئەی لاوەکان ئێمە ناکشێینەوە تاوەکو پادشا داواکاریەکەمان بەجێ نەهێنێ. لەم لاوەش کچەکان بە تێکڕایی هاواریان دەکرد:

حەکیمی مەزن مافی خوێندنی بە هەموو مرۆڤایەتی داوە، بۆ هیچ کەسێ نییە ئەم مافە زەوت بکات.

حەکیم ناسڕ کە ئەمەی بینی خێرا خۆی گەیاندە نێو کۆشك و لای پادشا.

+ قوربان ئەمە چی یە دەیبینم، شاهێن کە بە شاری پیاوەتی و شەرم و شکۆ و دینداری ناسرابوو چی لێ بەسەر هاتووە؟! ئەگەر ئەمە بەزوویی چارەسەر نەکرێ کێشەیەکی زۆر گەورەیە بۆمان و لەنێو تەواوی شار و وڵاتانی دی ئابڕوومان دەچێ. ئێمەی حەکیمان بە هیچ شێوەیەك ئەمەمان قەبووڵ نییە کە کچ بێتە حیکمەتخانە. خوێندن لە کۆنەوە کارێك بووە هەر کوڕ کردوویانە، ئەگەر تۆ ئەمە قەبووڵ بکەی هەم شاهێن دەکەوێتە مەترسیەوە و هەم حیکمەتخانەش. ئومێدم وایە داوا لە سەربازەکانت بکەی ئازاریان بدەن و پاشەکشەیان پێ بکەن گەورەم.

- تۆ خەمت نەبێ ناسڕ گیان، من خۆم چارەسەرێك بۆ ئەمە دەدۆزمەوە و لەگەڵ وەزیرەکاندا پرس و ڕاوێژ دەکەم، ئێوە



بگەڕێنەوە حیکمەتخانە و بەردەوام بن لەسەر وانەکانتان و ئەم کارە خەمی منە.

پادشا لەنێو کۆشکەکەیدا کۆبوونەوەی سازدا و لەگەڵ تەواوی وەزیرەکان ڕوونیشت، بڕیاریدا چەند ڕۆژێك فەرامۆشیان بکا تاوەکو ماندوو یاخود برسی دەبن و دەگەڕێنەوە. ئەو ڕۆژە چاوەڕێی کردن و بەیانی لێ داهات. لەگەڵ ڕۆژهەڵاتندا هاتە سەربانی کۆشکەکەی و ڕوانی لە جاران جەنجاڵترە و کەس نەچۆتەوە ماڵێ. ئەمڕۆ لە دوێنێ بە جۆش و خرۆشتر هات و هاواریانە. هەموو تێکڕا هاواریان دەکرد:

ئەی پادشا وەرە دەرێ و مافەکانمان بەجێ بێنە. پادشا لەگەڵ ئەم هەڵلایەدا گێژ بوو بوو، بە ناچاری دووبارە لەگەڵ وەزیرەکاندا ڕوونیشت و هەمان بڕیاری چاوەڕێ کردنیان دایەوە.

ڕۆژی دووهەمیش ڕۆیی و بەیانی داهاتەوە، پادشا لەگەڵ دەنگ و هەڵلادا لە ژوورەکەی بەخەبەر هات و ڕاپەڕی. ئەو دەمەی لە ژوورەکەی چوویە دەرێ ڕوانی وا خەڵکەکە لە کچ و کوڕ لەنێو کۆشکەکەیدا دەسووڕێنەوە و بە نادنینەکەی کۆشك وەربوون و هەیتەکانی[1] پادشا بەرەوەستیان ناکەن و پێیان ڕاناگیرێن. خێرا یەکێك لە وەزیرەکان خۆی گەیاندە پادشا و گوتی: قوربان دەبێ ئێمە چی زەرەرکەین کە دڵی ئەم هەموو

---

(١) هەیتە: پۆلیس



کچە ڕازی بکەین و ئەوانیش لە حیکمەتخانە بخوێنن، ئەمە باشترە لەوەی بەیانی لە وڵاتان حەیامان بچێ و بڵێن کچ کۆشکی پادشای شاهێنیان بەسەر یەکدا ڕووخاند.

پادشا بە پەشۆکاویەوە: بەڵام ئەمە چۆن دەبێ ئەی وەزیر، مەگەر لە هیچ شوێنێکی دونیا کچان دەتوانن بخوێنن؟

- بەڵێ ئەوانیش مرۆڤن و ڕەنگە حەقیشیان بێ گەورەم، خۆ لە هیچ دەقێکی ئاینیدا خوێندنی کچان قەدەغە نەکراوە، ئەگەر دەقێکی وات لەبەر دەستە نیشانمی بدە؟ ئەمە تەنیا داب و نەریتێکە و تەواو، هەر ماوەیەکە خەڵکەکە ڕادێ لەگەڵ بابەتەکە. ئەگەر ئەمەیان بۆ نەکەی تا هەتایی کچانی شاهێن ڕق لە دڵ دەبن بەرامبەرت گەورەم، ئەوان وەکو پیاوان نیین شتیان لەبیر بچێتەوە، لێ پیاوان بەزوویی ئەمە لەیاد دەکەن و بە ماوەیەکی کەم کارەکە لایان ئاسایی دەبێتەوە.

لەگەڵ ئەم گوتانەی وەزیرەکەدا پادشا تێڕامانێکی کەمی کرد و دڵی گۆڕا، خێرا سەرکەوتە بانی کۆشکەکە و ڕووی لە ئاپۆڕاکە کرد و هاواری کرد:

ئەی کچانی شاهێن، هەموو تێکڕا گوێ بدەنە پادشاکەتان و بزانن چ بڕیارێکتان بۆ دەردەکا.

لەگەڵ ئەم قسەیەدا هەر هەمووی ڕووی وەرسوڕاند بۆ لای پادشا و بەرە بەرە پشێویەکە کەمتر دەبوویەوە. ئەو دەمەی پادشا زانی دۆخەکە ئارام بوویەوە دەستی پێکردەوە:



ئەی کچانی وڵاتەکەم، دوای چەندین کۆبوونەوە و دانیشتن لەگەڵ وەزیر و ڕاوێژکارەکانمدا گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە بەڵێ کچانیش وەکو هەموو مرۆڤەکانی دی مافی خۆیانە بخوێنن و لەنێو حیکمەتخانەدا وجوودیان هەبێ. ئێمە لەمڕۆوە لە پیلانمان دایە دەست بە دروستکردنی چەندین حیکمەتخانە بکەین بۆ کچانی وڵاتەکەمان و حەکیم و مامۆستای پسپۆڕیان بۆ دابین بکەین. ئێستاش بە دڵخۆشی و ئارامیەوە بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانتان.

لەگەڵ ئەم گوتانەدا کچەکان هەموو حەپەسابوون و بڕوایان نەدەکرد کە ئەم مافەیان پێ دراوە. هەر لەگەڵ لێبوونەوەی پادشادا بوویە هاوار و چەپڵە ڕێزانێك هەر مەپرسە. لە خۆشیاندا هەموو یەکدیان لە باوەش دەگرت و پیرۆزباییان لێك دەکرد.

لەم لاوەش خەڵکەکە هەمووی سەراسیمە ببوو، کەس بڕوای بەمە نەدەکرد پادشا بڕیاری وا دەربکات. کۆمەڵێك هاواریان دەکرد: ئەمە بێ شەرمیە، ئەمە حەیاچوونە بۆ شاهێن، نابێ ئەمە سەر بگرێ. کۆمەڵەکەی حەکیم ناسڕ لە تووڕەییدا لێوەکانی خۆیان دەکرۆشت و هەموو هاواریان دەکرد: ئەمە ئەوپەڕی بێ شەرمیە بەرامبەر ئاین، بەرامبەر حیکمەتخانە. وەلێ تازە پادشا قسەی کرد و لەو کەسانەش نەبوو کە گوتەی خۆی بخواتەوە و پاشگەز بێتەوە. لەپڕدا هەندێ لەو پیاوانەی ئەو کارەیان بەبێ شەرمی ناو دەبرد دەستیان کرد بە بەرد هاوێشتن بۆ کچەکان و چەند کەسێکیان بریندار کرد. هێلین یەکێ بوو لەوانەی کە خوێن

لەسەری فڕکەی کرد و گۆناکانی سوور داگەڕاند. کوڕە لاوەکانی نێو شۆڕشەکە خێرا بۆیان چوون و خەریك بوو شەڕێکی گەورە ڕووبدا، وەلێ بە زوویی سەربازەکانی پادشا چوونە نێوانیان و بە لاشەی خۆیان دیوارێکی درێژیان چێکرد لە نێوان خەڵکەکە و شۆڕش گێڕەکاندا.

ئەو دەمەی کچەکان ویستیان بگەڕێنەوە خێرا هێلین بە سەرو ڕوخساری خوێناویەوە ڕووی لە پادشا کرد و هاواری کرد: ئێمە لێرە ناجووڵێین گەورەم تاوەکو قوتابخانەی مەزنی حیکمەتیش نەکرێتە دوو بەش و بەشێکی بۆ کچان نەبێ. خۆت دەزانی هیچ کام لە حیکمەتخانەکان وەکو ئەو حیکمەتخانەیە گەورە و ناودار نییە. بازێك لە کچەکان قابیلیەتی ئەوەیان تیایە لەم شوێنە گەورە و ناودارە بخوێنن. ئێمە قوربانیمان داوە و چەندین بریندارمان هەیە، شەرمە بۆ پیاوانی شاهێن دەست درێژکەنە سەر کچانی وڵاتەکەیان. لەبری ئەوەی پشتگیریمان بکەن دەمان ڕووخێنن! سوێند بە حەکیمی مەزن گەر یەك بە یەکمان بمرین لێرە ناڕۆین تا قوتابخانەی مەزنی حیکمەتیش بەشی ئێمەی تیا نەبێ.

لەگەڵ ئەم قسەیەدا حەکیم ناسر لە شوێنی خۆیدا هاواری کرد: ئەم بێ شەرمە ڕاگرن، ئا دەی سەربازان ئەم کەسە حەیا تکاوە دەسگیر بکەن. ئینجا پیاوەکانیشی لەدواوە لەگەڵیدا هاواریان دەکرد بۆ ئەوەی پشێوی لەنێو خەڵکەکەدا چێ ببێ و کەس گوێ لە هێلین ڕانەگرێ. لەنکاو پادشا هاواری کردەوە:

بێدەنگ بن، دەنگی هیچ کەسێکم ناوێ تەنێ ئەوەی من ڕێگای قسەکردنی پێ دەدەم. ئیمڕۆ ئەم کچە ڕوخسار خوێناویە پێی سەلماندین کە کچان چەندە بوێرن بۆ مافەکانیان. ئەگەر ئێمە حیکمەتخانە بۆ کچان بکەینەوە چی زەرەر دەکەین؟ گەر لەنێو قوتابخانەی مەزنیشدا بەشێك بۆ ئەوان بکرێتەوە و تێکەڵی کوڕەکان نەبن، ئایا زیانی هیچ کامتانی تێدایە؟!

هەموو خەڵکەکە بێ دەنگ بوون و کەس نەیوێرا فزە بکا، لەو دەمەدا پادشا گوتی:

ئادەی ئێستاش بەردەمی کۆشکەکەم چۆڵکەن و هەرکەس لێرە بمێنێتەوە سزای بەسەردا دەسەپێنم، یەکجار ماندووم و یارای[١] هیچم نەماوە .

هێلین هاتەوە دەنگ: قوربان یەك شتی تر، ئێستا هەموو ئەم کچانە بەترسەوە دەڕۆنەوە ماڵێ و نێو کەس و کاریان، هەیانە ڕەنگە هەڕەشەی کوشتنی لەسەر بێ، تۆ چۆن ئاسایشیان بۆ دابین دەکەی؟

+ئادەی سەربازەکان چوار دەوری کچەکان بگرن تاوەکو هەریەك لەوان دەگەیەننە ماڵی خۆی لێیان جودا نەبنەوە، هەرکەسێکیش بزانین کچەکەی خۆی لەسەر ئەم کارە سزا داوە ئێمە لێی قەبووڵ

---

(١) یارا: توانا

ناکەین و حەکیمی مەزنیش قەبووڵی نییە کە مافی ئەوان زەوت بکرێ. ئیتر کۆتایی پێهات و کەستان لێرە نەبینم.

لەو کاتەدا کچەکان بە کەیف سازیەوە گەڕانەوە و خەڵکەکەش هەمووی لە نێوان خۆیاندا چپە چپیان بوو، لێ کەس لە بەرامبەر فەرمانی پادشادا چی پێ نەدەکرا. هێلینیش هەر چاوی لە دڵارا دەگێڕا و زۆر ناڕەحەت بوو بە ون بوونی. دەترسا باوکی یاخود خزمێکی ئازاریان پێ گەیاندبێ، چون ئەو کچە قەراربوو لەگەڵ هێلیندا سەردەستەی شۆڕشەکەبن. هێندێ لە کچەکان کە دەگەڕانەوە ماڵێ بە زەردەخەنەوە پیرۆزباییان لێ دەکردن و دڵیان خۆشبوو کە کچەکەیان ئەم مافەی بۆ وەرگیراوە، وەلێ هێندێکیان ماڵەوەیان لێی لووتەلا و تووڕە بوون و بەسەریدا هەڵدەشاخان، ئەمما لەبەر فەرمانی پادشا و گەورەیی پادشاکەیان نەیان دەوێرا ئازاریان بدەن.

هێلین کە گەڕایەوە یەکەم کاری چوویە بەردەم ماڵی دڵارا و گوێی خۆی لەپشتی دەرگاکە ڕادێرا، وەلێ کەس نقەی نەبوو. لەوە دەترسا لە دەرگا بدا و باوکی بێتە دەرێ، لێ هەر زوو ترسەکەی ڕەواندەوە و گوتی: ئەوە چیتە کچێ، تۆ لە شۆڕشێکی مەزن هاتوویەوە و هێشتا سەرت بە خوێنە و نەترساوی ئێستا دەترسی لە دەرگایەك بدەی! خێرا تەقەی لە دەرگاکە هێنا و بەینێکی پێچوو خاتوو ڕەعنا بە پەشۆکاوی و چاوی پڕ ئەسرینەوە هاتە دەرێ.

+ هێلین خێرا لێرە بڕۆ تا کەس نەیدیوی، مامەکانی دڵارا لێرەن و ئەویان لەنێو شۆڕشەکە بینیوە و هێناویانەتەوە ماڵێ و زۆر زۆریان ئازار داوە، دڵارایان لە ژوورەکەیدا بەند کردووە. خێرا بڕۆ تا کارەکە خراتر نەبووە.

هێلین هاواری کرد: بە هیچ شێوەیەك ئەمە قەبووڵ ناکەم، ئاخر لەسەر چی لەم بەسەزمانە بدرێ، هەر ئێستا دەڕۆم و شکاتیان لێ دەکەم.

+ کچێ وسبە وسس کچە تیم، دەتەوێ کێشەکە گەورەتر بکەی.

لەگەڵ ئەم قسەیەدا خاتوو ڕەعنا بە گریانەوە دەرگای بەڕووی هێلیندا داخست و ئەویش بە خێراییەوە گەڕایەوە بەردەم کۆشك و هەندێ لە سەربازەکانی ئاگادار کرد کە یەکێ لە کچەکان ژینی لە مەترسی دایە. خۆشبەختانە زوو بەدەم داواکەی هێلین هاتن و مامەکانی دڵارایان ڕاپێچی لێپێچینەوە کرد و کچەیان لە ژوورەکە دەرێنا کە هەموو گیانی لە پاشماوەی لێدانەکەدا شین داگەڕابوو.

لەم لاوەش سوهەیل هەر لەنێو ژوورەکە دابوو، لە کاتی دەست پێکردنی شۆڕشەکە تا ئێستا لوقمە نانێك یاوەخۆ قومە ئاوێك بەر گەرووی نەکەوتبوو. هەرچی توانا و تین هەیە لە جەستەیدا بوونی نەمابوو، لەنێو ژوورەکەدا بە چەشنێ پاڵ کەوتبوو کە سوێندت دەخوارد گیانی تێدا نییە. هیوای بەوە نەبوو تازە دەرگاکەی لێ

بکرێتەوە بۆیە بە ناچاری چاوەڕێی ئەوەی دەکرد فریشتەیەك لە فریشتەکان ببینێ و گیانەکەی لێ وەرگرێ. فرمێسکی بۆ ئەوە دەڕشت کە دایك و باوکی نەیانتوانی بە جلی حەکیمانەوە بیبینن، ئەو ئاواتەی لە منداڵیەوە هەیبوو بۆ بوون بە حەکیم لە گۆڕیان نا. خوێندنی ئەم هەموو ساڵەیان چەند بە ئاسانی کوشت و نەیان هێشت بەروبوومی هەبێ. کەسانێکی توندڕەو هەن هەمیشە دەیانەوێ جوانیەکان بکوژن و لەنێوی بەرن. ئاخر ئەوان کوا دەزانن جوانی چی یە، چووزانن لە پشکووتنی گوڵێك ڕابمێنن، ئەوان لەسەر لێکردنەوە و قرتاندنی خونچەکان پەروەردە کراون. کەسێ نەبووە پێیان بێژێ بۆچی ژیان لەم خونچەیە دەسێنیەوە و ناهێڵی وەکو گوڵەکانی دی جوانی و بۆنە خۆشەکەی پەخش بکاتەوە و پێ بگا. ئاخر ئەو لەنێو باغەکەدا چ زیانێکی هەبوو جگە لەوەی هەوڵی دەدا جوانیەکانت نیشان بدا. لەلایەکی دیش لەبەر خۆیەوە لێوەکانی دەجووڵاند و دوایین ماڵئاوایی لە خاتوو پریاسکە دەکرد و دەیگوت:

ئەی خۆرەکەم، ئەی خوێنبەری ڕەگەکانم، ئەی ئەوەی لەژینی دونیادا هەوڵم دەدا پێت بگەم و یەکێ بووی لە ئاوات و ئارەزووە جوانەکانم. ئەوا من دەڕۆم و ئیدی لێرە ناتبینمەوە. حەزم دەکرد هێشتا ژیابام و توانیبام بتهێنم و شەوێك لەو شەوانەی هەموو لە شیرینی خەودان لەگەڵتدا پیاسەیەکی سەر کانیەکەمان کردبا



و لەبەر تریفەی مانگەکە پاڵکەوتباین. هەر لەو دەمەی ئەو شیعرەی گۆرانم ژنەوتووە کە دەڵێ:

کانیەکی ڕوونی بەر تریفەی مـــانگەشــەو
لـــەبــنـــیـــا بــلەرزێ مرواری زیخ و چەو
جوانترە لەلای من لە دەریای بـــێ ســنــوور
شەپۆلی باتەبەر تیشکی ڕۆژ شڵپ و هووڕ

هەر لەو دەمەوە لەگەڵ تۆدا حەزم لە پیاسەیەکی سەر کانیەکە بووە، وەلێ ببوورە کە نەمتوانی، بۆ هەموو شتێك داوای لێبوردنت لێ دەکەم ئازیزەکەم. هیوام وایە ئەم دیدەنیە بکەوێتە ڕۆژی پەسڵان. دەزانی دڵم بەم شیعرەی مەولەوی خۆشە کە گوتی:

بــیــنـــایی دیدەم تـۆ وە سڵامەت
دیدەنی دیدار کەوت ئەو قیامەت

دەی با ئەم دیدارە بۆ ئەوکات بێ، دەبێ چەندە خۆش بێ گەر لەوێ لەگەڵ تۆدا

پۆشاکی ئارمووشی[1] سەوز بپۆشین و بە جۆرەها مرواری و یاقووت نەخشێنرابین و لەسەر کورسی و قەنەفە ڕازاوە گرانبەهاکان ڕووبەڕووی یەك ڕووبنیشین. ئینجا لقی دارەکان لەملاو لامان شۆڕببنەوە و سێبەری درێژ و فێنکمان لەسەر سەری

---

(١) ئارمووش: ئاوریشم

چێ بکەن. ناوە ناوە دەستمان بۆ میوە تازە و تەڕەکان ببەین کە نزیکن لە دەستەکانمان و دەمی مرۆی ئاوی لێ دەچۆڕێ بۆیان. ئینجا لە سوڕاحی و دۆلکەی زیوین دا شەڕابی ڕەنگ ئاڵمان بۆ بکرێتە نێو کوپ و بەرداخی چێکراو لە شووشە و کریستاڵی نایاب. دواتر تێکەڵەی زەنجەبیلمان پێ بدرێ کە لە سەرچاوەی سەلسەبیلەوە هەڵقوڵابێ[1]. ئینجا مێرد منداڵانێکی هەمیشە جوان و پاك بە دەورماندا بێن و بچن کە لە بینینیاندا هێندە چێژ ببینین وا هەست بکەین مرواری و گەوهەرن بەم ناوەدا پەخش و بڵاو کراونەتەوە. یان دەبێ چەندە خۆش بێ ئەو دەمەی هەردوو دەچینە سەر حەوزی کەوسەر و بەو کوپانەی کە چەشنی ئەستێرەکان جوان و ئاورینگدارن[2] خۆمان تێراو و تەڕ بکەینەوە بە ئاوێکی لە شیر سپی تر و لە هەنگوین شیرین و تامدار تر و لە میسك بۆن خۆشتر. ئاوێك لەبری زیخ و چەو پڕیەتی لە دوڕ و مەرجان، ئاوێك کە خۆڵی لێوارەکەی ئاڵتوونە، ئای دەبێ چ دڵخۆشیەك بێ! دەبا بۆ ئەم چەشنە خۆشیە کار بکەن ئەوانەی کە کار دەکەن.

ناوە ناوە سوهەیل لە قسە دەوەستا و تەڕایی لە گەروویدا بە تەواوی وشکی کردبوو، ئینجا بۆ تاوێك لەوێدا بێدەنگ بوو

---

(١) تێکەڵەی زەنجەبیل جۆرە شەڕابێکە دەرخواردی بەهەشتیان دەدرێ کە بە سەرچاوەکەی دەگوترێت سەلسەبیل و لە سوورەتی ئینسان باسی لێوە کراوە.

(٢) ئاورینگدار: بریسکەدار

بۆ ئەوەی دوایین فرمێسکەکانی بڕێژێ، خەریك بوو بە تەواوی هۆشی دەڕۆیی، لەپڕدا لەگەڵ دەنگێك وەهۆش هاتەوە کە گوتی:

فرمێسکەکانت بسڕە و غەمبار مەبە هاوڕێ.

بە تەواوی ترسا لەوەی مردبێ و ئەمە دەنگی یەکێ لە فریشتەکان بێ، لێ لە دەنگێکی میهرەبان دەچوو.

خێرا سوهەیل هاتە گۆ: تۆ کێی ئەی خاوەنی دەنگ؟ پێم بێژە ئایا من مردووم؟

ئەو دەمەی تۆزێ لای کردەوە ڕوانی گەنجێکە کە وێدەچوو هەر لە تەمەنی خۆیدا بێ، لێ لەبەر ئەوەی وێنەکە لای چەپ و چێڕ دەبوویەوە جوانی نەدەدیت. سوهەیل دووبارە لێی پرسیەوە: پێم بێژە تۆ کام لە فریشتەکانی؟ زۆرم تینووە، هیچ ئاوێکت لایە بیخۆمەوە؟

گەنجەکە هاتە دەنگ: چۆن دەبێ هاوڕێ هاوڕێی خۆی نەناسێتەوە، ئەوە منم سوهەیل، قیدارم قیدار، ئایا منت بیر نەماوە؟

لەو دەمەدا سوهەیلی پیر وازی لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە هێنا و هەناسەیەکی قووڵی هەڵمژی و دواتر بە کچەی هەڵاتووی گوت: پێم خۆشە بەر لەوەی باسی یەك بینینەوەی قیدار و سوهەیل بکەین دوو سێ دانە لە دێڕەکانی پێشەوا بوسیرییت بۆ بخوێنمەوە.

- ئای مامە گیان، هەرچەندە لە شوێنێك ڕاتگرتم كە زۆر پەرۆشم دواترەكەی بزانم، وەلێ خوێندنەوەی ئەم چەكامەیەش لام زۆر گرنگە. زۆرت سوپاس دەكەم گەر بۆمی وەخوێنی.

+ زۆرچاكە كچم، پێشەوا بوسیرِی لە سەرەتای چەكامەكەیدا دەفەرموێ:

ئـايــا هـاوەڵانی خــۆت بیركەوتەوە لای سەلەم
بۆیە وا تێكەڵت كرد فرمێسكی چاوت بە دەم؟[1]

دیارە بوسیرِی لە كاتی نووسینی ئەم دێڕەدا لە گریانێكی زۆر قووڵدا بووە، بۆیە هەڵساوە ڕووبەڕووی خۆی بۆتەوە و پرسیار لە خودی خۆی دەكا و دەیەوێ لە هۆكاری ئەم گریانە حاڵی بێ و بزانێ چاوەكانی چیان لێهاتووە و بۆ ئاوەها بەكوڵ دەگرین. لەبەر ئەمە لێكۆڵینەوەیەكی توند لەگەڵ خۆیدا دەكات و دەفەرموێ: ئەی بوسیرِی بۆچی دەگری، ئایا عاشق بووی؟ ئەی ئەگەر عاشق نەبووی كەواتە ئەم گریانەت لە چی یە؟ ئایا دارەكەی سەلەم تۆی گریاند؟ ئەو دارەی زۆرجار خۆشەویست و دۆستەكانت دەهاتنە ژێری و لەوێدا ڕادەكشان و ماندوو بوونیان دەحەساندەوە، ئێستا ئەو دەمەی دەڕوانیتە دارەكە و خۆشەویستەكەت لەژێریدا نابینی و سەیر دەكەی دارەكە بێ خاوەن و هەتیو ماوەتەوە

---

(١) دەقە عەرەبیەكەی بریتیە لە: أَمِن تَذَكُّرِ جيرانٍ بِذي سَلَمِ مَزَجتَ دَمعاً جَرى مِن مُقلَةٍ بِدَمِ

چون ئەو لێرە نییە، بۆیە وا دڵت گەرم دەبێ و فرمێسکەکانت کە لە گلێنەی چاوتەوە دا دەبارن لەگەڵ خوێندا تێکەڵی دەکەی و بەسەر گۆناکانت دا دەخزێن. ئایا ئەگەر عاشق نەبای ئەم فرمێسکانە چۆن ئاوا دادەبارین و لەگەڵ خوێندا ئاوێتە دەبوون؟

- یانی هەر بەڕاستی پێشەوا بوسیری کاتێك ئەو درەختەی هاتۆتەوە یاد هێندە گریاوە کە فرمێسك و خوێن لە چاوەکانی هاتوونەتە خوار؟! هەر بەڕاستی خوێن لە چاوی مرۆی عاشق دێ یان ئەمە تەنێ داستانێکە؟

+ کچی خۆم... ئەو کاتەی گەرمایی نێو گیانی مرۆڤی عاشق زیاد دەکا و هەست بە سووتانێکی بەهێز دەکا لەنێو هەناویدا، ئا لەم کاتەدا تەڕایەتی لەشی ئەم مرۆڤە کەم دەبێتەوە، ئەو دەمەی تەڕیەکەی کەم بوویەوە و ئەم عاشقەش گریەکەی هەر نەپچڕاند ئیدی شتێك نامێنێ بە نێوی فرمێسك و ئاو کە لە چاوانی بێنە خوارێ و ئەویش هێشتا هەر بەردەوامە لە گریان. لەو دەمەدا خوێن لە چاوەکانی دێنە دەرێ و لەگەڵ ئەم ئاوەی کە لەسەر کوڵمەکانی گردبووەتەوە تێکەڵی یەك دەبن. ئینجا ئەگەر ئەم عاشقە هەر دەستی هەڵنەگرت ئەوا خوێنەکەش وشك دەبێ و ئاوێکی سپی لە چاوانی دێ کە پێی دەگوترێ فرمێسکی تازە و گەنج.

ئینجا ئەمەش بزانە کە فرمێسکیش کاتێ لە خۆشیدا دێتە دەرێ ئاوێکی ساردە، لێ ئەو فرمێسکەی لە ناڕەحەتیدا دەیڕژێنی

گەرمە. دیارە کە پێشەوا بوسیرِیش هێندە عاشق بووە کە خۆی بەم بارەدا تێپەڕیوە و خوێن لە چاوەکانیدا ڕژاوە.

ئەمە لەنێو شاعیرانی کوردیش نموونەی زۆرە، هەروەکو تایەر بەگی جاف دەفەرموێ:

سەد کەڕەت ئیمڕۆ لە دووریت خوێن لە چاوم جاریە

غەڕقی دەریای ئەشکی خوێنم شەمسی خوبانم وەرە

- باشە بیرکەوتنەوەی درەختێك ئاوا خوێن لە چاوانی مرۆڤ دێنێ؟

+ درەختەکە نا، کەسەکەی لەژێریدا دانیشتووە گرنگە. هەندێ شت هەن بەهۆی شتانی دیکەوە پیرۆز و گەورە دەبن دەنا خۆیان بایەخێکی ئەوتۆیان نییە. ئەم کتێبانەی دەیانبینی بەهۆی نووسینەکەی ناویانەوەیە بە بایەخن، گەر نووسینەکەیان لێ دەربێنی تەنێ چەند پەڕاوێکی بێ بایەخت بۆ دەمێنێتەوە. مرۆڤ بەهۆی ڕۆحەکەی بایەخدارە، گەر ڕۆژێ ڕۆحەکەی دەرهات جەستەیەکی ڕەق و ڕووتت بۆ دەمێنێتەوە. دەزانی جوداوازی نێوان پەرستگا و مەیخانە چی یە؟ هەردوو هەر پارچەیەك زەوین، ئەمما بەهۆی مرۆیەکانە کە ئەمیان بایەخدار بووە و ئەمیشیان بێ بایەخ. ئەگەر ئەو پەرستشەی لە پەرستگادا کرا لە مەیخانەکە بکرێ و ئەو مەیخۆریەی لە مەیخانەکە دەکرێ لە پەرستگادا کرا، ئەو دەمە مەیخانەکە لە پەرستگاکە پیرۆزترە

بەهۆی ئەو کارەی تێیدا دەکرێ و ناوەکانیشیان ئاوەژۆ دەبنەوە. کچی خۆم.... هەر شوێنێك مەعشووقی تێدابێ جێگاکەش بەهۆی ئەو مەعشووقەوە موبارەك دەبێ، چون ئەوی لێ دانیشتووە. مەعشووق بە هەر شەقامێکدا بڕوا گوڵڕێژی دەکا. لە هەر کانیەکدا ئاو بخواتەوە دەیکاتە ئاوی حەیات، تەنانەت گەر لەسەر خۆڵ و مڵدا[١] ڕووبنیشێ سەوزی دەکا. ڕۆژێك لە ڕۆژان پێی لە جێگایەك دانابێ خۆڵی ئەم جێگایە دەکرێتە کل و عاشقان لە چاویانی دەکەن. ئەو وڵاتەی ئەوی گرتۆتە خۆ خۆشەویستە، ئەو شارە و ئەو گەڕەکەی ئەوی تێدایە خۆشەویستە، تەنانەت ئەو کۆڵانەی ئەوی تێدایە خۆشەویستە. هاوڕێ و هەموو کەس و کارەکانی ئەو خۆشەویستن. دراوسێ و تەنانەت باڵندە و سەگی ماڵ و کۆڵانەکەشی خۆشەویستە. ئیدی چۆن دارێك کە ئەوی لەژێر دابنیشێ خۆشەویست نابێ؟!

ئینجا پێشەوا بوسیری ئاماژە بۆ دوو هۆکاری تر دەکا کە بوونەتە هۆی گریانەکەی و دەفەرموێ:

یــاوەخۆ بــا هەڵی کرد لـــەلای کازیمەی یـــارت

بروسکیش شەوقی داوە لای ئیزەم شەوی تارت؟[٢]

---

(١) مڵ: لیم

(٢) عەرەبیەکەی:

أَم هَبَّتِ الرِّيحُ مِن تِلقاءِ كاظِمَةٍ        وَ أَومَضَ البَرقُ في الظَّلماءِ مِن إضَمِ

ئەی بوسیرِی، باشە گریان گریانەکەت بەهۆی ئەم درەختە نەبوو کە باسمان کرد، گریان عاشقیش نەبووی، ئەدی هۆکارەکەی چی یە ئاوا فرمێسك و خوێنت تێکەڵ کردووە؟ ئایا هۆکار هەر درەختەکەیە؟ یاخود هۆکاری گریانەکەت بەهۆی ئەو بایەوە بوو کە لەلای کازیمەوە هەڵی کرد و شوێنێکە خۆشەویستەکەت تێیدا ژیاوە؟ یانیش هۆکاری گریانەکەت بەهۆی ئەوە بوو کە برووسك بریسکەی داوە لە شەوێکی تاریکدا لەلای کێوی ئیزەم، کە کێوێکە مەعشووقەکەت زۆر سەردانی دەکرد و کاتەکانی خۆی لەوێدا بەسەر دەبرد؟

- چەند سەیرە! کەواتە هۆکاری گریانەکەی پێشەوا بوسیرِی چی یە؟ ئایا درەختەکەیە، یان بایەکەیە، یان برووسکەکە؟ باشە باسی درەختەکەت کرد، ئەی پێم بڵێ چۆن با و برووسك دەبنە هۆی گریانی مرۆڤ؟

+ کچی شیرینم، هەر کاتێك بای سەبا لەلای مەعشووقەوە بۆ لای عاشق بێ، ئەوا بیرکردنەوەی ئەم عاشقە دەکەوێتە جووڵە و تووشی پەشێوی و گریانی دەکا، چون عاشق هەست دەکا ئەم بایە بۆنی زوڵف و ئەگریجە و خەت و خاڵی دولبەرەکەی پێیە و لەگەڵ خۆیدا بە دیاری بۆ لای ئەو هێناویەتی، بۆیە بەرگە ناگرێ و لەپرمەی گریانێ دەدا. زۆرجاریش عاشقان بە خەیاڵ پەیامی دڵ و ئێش و ژانیان بە بای سەبا بۆ دولبەریان ڕەوان دەکەن.



- لە عیشقدا بۆن شتێکی هێندە گرنگە؟!

+ بەڵێ کچم، عاشق لە دووری هەزاران میل دەتوانێ بۆنی دولبەرەکەی بکا، بەگوێرەی توندی عیشقەکەی. مەگەر نەتبیستووە حەزرەتی یەعقوب لەکوێوە بۆنی یوسفی کرد؟ ئەی نەتبیستووە هەر بە بۆنی کراسەکەی چاوەکانی بیناییان بۆ گەڕایەوە؟ بۆنی مەعشووق لەنێو هەزاران بۆنی دی دیارە. عاشق ئەو عاشقەیە گەر چاوەکانیان بەستا و هەزاران کەسیان هێنا و لە بەرامبەریدا ڕایان گرت تەنها بە بۆنەکەی مەعشووقەکەی بناسێتەوە و بڕوا بۆلای، بەبێ ئەوەی هەنگاوێك بە هەڵە پێ لە شوێنێکی دیکە دابنێ.

ئەی نەتبیستووە ئەحمەد موختار جافیش فەرمووی:

بە ئومێدی ئەوەی جانا کە بۆنی زوڵفی تۆی لێبێ
سەر وماڵم بکەم قــوربانی ڕێی بادی سەبا چاکە

- باشە زانیمـان با لەلای عــاشــق گرنگە چــونکە بۆنی مەعشووقەکەی پێیە، ئەی گرنگی برووسکەکە لەچی دایە؟

+ کچەکەم... گوتمان هەر شوێنێك مەعشووقی تێدابێ ئەم شوێنە پیرۆز و گرنگە لەلای عاشق، ئینجا ئەو دەمەی تۆ ڕوانیت وا برووسك لەم شاخەی دا کە هەموو جار مەعشووقەکەت بەسەریدا هەڵدەزنا، بە ڕووناکی ئەم برووسکە شاخەکەت بە

تەواوی بۆ نومایان بوو[١]، یان برووسك لەلای ماڵی دولبەرەكەتدا بریسكەی داوە و ئەوێی ڕۆشن كردەوە، بێگومان ئەو كاتەت دێتەوە یاد كە خۆشەویستەكەت لەوێدا هاتوچۆی دەكرد، ئێستا كە ئەو نەماوە ئەتۆ دڵت پڕ دەبێت و فرمێسكی خوێنین لە چاوەكانت جاری دەبن.

دێڕێكی دیت بۆ دەخوێنمەوە و دەگەڕێینەوە سەر ڕۆمانەكەمان. پێشەوا بوسیری دادگایەكی تۆكمە بۆ خۆی دادەنێ و دەیەوێ بە نەفسەكەی بسەلمێنێ كە بەڕاستی ئەو عاشق بووە، وەلێ نەفسەكەی هەر لاملی دەكا و دان بەو بابەتەدا ناهێنێ، چونكە ڕەوش و نەریتی عاشقان هەر وایە كە لە سەرەتادا عیشقەكەیان دەشارنەوە. دووبارە پرسیار لەخۆی دەكاتەوە و دەفەرموێ:

چاوەكانت چیانە گەر بڵێی بەس پڕ دەبـــێ؟
دڵت بۆچی ڕایگری ئـــاوا غەرقی گڕ دەبێ؟[٢]

ئەی بوسیری ئەگەر دان ناهێنی كە تۆ عاشقی و گریانەكەت بەهۆی دارەكە و بایەكە و برووسكەكە نییە كە خۆشەویستەكەتیان هێناوەتەوە خەیاڵت، ئەی باشە پێم بڵێ بۆچی دەسەڵاتت بەسەر چاو و دڵی خۆتدا نەماوە؟ بۆچی ئەو دەمەی بە چاوەكانت دەڵێی

---

(١) نومایان: دەركەوتن

(٢) عەرەبییەكەی:

فَما لِعَينَيكَ إن قُلتَ اكفُفا هَمَّتا     وَما لِقَلبِكَ إن قُلتَ استَفِق يَهِمِ

ڕاوەستن و ڕۆندك مەڕێژن ئەوان گوێڕایەڵت نابن و پتر دەیڕێژن؟ ئەی ئەگەر ئەمە عیشق نەبێ چی یە؟! ئەی باشە ئەوە چ شتێکە وای لە دڵت کردووە ئەگەر پێی بێژی ڕاوەستە و هۆشیار بەوە و سارد بەرەوە گوێڕایەڵت نابێ و پتر دادەمێنێ و نوقمی نێو ئازار و خەم دەبێ؟ دیارە دەرچوونی چاو و دڵت لەژێر دەسەڵاتی خۆت نیشانەی ئەوەیە کە تۆ عاشق بووی. ئەگەر عاشق نەبای چاو و دڵی خۆت بۆ ڕام دەکرا و دەتتوانی ڕایان بگری. بۆیە مرۆی عاشق ئەو دەمەی مەعشووقەکەی خۆی دێتەوە خەیاڵ بێگومان دەست دەکا بە لەرزین و گریان و ڕەنگ زەردی، هەروەك حاڵی زۆربەی هاوەڵەکان بەم چەشنەبوو ئەو دەمەی نێردراوی مەزنیان دەهاتەوە خەیاڵ و خۆیان بۆ ڕانەدەگیرا و دەگریان و ڕەنگی ڕوخساریان دەپەڕی.

نالیش ئەو دەمەی چاوەکانی لەژێر دەسەڵاتی خۆی دەردەچن و بێ ئەندازە فرمێسك دەڕێژن دەفەرموێ:

بێ مەحابا ئاو دەڕێژێ گەهـ بە فەور و گەهـ بە دەور
چـــــاوی مــن مووددێکە شـێوەی ئـابــشاری گرتووە

واتا چاوەکانم بەبێ ئەوەی کاتێکی دیاری کراوی هەبێ جارو بار بەپەلە و جارو بار بە نۆبە فرمێسك دەڕێژێ. وادیارە لە دەسەڵاتی من دەرچووە و ماوەیەکە وەکو تاڤگەی لێهاتووە و ئاوی لەبەر دەڕوا.

**ئەوەتا دەبینین حافزیش بە هەمان شێوە ئەو دەمەی دڵەکەی لە دەسەڵاتی خۆیدا نامێنێ دەفەرموێ:**

دڵ لە دەستم دەردەچێ توخودا ساحێب دڵان

حەیفە لێم ئاشکرابێ بەم چەشنە ڕازی پەنهـان

**ئینجا جارێ ئەم سێ دێڕە بەس بێ و با بێینەوە سەر بابەتەکەی خۆمان کچم، ئایا ئامادەی؟**

**- بەڵێ مامە گیان زۆریش تامەزرۆم، بفەرموو.**



## عیشقەکەی دڵارا و گەڕانەوەی قیدار

ئەو دەمەی سوهەیل لەوپەڕی ناڕەحەتی و تینوویەتیدا ئەم دەنگەی ژنەوت و پرسیاری کرد کە دەنگی کێیە، خێرا گەنجەکە هاتە گۆ و گوتی:

قیدارم قیدار سوهەیل، چۆن هاوڕێ هاوڕێی خۆی لەیاد دەچێتەوە؟ لەبیرت چوو کە تۆم بەفێڵ بردە سەر شاخەکە؟ ئەدی ئەو دەمەی چووینە سەر کانی ئافرەتەکان و تووشی کێشەم کردی؟ ئەوانەت بۆ قەرەبوو دەکەمەوە هاوڕێ، من بەهۆی تۆوە باوەڕم هێنا، بۆیە تا ئێستا لەیادم نەکردووی. هەڵسە و تۆزێ هێز بدە خۆت و ئەم بەرەی سەر زەویەکە لادە، لە سووچی لای چەپەوە ژێر زەمینێکی لێیە و بەوێ خۆت ڕزگارکە و بڕۆ دەرێ.

سوهەیل بەم گوتانە فرمێسك لە چاوانی جاری بوون و بە بێتاقەتیەوە گوتی:

ئەوە تۆی هاوڕێی جنۆکەم، ئەو هەموو ماوەیە لەکوێ بووی؟ زۆرم حەزدەکرد ڕۆژێ بتبینمەوە. ئەی هاوار تۆ چ فریادڕەسێ بووی لەم دەمە کە حەکیمی مەزن ناردی بۆم.

- من لەو کاتەی باوەڕم هێنا تووشی کێشەیەکی زۆر هاتم لەگەڵ جنە بێ باوەڕەکاندا سوهەیل، ئەوان کوڕە تاقانەکەی



منیان کوشت و لەبەر چاوم هەنجن هەنجنیان کرد، وەلێ ئەم شەڕە کۆتایی نەهاتووە و تۆڵەیان لێ دەکەمەوە، دڵنیابە تۆڵەی خۆم دەکەمەوە لەم مێملانە[1] هاوڕێ. تۆ ئێستا هەڵسە و خۆت ڕزگار بکە دواتر قسە دەکەین و زۆر شتت پێ دەڵێم.

+ بەڵام زۆر لەوە کەم تواناترم کە هەڵسم، هەر دەڵێی گیانم لەبەردا نەماوە قیدار، چی بکەم؟

لەو کاتەدا قیدار جۆرە ویردێکی نیشانی سوهەیلدا کە بیلێت و لەکاتی گوتنی ئەم ویردەدا کەم کەمە تین بۆ لەشی سوهەیل دەگەڕایەوە.

- دانیالی پیر لەحاڵی تۆ ئاگاداری کردم و پێی گوتم کە ئەگەر توانای نەبوو ئەم ویردەی پێ بدە. من چەند ساڵێکە قوتابی و موریدی جەنابیانم.

سوهەیل چەند جارێك لەبەر خۆیدا ویردەکەی گوت و هێواش هێواش هەڵسایەوە سەر پێ. خێرا بەڕەکەی لەسەر زەویەکە لادا و ژێر زەمینەکەی لە سووچەکەی چەپدا دۆزیەوە، لێ چەندی کردی ئاسنەکەی سەری بۆ بەرز نەدەکرایەوە، چون هێشتا پێویستی بە توانا هەبوو.

---

(١) مێملانە: دوژمن

- ویردەکە سوهەیل ویردەکە، بەردەوام بە لە گوتنی و تینی زیاتر بدە خۆت.

سوهەیل بە هەموو توانای دەنگی بەرز دەکردەوە و ویردەکەی دەخوێند و دەستەکانی خستبوونە ژێری ئاسنەکە و هەوڵی بەرزکردنەوەی دەدا، لەملاوەش قیدار دنەی[1] دەدا و پڕ بە دەنگی هاواری دەکرد. لەنکاو ئاسنەکە لە جێگاکەی خۆی هەڵقەنا و خەریك بوو بەسەر دەستەکانیدا بکەوێ. سوهەیل بە هەناسە بڕکێوە لە شوێنی خۆیدا خۆی خستە سەر گازی پشتێ تاوەکو تۆزێ ماندووی حەسایەوە، ئینجا خێرا خۆی هەڵدا ژێر زەمینەکە و لەوێشدا ڕێگایەك بۆ دەرێ چێ کرابوو. سوهەیل بە ڕێگاکەدا ڕۆیی تاوەکو گەیشتە سەرەکەی، لەوێوە ئاسنێکی دیکە هەبوو بەحاڵ بەرزی کردەوە و هاتە دەرێ. چون هێز و تینی لەبەر بڕابوو دووبارە لە شوێنەکەیدا پاڵکەوت و لەملاوەش قیدار بەردەوام بوو لەسەر دنە دانی کە ویردەکە بخوێنێ. بەم چەشنە قیدار وازی لە سوهەیل نەهێنا تاوەکو وردە وردە بەرەو ڕێگای ماڵێی برد. ئەو دەمەی تۆزێ نزیك بوویەوە خۆی لەسەر پێیەکانی ڕانەدەگرت و ناوە ناوە هەڵدەستایەوە و بەردەبوویەوە، باشبوو چەند پیاوێك کە بینیان بە هانای هاتن و دەستیان خستە ژێر باڵی و بردیانەوە ماڵێ.

---

(١) دنەدان: هاندان



کاتێ دایك و باوکی بەم چەشنە چاویان بە سوهەیل کەوت زۆری بۆ گریان و باوکی گوتی کە دەبێ بچمە لای پادشا و شکات بکەم و بزانم کێ یە دووجارە ئاوا هەوڵی کوشتنی کوڕەکەم دەدا، لێ سوهەیل پێی گوت کە پێویست ناکا، چون ئەو حاڵی باشە و دواتر ئێمە نازانین کێ ئەم کارەی کردووە تا شکاتی لێ بکەین.

سوهەیل چەند ڕۆژێك بەهۆی نەخۆشی نەیتوانی بێتە دەرێ، وەلێ کە ژنەوتی شۆڕشەکەی کچان سەری گرتووە گەلێکی کەیف هات و ئێش و ئازارەکەی خۆی لەیاد کرد.

ئیدی لە شاهێندا دەست کرا بە دروستکردنی حیکمەتخانە بۆ کچان و جاڕ درا کە ئەو کچانەی توانا و زیرەکیان تێدایە دەتوانن بێن خۆیان ناونووس بکەن لە قوتابخانەی مەزنی حیکمەت و بچنە بەر تاقیکردنەوەی وەرگرتن، وەلێ بێ لە حیکمەتخانەی مەزن هێشتا حیکمەتخانەکانی دی لەژێر بنیات نان بوون و ئەوان تاقیکردنەوەیان نەدەویست و هەر کچێ مەیلی لێبا وەردەگیرا. ئەم بابەتە حەکیم ناسڕی هێندە تووڕە کردبوو کە خەریك بوو جەڵتەی لێ دەدا لەتاوان، ئەگەرچی ڕێی ئەویشی نەگرتبوو، چون حیکمەتخانەکە کرابوویە بەش بەش و کچ و کوڕەکان تێکەڵاوی یەکدی نەدەبوون. هەموو کچەکان بە لەچك و جلی پۆشتەوە دەهاتنە حیکمەتخانە کە ئەمە یەکێ بوو لە یاساکانی ئەوێ. ئێستا حیکمەتخانەکە ببوویە سێ بەش، دوو بەش بۆ کوڕان کە پێکهاتبوو لە بەشی حەکیمە کۆنەکان و بەشی کۆمەڵەکەی

حەكیم ناسڕ، لەگەڵ بەشی كچاندا كە هەر حەكیمە كۆنەكان وانەیان پێ دەگوتن و حەكیم ناسڕ و كۆمەڵەكەی نزیكی ئەم بەشە نەدەبوون و نەفرەتیان لێ دەكرد.

سوهەیل ئەو دەمەی هاتەوە خۆی وەڕێ كەوتەوە بۆ حیكمەتخانە و لەڕێگادا قیداری تووش بوو هەر لە وێنەی جاراندا كە بەرەو ڕووی پێدەكەنی.

+ ها برادەر دیسان تۆی، كورە وەڵا ئەم چاكەیەت لەیاد ناكەم قیدار گیان. قەرەبووی ڕابردووت زۆر بە باشی بۆ كردمەوە، ئەم هەموو ماوەیە لەكوێ بووی؟

- دەنگت هێواش بكە با خەڵك نەڵێن شێتی، چون هەر تۆ من دەبینی. سوهەیل گیان، من لە یادم نەكردووی و بەردەوام ئاگادارت بووم، وەلێ منیش گەورەیەكم هەیە و نەمتوانیوە بەبێ پرسی ئەو خۆمت نیشان بدەم. بەبیرت دێ ئەو دەمەی خەریك بوو هیلال بخنكێ دەنگێ هاتە بەر گوێچكەت و ئاگاداری كردیەوە؟

+ بەڵێ بەڵێ زۆر باشم لەیادە، ناكا تۆ بووبی ئەم دەنگە؟

- بەڵێ سوهەیل ئەوە من بووم و لەو كاتەوە چاودێریم كردووی، ئەو دەمەشی كە نەیارەكانت لێیان دای من بووم لەژێر ئاوەكە ماسیەكانم دەترساند و وام كرد كە مام وسو هیچ ماسیەكی بۆ نەگیرێ، بۆ ئەوەی بمێنێتەوە و تۆ ڕزگار بكا، من هەمیشە

لەگەڵت بووم سوهەیلی برا. مامۆستای گەورەمان دانیالی حەکیم پێی گوتم کە یارمەتیت بدەم.

+ وەلێ حەکیم دانیال چۆن بە حاڵی منی زانیوە؟!

- ئەو پیاوێکی زۆر گەورەیە سوهەیل، هیچ بنیادەمێکم نەدیوە لەم سەردەمەی ئێستا هێندەی ئەو نزیك بێ لە حەکیمی مەزن. ئەو یەکێکە لەوانەی کە حەکیمی مەزن پەردەی لەسەر زۆر چشت بۆ لاداوە.

+ ئەوە چ قسەیەکە قیدار! من زانیومە پەردە تەنێ بۆ نێردراوان لابدرێ؟!

- نەخێر سوهەیل، دەکرێ شوێنکەوتەی نێردراوەکانیش ئەمەیان بۆ بکرێ، مەگەر چیرۆکی ئەم پیاوەت نەبیستووە لە کتێبە پیرۆزەکەماندا کە یەکێك لە نێردراوان دەچێتە لای و پێی دەفەرموێ (ئایا شوێنت بکەوم تا لەو زانستەی حەکیمی مەزن پێیداوی منیش فێربکەی؟[1])، ئەمە زانستێك بوو تایبەت حەکیمی مەزن فێری ئەوی کردبوو لەکاتێکدا ئەو نێردراویش نەبوو. بەڵێ ئەمە جۆرە زانستێکە تەنێ هێندێ بەندەی تایبەت پێیان دەدرێ و حەکیمی مەزن پەردەیان بۆ لادەدا.

---

(١) بڕوانە سووڕەتی کەهف، ئایەتی ٦٦.



+ سەيرە! هەر دەڵێی یەکەم جارە ئەم دەقە ببیستم، کەواتە ئەو بەهۆی ئەم زانستەوە ئاگای لە حاڵی من بووە.

- بەڵێ ئەو زۆرجار باسی دەکردی و بە مرۆیەکی چاك و دڵسۆز ناوی دێنای، چەند جارێك پێی گوتووم کە ئاگام لێت بێ، چون تۆ کۆتا موریدی ئەوی.

ئامۆژگاریم ئەوەیە زوو خۆتی پێ بگەیەنە تاوەکو لە ژیاندا ماوە، ئەو زۆر پیر بووە سوهەیل.

+ هەر ئەمڕۆ هەوڵدەدەم بگەمە خزمەتی، ئایا دانیالی پیر هیچ قسەیەکی لەسەر ئەم شۆڕشە هەبوو؟

- زۆری قسە لەسەر نەکرد، تەنێ گوتی مافی خۆیانە ئەوانیش بخوێنن و شوێنیان بۆ دابین بکرێ، بەو مەرجەی تێکەڵاوی و بێ شەرمی ڕوونەدا.

+ زۆرچاکە قیداری برا، من درەنگمە و دەبێ بچمە ژووری، ماڵئاوا جارێ، وەلێ خۆتم لێ ون نەکەی.

- نا نا سوهەیل، تازە ئێمە براین و زوو زوو سەرت لێ دەدەین ئینشاڵا.

سوهەیل ئەو دەمەی چوویە ژوورێ هەر لە پشتی دەرگاکەوە دڵارا و هێلین ڕووبەڕووی هاتن، دیاربوو بۆ ئەوە هاتبوون کە وەربگیرێن.

شەرمی کرد و ویستی خۆی لێیان بدزێتەوە، وەلێ هێلین بە دەنگی بەرز بانگی کرد:

کاك سوهەیل.. کاك سوهەیل.. دەڵێی نامان ناسیەوە؟

سوهەیل بە ناچاری بەرەو ڕوویان ڕۆیی و گوتی: با با چاکتان دەناسمەوە، حاڵتان چۆنە باشن؟

- شوکر زۆر باشین کاك سوهەیل، ئەو ڕۆژە تۆم لەنێو شۆڕشەکە نەبینیەوە خێربوو؟

+ هیچ نەبوو، بەدوای خاتوو دڵارا داچووم و ترسام شتێکی لێ هاتبێ، دواتر تووشی هەندێ کێشە بووم و نەمتوانی بگەڕێمەوە. ئەرێ بەڕاست خاتوو دڵارا سەلامەت بوو ئەو ڕۆژە؟ زۆر بۆی نیگەران بووم، یانی ویستم بڵێم ترسام شتێکیان لێ کردبێ.

ئەو دەمەی سوهەیل گوتی بۆی نیگەران بووم خێرا هێلین سەیرێکی دڵارای کرد و تاکە برۆیەکی بۆ بەرز کردەوە و بەڕوویدا پێکەنی، دڵاراش سەری بەردایەوە و هیچی نەگوت.

- دەزانم دەزانم کاك سوهەیل کە نیگەران بوون، لەڕاستیدا مامەکانی ڕێگریان لێ کردبوو کە لە شۆڕشەکە بەژداربێ.

+ دەی گرنگ ئەوەیە سەلامەتن و توانیتان سەرکەون و مافەکەتان دەست بخەن، بەڕاستی زۆر دڵخۆش بووم بەوەی کە ڕەنجەکەتان ئاوا نەڕۆیی و هیوای سەرکەوتنتان بۆ دەخوازم. ئیدی من دەبێ بڕۆم، چون دوا دەکەوم.



سوهەیل دەیهەویست خۆی بدزێتەوە، چون دەترسا قسەی لەسەر بکرێ کە ئاوا لە یەکەم ڕۆژی هاتنەوەی لەگەڵ دوو کچی هاوتەمەنیدا لەبەر دەرگا ڕاوەستاوە، خێرا هێلین قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

- هێشتا هەواڵە خۆشەکەمان پێنەداوی کاك سوهەیل، ئێمە لە بەیانیەوە لێرە دەست بە خوێندن دەکەین.

+ بەڕاستی! چۆن وەرگیران؟!

- ئەمە هەوڵی دڵارا بوو کە ئێمە بەم ڕۆژە گەیشتین، ئەو کچێکی خوێنەوارە کاك سوهەیل، چەندین شیعری کلاسیکیشی لەبەرن. هەر ئەویش یارمەتی منی داوە تاکو بتوانم بخوێنمەوە و هەرگیز بە بەربەرۆشکی[1] دانەنیشم. ئەو دەمەی خاتوو دڵارا چەند شیعرێکی نالی بۆ لێژنەکە گوت بەبێ دوو دڵی هەردووکمانیان وەرگرت، ئەمە لە کاتێکدا چەندین کچ بەر لەمە وەرنەگیران و ڕەت کرانەوە.

+ بەڕاستی دڵخۆشم بەم هەواڵە، هیوام وایە هەمیشە ئاوا لە بەرزی دابن. وەلێ داوای لێبوردن دەکەم، من کەمێ بە پەلەم دەبێ بڕۆم.

---

(١) بەربەرۆشك؛ مرۆڤی بێ ئیش و کار.

ئەو دەمەی سوهەیل ڕۆیی هێلین گوتی: دەبینی دڵارا چۆن ستایشت دەکەم لەلای، هەر دوو ڕۆژی دیە عاشقت دەبێ و دێتە داوات کچێ، خۆزگەم بەخۆت.

دڵارا لەژێر لێوەوە خەندەیەکی کرد و گوتی: دانیشە کچێ، خەریکە ئابڕوومان بتکێنی لەلای. وەلێ ئەم قسەیە تەنێ گوتەی سەر زاری بوو، لە دڵەوە دەیگوت کوا بۆ ئەم ڕۆژە، دەی خۆزگە زوو دەهاتە پێش.

هەر ئەو ڕۆژە دوای عەسر سوهەیل مۆڵەتی لە قوتابخانە وەرگرت تاوەکو سەرێك لە حەکیم دانیال بدا. ئەو دەمەی بەڕێ کەوت بۆ دەو زۆنگەکە و گەیشتە ژوورە بچووکەکە لە پەنجەرەکەوە ڕوانی دانیالی پیر لە ژوورێدا ڕاکشاوە و پشتی لەوە. چەند جارێك لە دەرگاکەی دا، لێ حەکیم لێیی نەکردەوە، لەپڕدا دانیالی پیر بە دەنگێکی کزەوە گوتی:

دەرگاکە پاڵدە و وەرە ژوورێ سوهەیل، پێویست ناکا لە دەرگا بدەی.

سوهەیل چوویە ژوورێ و ڕوانی هیچ لە دیمەنی ژوورەکەی نەگۆڕاوە، تەنێ ئەوەبوو دانیالی حەکیم لەجاران پیرتر دەینواند. ژوورەکە تۆزێ شپرزە دەهاتە بەر چاوان، دوو سێ پارچە لبادی کۆنی تێدا ڕاخرابوو کە لە چەند شوێنێکدا دڕاوی پێوە دیاربوو، لە سووچی لای ڕاستی بەرامبەر دەرگاکە جاجمێکی ڕەنگ

ڕۆیشتوو بە نارێکیەوە قەد کرابوو، کۆمەڵێ لە کتێب و پەڕاوی کۆن لە چوار دەوری حەکیمدا پەرش و بڵاو کرابوونەوە وەك بڵێی کەمێك بەر لە ئێستا بەدوای زانیاریەك دا گەڕابێ، هەر ڕێك لەلای چەپی دەرگاکەوە سندووقێکی دارینی درز بردووی قوفڵ لێدراو بەدی دەکرا کە بەرزیەکەی بەقەد باڵای مرۆڤێکی تۆزێ کورت دەبوو، وێدەچوو حەکیم کۆمەڵێ لە کتێبە گرنگ و دەست نووسە کۆنەکانی تێدا پاراستبن، لەسەر سندووقەکە دوو سێ قاپی فافۆن و قۆریەکی چای ڕەش داگەڕاو هەبوو، لەملاو لای دیوارە قوڕینەکەش دوو سنگی ئاسن داکوترابوون کە یەکێکیان لامپایەکی پێوەکرابوو، ئەوەی دیش جۆرکێکی سپی پێدا شۆڕ کرابۆوە کە دیار نەبوو ناوەکەی چی تێدایە. سوهەیل خێرا دەستی ماچ کرد و لەلای ڕوونیشت.

+ گوێ بدە من کوڕم، تۆ دواین موریدی منی کە سەردانم دەکەی، من ئیدی کاتی ئاوابوونمە، دەستەکانت بێنە و بەڵێنم پێ بدە کە تا دەمری مرۆیەکی چاکە ویست و چاکەخواز بی. ئەو ویردانەی پێتی دەڵێم بەجێیان بێنە و لەسەر ئەم ڕێچکەیەی گرتووتە بەردەوام بە، ببە بە حەکیم و کەسانێك پێویستیان پێتە کوڕەکەم. ماوەیەکی دی دوو کەس دێنە لات تاوەکو فێری حیکمەتیان بکەی، ئاگات لێیان بێ و ئاگاداری خۆشت بە دەربارەیان، چون ئەوان هۆکاری تاقیکردنەوەن بۆت.

سوهەیل دەستەكانی دایێ و هەرچی حەكیم دانیال پێی گوت پاتەی كردەوە و بەڵێنی چاكەخوازی و خزمەتی خەڵكی پێدا. دواتر گوتی جێم بهێڵە و ئیدی سوهەیل ئەو ڕۆژە بە دڵخۆشیەوە گەڕایەوە. هەفتەی جارێك سەری لێدەدا و گوێبیستی ئامۆژگاری و ڕێنماییەكانی دەبوو، وەلێ بەداخەوە دوای چەند مانگێك لە سەردانەكەی سوهەیل ئەم حەكیمە گەورەیەی شاهێن بارگەی تێكنا و بەرەو جیهانەكەی دی وەڕێ كەوت، كە ئەمەش تەواو سوهەیلی ناڕەحەت و غەمبار كرد.

ماوەیەك دوای ئەم ڕووداوە سوهەیل هاتەوە سەرخۆ و پتر تێكەڵاوی خەڵكی دەكرد و هاوڕێی زۆر بوو بوون، بەتایبەت چون كەسێكی زیرەك و چالاك بوو زۆرێك لە قوتابیانی حیكمەتخانە حەزیان بە هاوڕێیەتی دەكرد و لێی نزیك دەبوونەوە، بە چەشنێ كە لەكاتە پشووەكانیش وازیان لێ نەدێنا، زۆربەشیان دەردە دڵێكیان هەبا لای ویان دەكرد.

نزیكەی ساڵێك بەسەر كۆچكردنی حەكیم دانیال تێپەڕی، سوهەیل بەردەوام بوو لەسەر خوێندنی لە قوتابخانەی مەزن و هێندەی نەمابوو كە بگا بەو ئاواتەی و جلی حەكیمان بپۆشێ، قیداریش زوو زوو سەردانی دەكرد و لەگەڵ یەكدیدا كاتی پڕ لە زانست و خەندەیان دەگوزەراند. كچانی شاهێنیش حیكمەتخانەیان بۆ چێ كرابوو و شان بە شانی كوڕەكان خرابوونە بەر خوێندن. لەملاوەش دڵارا كە زانیبووی سوهەیل



زۆری لەم قوتابخانەیە نەماوە نارەحەتی دایگرتبوو، چون دەترسا ئەو دەمەی لێرە دەڕوا ژن بێنێ و لە دەستی بچێ. ئەمەش پیشەی زۆر لە قوتابیان بوو کە ئەو کاتەی جلی حیکمەتیان دەپۆشی یەکەم کاریان هەوڵی هاوسەرگیریان دەدا. بۆ ئەو مەبەستە دڵارا هەمیشە دەردە دڵەکانی خۆی لای هێلین دەکرد و داوای لێدەکرد بەر لەوەی درەنگ بێ ڕێگا چارەیەکی بۆ وەدۆزێ، چون خۆی هێندە شەرمن بوو کە نەیدەتوانی ڕووبەڕووی کوڕان بوەستێ و قسان بکا، ئاخر ئەو تەنێ بە چەند قسەیەکی سوهەیل ئەو ڕۆژە کەوت بە ڕوودا و چەناگەی شکا. خۆ ئەگەر داوایەکی وای لێبکا ڕەنگە ئەم جارە شەرم هەموو گیانی لەخوێندا ڕەنگین بکا.

هێلین گوتی: ئەمە بۆ من لێگەڕێ دڵارا گیان، لە ژیاندا زۆرت نارەحەتی و کارکردن دیوە، نایەڵم چیدی بەم شێوازە بژی و هەموو هەوڵی خۆم دەدەم بتگەیەنم بە خۆشەویستەکەت، وەك چۆن هەوڵی حیکمەتخانەمان داو سەرکەوتووش بووین. دڵنیام سوهەیل لە هەموو شاهێندا کچێکی وەك تۆ جوان و بەڕێز و خانەدانی دەست ناکەوێ.

+ باشە هێلین گیان ئەی گەر لە دەستم چوو؟ دەزانی من ماوەیەکی چەند زۆرە نەقشی ئەوم لەدڵدا کێشاوە. ئەو دەمانەی تەنیا فەنتازیایەك[1] بوو، هیچ بوونێکی نەبوو لە ژیانم، من هەر

(١) فەنتازیا: خەیاڵ

لەو دەمانەوە پڕ بە دڵ خۆشم دەویست. ئێستا کە وێنەکەی بەرجەستەیە و جاروبار دەیبینم ڕێك ئاگر لە دڵم بەردەدا. توخودا هێلین ئەمە نهێنی بێ لە نێوانمان، کچێ گەر کەسێکی ئێمە بزانێ، گەر باوکیشم نەمکوژێ مامەکانم دەمکوژن.

- دڵارا تۆ گەورەی، تۆ شۆڕشت کردووە تا بەمە گەیشتووی، گیانی خۆت خستۆتە مەترسی مردنەوە، چەندین ساڵ کاری باغ و بێستانت کردووە و لە کوڕێك پتر تێکۆشاوی، ئەم هەموو هۆنراوە ڕەقەی مەحوی و مەولەویت ئەزبەر کردوون کە کچانی دی نازانن ماناشیان چی یە، خۆ بەدەست هێنانی سوهەیل زۆر لەم شۆڕشە ساناترە.

+ دەترسم هێلین دەترسم، لە هەموو شتێك دەترسم. گەر سوهەیل بەمن ڕازی نەبوو چیم لێدێ؟ ئەو شازادەی چەندین ساڵە لە هزر و دڵمدا بنیاتم ناوە هەمووی دەبێتە خۆڵەمێش. ئەی گەر سوهەیل ڕازی بوو، وەلێ باوکم و مامەکانم بوونە ڕێگر چی؟

- ئێ دە کچێ بیر لەم هەموو شتە مەکەرەوە بە یەکجار، بۆچی وا مێشکت جەنجاڵ دەکەی و خۆت دەکوژی، جارێ تەنێ لەسەرمانە سوهەیل ڕازی بکەین و تەواو، هەر ئەم ئێوارەیە هەوڵی بینینی دەدەم و پێی دەڵێم.

+ توخودا هێلین گەر بینیت مەڵێ دڵارا خۆشی دەوێی، من دەمرم سوهەیل بەمە بزانێ، ئاخر زۆر شەرم دەکەم.

- ئەمە چ قسەیە کچێ! ئەی من بۆچی بچم، بۆ خۆم؟!

+ پێی بڵێ کچێك لە حیکمەتخانە هەیە خۆشی دەوێی و چەند ساڵە تۆی لەدڵ دایە، ئەگەر زانیت دڵی بۆ بابەتەکە جوولا و پێی خۆش بوو بمناسێ ئەوکات بمناسێنە، لێ ئەگەر زانیت خوانەخواستە بەم شتە ڕازی نییە ناوم مەدرکێنە، وەلێ چۆن هەوڵی بینینی دەدەی، خۆ قەدەغەیە بچینە بەشی کوڕان؟

- لەبەر دەرگاکە هەوڵ دەدەم بیبینم، بە کەسێك دەڵێم کە پێی بێژێ خزمێکی هاتووە، چووزانم، بە ڕێگایەك هەر دەیهێنمە دەرێ. مەڵێ ئەو یەکەمی حیکمەتخانەیە و بەمن ڕازی نابێ، لەبیرت بێ تۆش ئێستا کچێکی زیرەکی ئێرەی.

ئێوارە هێلین بە فێڵێك لە بەشەکەی خۆی چوویە دەرێ و خۆی گەیاندە بەردەم دەرگای حیکمەتخانە و لەوێ بە کوڕە لاوێکی گوت کە خزمی سوهەیلم و کارێکی گرنگم پێیەتی، هێندەی نەبرد سوهەیل هاتە دەرێ و لەبەر دەرگاکە چاوی بە هێلین کەوت.

+ ئەوە تۆی خاتوو هێلین، بەمنیان گوت کە خزمێکم هاتووە!

- کاك سوهەیل، چەند شتێکی گرنگ هەبوو ویستم بۆت باسکەم، ناچاربووم بڵێم خزمی ئێوەم، ببوورن.

+ زۆر چاکە، وەلێ خۆزگە تەنیا نەدەبووی، خۆت دەزانی خەڵکی ئێرە چۆنن، ڕەنگە شتێکمان بۆ چێ بکەن.

- خەمت نەبێ زوو دەڕۆم، بە یارمەتیت گەر تۆزێ بێیە ئەملا و لە دەرگاکە وەدوور کەوین باشترە.

سوهەیل تۆزێ لە دەرگاکە دوورکەوتەوە و گوتی: باشە خاتوو هێلین بفەرموون.

- پرسیارێکت لێ دەکەم، هەرچەندە پرسیارێکی تایبەتی و کەسیشە، وەلێ ببوورن بۆ کارێکی گرنگمە. قەرار نییە ژن بهێنی کاك سوهەیل؟

سوهەیل زەردەیەکی هاتێ و گوتی: ئەم پرسیارە سەیرە لەم کاتە! نازانم چیت پێ بێژم، لەڕاستیدا ئەو دەمەی لێرە تەواوبووم هەوڵی بۆ دەدەم، وەلێ لە ئێستادا نا.

- باشە گەر کچێك هەبێ تۆی خۆشبوێ هەستت چۆن دەبێ؟ تا ئێستا بیرتان لەم بابەتە کردۆتەوە؟

سوهەیل دووبارە پێکەنی و سەری داگرت و شەرمی نواند، دواتر گوتی:

منی خۆشبوێ! جا من کەسێکی هێندە گرنگم کە کچێك منی خۆشبوێ؟ کێ مرۆیەکی هەژاری وەکو ئێمەی خۆشدەوێ!

- چۆن گرنگ نی کاك سوهەیل، ئەوانەی حیکمەتخانە تەواو دەکەن لە هەرە گرنگەکانی شاهێنن، بە تایبەتی کە تۆ ناوت بە



زیرەكی ڕۆییوە، ئێمە بەر لەوەی بێینە حیكمەتخانە بە ناوەكەت تۆمان دەناسی.

سوهەیل تۆزێ وەستا و شەرمەكەی پتر بوو، پاشان بەسەر خۆیدا زاڵ بوو و هاتەوە قسە:

لەڕاستیدا نازانم چ بێژم، باشە دەكرێ بزانم ئەم كچە كێ یە و چ كەسە؟

- ئێستا تۆ لەوە گەڕێ ئەو كێ یە، ئەو كچێكی خانەدانە و نایهەوێ ئاوا زوو ناوی ئاشكرابێ، تۆ تەنێ وەڵامی پرسیارەكەم بدەوە كاك سوهەیل، چی دەڵێی ئەگەر كچێك خۆشی بوێی؟ ئایا بڕیار دەدەی بێیە داوای یاخود نا؟

سوهەیل ڕەنگێكی هێنا و برد و گوتی: ببوورن، من نامەوێ لەئێستادا بڕیاری هیچ شتێك بدەم تاوەكو لێرە تەواو نەبم، جارێ هیچ قەرارێكی ژن هێنانم نییە خاتوو هێلین، زۆر داوای لێبوردن دەكەم دووبارە.

هێلین تۆزێ داما و گوتی: زۆرچاكە كاك سوهەیل، وەلێ باشتر بیر لەم بابەتە بكەنەوە تكایە، ئەو كچە هەژارە چاوەڕێتە و زۆری خۆشدەوێی و دەرگیری[١] ئەوینت بووە.

---

(١) دەرگیر: گرفتار، گیرۆدە.



لەگەڵ ئەم گوتەیەدا هێلین ڕۆیی و سوهەیلیش لەشوێنی خۆیدا داما و بۆ ماوەیەك چەشنی جەستەیەكی ڕەق لەبەر دەرگاكە وەستا، خەیاڵی ڕۆیی بۆ ئەو مەنزڵ و جێگایەی كە پریاسكە خانی تێدایە و چەند جارێك لەبەر خۆیدا گوتی:

نەخێر هەرگیز، بۆ هیچ كەسێ واز لەتۆ ناهێنم خانمەكەم، هیچ مرۆڤێك ناتوانێ ئەم بۆشاییەی تۆ لەدڵدا چێت كردووە پڕی كاتەوە. لەم خەیاڵانە دابوو قیدار لەبەردەمی پەیدابوو.

- چی بوو ڕازی نەبووی سوهەیل؟

+ ها قیدار زراوت بردم، بەچی ڕازی بم؟

قیدار بە شۆخیەوە: ئای سوهەیل چۆن دار لە بەختی خۆت دەدەی، چۆن كەسێكی ئامادەی شەنگ و شۆخ بە نادیارێك دەگۆڕیەوە. ئەی هاوار بۆ حەكیمی مەزن، بۆچی پەریەك داوایەكی ئاوا ئاڕاستەی ئێمەی هەژار ناكا، خاوەنی چ بەختێكی سوهەیل كە كچ ئاوا دێنە بەردەمت.

+ تخوا كاتی ئەم شتانەیە قیدار، قوتابخانەم جێهێشتووە تۆش هاتووی كاتت زۆرە، بابە من دەچمەوە ژووریّ لێم گەڕێ.

سوهەیل لەم مشتومڕە دابوو لەگەڵ قیداردا، لەنكاو دەرگاوانی قوتابخانەكە هاتە دەنگ: ئەمە چیتە برا؟ خێرا لێرە دووركەوە ئەمە قوتابخانەیە نەك شێتخانە، دەڵێی تەواو نی ئاوا لەبەر خۆتەوە هەراتە.

لەگەڵ ئەم قسەیەدا سوهەیل هێند سووربوویەوە ئارەقەی کرد و لە دڵی خۆی بڕیاری دا کە تۆڵە لە قیدار بکاتەوە.

+ ببوورن بەڕێز قوتابی ئێرەم، کێشەیەکی بچووکم هەبوو بۆیە هاتمە دەرێ. ئەمەی گوت و خێرا خۆی بەژووریّ دادا. دەم نا دەمێك لەبەر دەمیەوە قیدار دەردەکەوت و پێی پێدەکەنی، لێ سوهەیل کە ئاوڕی دەدایەوە خەڵکی دەدیت و چی پێ لەگەڵ نەدەکرا.

هێلین قسەکانی سوهەیلی وەکو خۆی بۆ دڵارا گێڕایەوە، ئەمەش دڵارای پتر نیگەران و بێتاقەت کرد، ماوەیەك بوو هەستی دەکرد وەکو جاران وانەکانی بۆ ناخوێندرێ و عیشقی سوهەیل تەواوی پەردەکانی دڵی دڕیوە و هەموو گیانی داگرتووە. مامۆستاکان هەمیشە گلەیی ئەوەیان لێ دەکرد کە بۆ وێنەی جاران چالاك و زیرەك نەماوە.

ڕۆژێك خاتوو ڕەعنا کە کچەکەی بەم نیگەرانیەوە دەبینێ لێی دەپرسێ:

+ کچی خۆم ماوەیەکە نیگەران و نارِەحەتت دەبینم، خۆ هیچ ڕووینەداوە؟ تۆ هەموو ئاواتت خوێندنی حیکمەتخانە بوو، دەی ئێستا بەدەستت هێنا و یەکێکی لە زیرەکانی ئەوێ. دوای دەست خستنی ئاواتەکەت چ شتێك غەمبارت دەکا؟

- هیچ نییە دایکە گیان هیچ نییە، تەنێ کەمێك نەساغم.

+ شتێك هەیە و لێم دەشاریەوە دڵارا، ئەمە نەساغی جەستەیی نییە، چون ماوەیەکی زۆرە ئاوا دەتبینم. تۆ ساڵێکە لە حیکمەتخانەی و ئەم ماوەیە نەبێ هیچ کات بێتاقەتم نەدیوی.

- لەڕاستیدا دایکە نازانم چیت پێ بڵێم و چۆنی دەربڕم.

+ نەکا کەسێك لە ژیانت هەبێ کچم؟ پێم بڵێ وایە؟

لەگەڵ ئەم پرسیارەدا دڵارای جوان دەستی بە گریان کرد و ڕۆندکەکانی بەسەر ڕوخساریدا جۆگەلەیان بەست و نەرم نەرم بەردەبوونەوە نێو کۆشی. خاتوو ڕەعنا کە کچەکەی بەم چەشنە دی بەرگەی نەگرت و خێرا لە باوەشی گرت و هەردوو بە یەکەوە لەپڕمەی گریانیان دا.

دڵارا بە گریانەوە: تۆ بۆچی دەگری دایە؟ خۆ هیچم لێ نەهاتووە، نابینی وا سەلامەتم؟

+ کچە جوانەکەم چۆن نەگریم ئاخر، لێرە ئاساییە کە کوڕێك کچێکی خۆشبوێ، وەلێ ئەو دەمەی کچێك کوڕێکی لەدڵدایە دەزانی کە چەندە سەختە؟ ئەگەر پێی بزانن بە هەموویان هەوڵی لەناوبردن و کوشتنی دەدەن و دونیای لێ دێننە هەژان، بۆیە زارت ببەستە و قسە بۆ هیچ کەسێ مەکە. باوکت ماوەیەك لەمەوبەر باسی شەماڵی کوڕە برای دەکرد. ئەو بەهیچ شێوازێ ڕازی نابێ بتدا بە بێگانان، لەبەر ئەوە دەگریم دەترسم شتێکت لێ بکەن

نازدارەکەم. ڕجات لێ دەکەم بە ڕجایەکی دایکانە ژیانی خۆت مەخە مەترسیەوە و هەوڵی لەیادکردنی بدە.

دڵارا کە هێشتا فرمێسکەکانی لەسەر گۆنای وشك نەبوو بوونەوە بەم گوتەیەی دایکی هێندەی دی ڕەهێڵە[1] ڕووی لە چاوانی کرد و بە گریانەوە گوتی:

بەڵام چۆن دایکە؟! ئاخر من ساڵێك زۆر زیاترە تووشی ئەم حاڵەتەبووم، ئێستا چۆن دەکرێ ئاوا ئاسان لەناوی بەرم! مەگەر خۆت ئاواتی ئەوەت بۆ نەدەخواستم کە کوڕێکی حیکمەتخانە ببێ بە نەسیبم دایکە؟ ئەی ئەمە ئاواتی تۆ نەبوو؟ دەی ئێستا من دەمەوێ ئەم ئاواتە بەجێ بێنم.

+ ئەمە تەنێ ئاواتێ بوو کچم، ئاوات لەگەڵ ڕاستیدا ئاسمان و ڕێسمانی جودایە. لێرە زۆربەی کچان بە دڵی خۆیان شوو ناکەن ئازیزەکەم، زۆری لەسەر بێشکەوە مارەییشی بڕاوەتەوە، یاخود لەبری برینداریێ یان کوژراوێ دەبەخشرێ. ئەگەر واش نەبێ دیسان باوك و مامەکانی بڕیار دەدەن کە ئەو بۆ کێ بێت، واتا ئەو هیچ بڕیارێکی لەدەست نییە کچم. بۆیە تکات لێدەکەم ئەو بابەتانە لەیاد بکە و گرنگی بە خوێندنەکەت بدە، ئاخر ئاوا غەمبار بتبینم دڵ و جەرگم لەت لەت دەبێ نازدارەکەم. هەر لەبەر ئەمەبوو، ئای خودایە هەر لەبەر ئەمەبوو کاتی خۆی کە زانیم کچی زۆر بۆت نیگەران بووم.

---

(١) ڕەهێڵە: بارانی لێزمە و بەخوڕ

دڵارا بە دڵی پڕەوە گوتی: ئایا حەکیمی مەزن فەرموویەتی کە کچ هیچی لەدەست نەبێ دایکە؟ لەهیچ شوێنێ شتی وای فەرمووە؟

+ نەخێر کچم، من خوێنەواریم هەیە و کتێبە پیرۆزەکەی ئەوم خوێندۆتەوە، قەت نەمبیستووە حەکیمی مەزن لەهیچ دەقێکدا شتی وای فەرمووبێ، ئەمە تەنێ داب و نەریتێکی کۆنی شاهێنە و هیچی دی. پێم بێژە ئەو کوڕە کێ یە کچەکەم؟

- هەمان ئەو کەسەی باوکم بە برینداری هێنایەوە، ئەو سوهەیلە دایکە، سوهەیل یەکێکە لە یەکەمەکانی حیکمەتخانە و هەمووان خۆشیان دەوێ. لە ژیانمدا کوڕی وا چاك و پاکم نەدیوە، تا ئێستا سەری بەرامبەر من و هێلین بەرز نەکردۆتەوە دایکە. ئەوەندە بە ڕێزەوە دەدوێ کە مرۆ شەرم دەکا ڕووبەڕووی بوەستێ. زۆرێك لە کچەکانی حیکمەتخانە چاویان لەسەریەتی.

+ چەند سەیرە! یانی ئەو کوڕەی باوکت هێنایەوە ماڵێ قوتابی حیکمەتخانە بوو!

- بەڵێ دایکە، پێش ئەوکاتیش ئەو دڵ و دەروونمی داگیر کردبوو، هەمیشە لای من و هێلین باس باسی ئەو بوو، لەزۆربەی خەوەکانمدا ئەوم دەبینی، لەکاتێکدا تەنێ ناویم بیستبوو. ئەو ئەو شازادەیە بوو کە لە خەیاڵەکانم بنیاتم نابوو، حەکیمی مەزن وایکرد پێی بگەم و لەگەڵی بدوێم، لەکاتێکدا پێشتر بینینی ئەوم

بە خەیاڵ دەزانی. ئێستا دوای ئەوەی بینیم و خۆشەویستیەکەم چوویە نێو قووڵایی چۆن ئاوا دەست هەڵگرم؟ باشە بۆچی پێشتر هەموو ئەم شتانەت پێ نەگوتم؟ بۆچی نەتگوت کچم شووکردنی تۆ لەدەستی باوك و مامەکانت دایە و تۆ بڕیار بەدەست نی، تاوەکو کەسم خۆشنەویستبا دایە، تاوەکو دڵی خۆم مراندبا دایە، بۆچی نەتگوت بۆ؟

خاتوو ڕەعنا خۆی بۆ نەگیرا و دووبارە کچەی خستەوە باوەشی و ئەم دایك و کچە هەرچی ڕۆندك هەبوو هەڵیان ڕژاندە سەر شانی یەکدی تاوەکو ماندوو بوون. دواتر خاتوو ڕەعنا هەندێ ئامۆژگاری کچەکەی کرد و چەند بەرچاو ڕوونیەکی پێدا تاوەکو بتوانێ قۆناغ بە قۆناغ خۆشەویستەکەی لەیاد بەرێتەوە.

دڵارای جوان بە دڵی خوێنینەوە چوویە سەر حەوزە چوار گۆشەکەی حەوشە و لەسەر لێوارەکەی ڕوونیشت و لەگەڵ فرمێسکەکانی دا هۆنراوەی دەچڕی:

دایەی شیرینم....

تۆ کە دەتزانی لەم نیشتیمانە

ماف خوراو دەبم

بۆچی هێنامت؟

تۆ کە دەتزانی چم لەدەست نییە و

چەشنی ئاڵایەك لەبەردەم بادا

هەڵكراو دەبم

بۆچی هێنامت؟

تۆ كە دەتزانی....

ئاوازی عیشق لێرە و لەوێدا

پڕ دەكا كاسەم

چی مرۆ هەیە لەبەرامبەر وی

ناشكێنێ تاسەم

وەلێ قەت نابێ منی كچ هەرگیز

بۆ وی ڕادێرم دڵ و هەناسەم

بۆچی هێنامت؟

تۆ كە دەتزانی بڕین و كوشتن

زوڵم و زۆرداری

لەم نیشتیمانە چاوەڕوانمە

تۆ كە دەتزانی

لەباتی خەندە فرمێسكی خوێنین

وا میوانمە

بۆچی هێنامت؟



دڵارا بەم چەشنە لەبەر خۆیەوە هۆنراوەی جۆر بە جۆری دەچریکاند و ناوە ناوەش فرمێسکە گەرمە سوێرەکانی تێکەڵی ئاوی حەوزەکە دەبوو.

هەموو لە حیکمەتخانە هەستیان بە دڵتەنگی ئەو کردبوو. بەردەوام مامۆستاکان پرسیاریان لە بێتاقەتیەکەی دەکرد و وەڵامێکی وایان دەست نەدەکەوت. ڕەوشەن یەکێ بوو لەو کچانەی کە باش لە دڵارا گەیيبوو، ڕۆژێك دەستی گرت و بردیە نێو باغە بچووکەکەی حیکمەتخانە و پێی گوت: دڵارا گیان، دەزانم خەمێکی قووڵت هەیە، بزانە هەر تۆ نی لەم نیشتیمانە بەم ئازارەوە دەژی، منیش و دەیان کچی دی شاهێن ئازاری لەم چەشنەمان هەیە و هەبووە، وەلێ ئەم بێ تاقەتیەت لەناوت دەبا بزانە، پێویستە زوو خۆت هەڵسێنیەوە هاوڕێ. عیشق دەردێکە دەبێ لەگەڵی ڕابێی و تەواو، گەر بەتەمای چارەسەر بی خەڵەفاوی، دەیانی وەکو تۆی لەناو برد و هیچ باکێکیشی نەبوو، بۆیە ڕابێ هاوڕێ، تکایە ڕابێ.

+ ڕەوشەن گیان تۆ لە عیشقەکەش گەڕێ، ئەم داب و نەریتە ئازارم دەدا. ئاخر بۆچی دەبێ کچێك کەسێکی خۆشبوێ بکوژرێ، لەهەمان کاتدا کوڕێك ئەم کارە بکا زۆر ئاساییە و بگرە هەندێ جار شانازیشی پێوە دەکرێ؟! ئەگەر قەرار وایە کوشتنێك هەبێ بۆچی تەنیا بۆ یەك ڕەگەز ڕەوایە؟! مەگەر ئەویش وەکو کوڕەکە مرۆڤ نییە؟ ئەمە کێ یە ئەم جیاییەی هێناوەتە ئارا؟ من ناڵێم با



کچ بچێ بە دڵی خۆی دڵداری و بێ شەرمی بکا تێبگە، قسەم لە بێ شەرمیدا نییە، منیش پێم باشە دایك و باوك لە کچ بپێچنەوە و نیگابانی[1] بن و نەهێڵن تووشی هەڵەبێ، چون ئەگەر منداڵ لێی نەپێچرێتەوە تووشی چەندین کاری نەشیاو دێ، بەڵکو قسەی من لەوەدایە کە ئەگەر کچێکی بەستەزمان لە دڵی خۆیدا بە پاکی کەسێکی دانابێ چ تاوانی هەیە؟ ئەگەر ئەمە هەڵەیەکە دەی با بۆ کوڕەکەش هەڵەبێ! باشە ئەوە گریمان هەڵەیەکی کرد، ئایا هەڵەیەك مرۆڤی لەسەر دەکوژرێ؟ لەکوێی دینداری ئەمە هەیە ڕەوشەن، پێم بێژە لەکوێ هەیە؟

- ڕاست دەکەی دڵارا ڕاست دەکەی، لێ ئەم قسانە بۆ کەس مەکە ئاگاداربە، چون ئەوەی من لێت تێدەگەم هەموو کەس تێی ناگا، ڕەنگە بڵێن دڵارا بانگەوازی بێ شەرمی دەکا، وەلێ من دەزانم کە تۆ مەبەستت چی یە، تەنێ بۆ ئەوەم هێنایە ئێرە کە پێت بێژم بێیەوە سەرخۆت، ئاوا بڕوا ڕەنگە نەتوانی لێرە بەردەوام بی. داهاتووی خۆت بەدەستی خۆت لەنێو مەبە هاوڕێ. پێم خۆشە یارمەتیت بدەم دڵارا، تۆ کچێکی زۆر جوان و زیرەکی، پێم حەیفە ئاوا ژاکاو ببی، پێم بڵێ ئەو کوڕە کێ یە؟ بەڵێنت پێ دەدەم هەموو هەوڵی خۆم بخەمە کار و ڕازی بکەم بێتە داوات.

+ کەسێکم نارد، وەلێ ئەنجامێکی وای نەبوو، باشتر وایە لێ بگەڕێی.

---

(١) نیگابان: پاسەوان

- نا نا دڵارا، تۆ هەر لە یەکەم ناردندا ئاوا بێ هیوابی چۆن دەبێ! ئەمجارەیان من دەچم، من لە گەیاندنی پەیامدا زۆر شارەزام، دەزانم چۆن دڵی ڕاکێشم، بە منی بسپێرە و خەمت نەبێ، دەبینی چۆن وا دەکەم بتوێتەوە بۆت.

+ ئاخر زۆر شەرم دەکەم دووبارە کەسێك بنێرم، هەرچەندە ناشزانێ کە منم، لێ لەوەیە گومانی بۆم چووبێ.

- چەند سەیری کچێ! بە جارێك ئاوا وێران بووی؟ کوڕ هەروان، سەرەتا تۆزێك خۆیان گران دەکەن، دڵنیات دەکەمەوە من بچم زۆر شت دەگۆڕم. ئێستا ناوەکەیم بدێ ئینجا ئەنجامەکەی دەبینی.

+ سوهەیل، ناوی سوهەیلە.

- هەمان ئەو سوهەیلە زیرەکەی ئێرە دەڵێی؟

+ بەڵێ مەبەستم ئەوە.

- ئەو تۆزێ قوڕسە دڵارا، چون یەکەمی ئێرەیە و چاوی زۆر لەسەرن، خۆزگە ئەو نەبایە، وەلێ بێخەم بە، من دەزانم چۆنی بۆ وەڕازێنم. بەیانی پشووە و قوتابیەکانی حیکمەتخانە بەرەو ماڵ دەبنەوە، لە ڕێگادا هەوڵ دەدەم سوهەیل ببینم و پێی بێژم، تۆ تەنێ چاوەڕێبە و دڵتەنگیەکانت لابەرە.

بەیانی ئەو دەمەی قوتابیان پۆل پۆل دەگەڕانەوە ماڵێ، ڕەوشەن لەبەر دەرگاکە چاوەنووڕی دەرکەوتنی سوهەیل بوو.

لەنكاو ڕوانی وا سوهەیل هات، وەلێ یەكێ لە هاوڕێكانی لەگەڵدایە و خێرا بانگی كرد.

- كاك سوهەیل تكایە كارێكم پێتانە.

سوهەیل كە ئەمەی ژنەوت ئاوڕی دایەوە، لێ كچەكەی نەناسی و گوتی: بفەرموون خاتوو، چ كارێكتان هەبوو؟

- دەمەوێ هەر ئەو دووەمان بین.

لەو دەمەدا سوهەیل هاوڕێكەی وەڕێ كرد و گوتی: بێژە با لە خزمەت بین.

ڕەوشەن لێی نزیك بوویەوە و هاتە گۆ: هەست ناكەی دڵت زۆر ڕەقە؟

سوهەیل بە سەرسوڕمانەوە: من!

- بەڵێ بەڵێ تۆ، باشە پیاوان چۆن دەتوانن ئاوا دڵ ڕەق بن پێم بێژە؟

+ ببوورن خاتوون، من تۆ ناناسم، لەوەیە مەبەستت كەسێكی دی بێ و وێنەی بە من بچێ.

- نا نا من باشت دەناسم، تۆ هەر ئەو سوهەیلە نی كە ناوت بە یەكەم و زیرەكی حیكمەتخانە ڕۆییوە؟ ئەمەش وای لێكردووی لەخۆت بایی ببی و وەڵامی خەڵكی نەدەیتەوە.



سوهەیل بە نەرمی و سەرسوڕمانەوە: بە پێچەوانەوە خاتوون، من لە خزمەتی هەر کەسێکدا بووم کە ڕۆژێ لە ڕۆژان پێویستی پێم بووە، تێناگەم چی ڕوویداوە و بۆچی ئەم قسانە دەکەی و جەنابتان کێن؟

- خزمەت کردن ئاوایە؟ ڕۆحێك لەبەر تۆ لە مەترسی لەناوچوون دایە، تۆ خەریکە مرۆڤێك لەناو دەبەی و ئاگاداری هیچیش نی، ئەو مرۆڤەی حەکیمی مەزن بنیاتی ناوە تۆ خەریکە دەیڕوخێنی.

+ هاوار خاتوون چیم کردووە؟ بەخوا ئاگاداری هیچ شتێك نییم!

- نامەوێ خۆم بناسێنم کاك سوهەیل، وەلێ من ئێوە دەناسم، کچێك لەم حیکمەتخانەیە زۆر جەنابتانی خۆشدەوێ، بە چەشنێ خۆشی دەوێی کە ژینی لێ شێواوە، حاڵی تێك چووە و ڕەنگی گۆڕاوە. دڵەکەی بە وێنەی پەنگر[1] سووربۆتەوە و خەریکە هەناوی دەبرژێنێ. ئەو هاوڕێیەکی ئازیزی منە و زۆرم خۆشدەوێ، نامەوێ ئەم هەموو عیشقەی ئاوا لە ناخی بمێنێتەوە و بەفیڕۆ بڕوا لەکاتێکدا ئێوە هیچ نەزانن و لەخەوی غەفڵەت دابن، بۆیە خۆم پێ تاوانبار بوو کە هیچی بۆ نەکەم، ویستم هیچ نەبێ بە حاڵی ئەو ئاگادار بی و واز لەو دڵڕەقیەت بێنی. تۆ نازانی کچ کە یەکێکی خۆشبوێ چۆنە، هەرگیز نازانی چونکە کچ نەبووی.

---

(١) پەنگر: پشکۆی ئاگر



سوهـــەیل لەگەڵ ئەم قسانەدا سەری خۆی بەردایەوە و دڵتەنگیەکی ئێجگار زۆر ڕووی تێکرد و گوتی: ئاگادارم خاتوون، ئاگادارم، وەلێ من نازانم ئەو کێ یە؟

- ئێ گەر ئاگاداری چۆن نازانی کێ یە؟!

+ دەزانم کەسێکی وا لێرە هەیە، چون جارێکی تریش بۆم باسکراوە، لێ نەمزانیوە کێ یە.

- ئێ چی بڵێم؟ هیچ پرسیارتان نییە ئێوە؟ ئەگەر ناتانەوێ هەر بابەت دادەخەین و نە من چم گوتووە و نە تۆش چت زانیوە.

سوهەیل بە دڵێکی پڕ لە غەمباریەوە: بە خودا من شەرمەزارم بەرامبەری، هەرچەندە تەواو ناشزانم کێ یە، لێ خوا ئاگادارە هەست بە ئازاری دڵی دەکەم و ئەزیەتی پێ دەچێژم، بەڵام خۆزگە دەکرا منیش خۆشم بوێ خۆزگە.

- ئمـم، دەی واتان لێکرد هیچ ئەگەرێك نەمێنێ کاك سوهەیل، من وامزانی ئێوە ئاگادار نیین، ئەگەر بچووکترین ئەگەریش هەبێ کارێکی بۆ بکەن کاکە. سوێند بە حەکیمی مەزن ئەو دەمرێ کاك سوهەیل، خەو و خۆراکی نەماوە و خەریکە لە حیکمەتخانەش دەرکرێ لەسەر ئەو عیشقەی جەنابتان.

سوهەیل بە چاوی پڕ ئەسرینەوە: تۆ خۆت بڕیار بدە بەڕێز، تخوا خۆت بڕیار بدە، ئەگەر من دڵم بە کەسێکی دیکەوە بێ چی

بکەم ئاخر؟ سوێند بە حەکیمی مەزن غەمباری ئەوم و دڵم بۆی ژان دەکا، وەلێ چی بکەم؟ دە خۆت بیڵێ؟

- تێدەگەم کاك سوهەیل، بێگومان دڵ تاکە ئەندامی مرۆڤە کە لەدەستی خۆیدا نییە، دەبێ هەموومان بەهۆی ئەم دڵەوە ئازار بچێژین، هەمیشە ئەو کەسانەی خۆشمان دەوێن دڵیان لای کەسانی دیکەیە، ئەو کەسانەی دیکەش دڵیان لای کەسانی ترە، بەم چەشنە تا ڕۆژی دوایی هەموومان لە ئازار داین. من تەنێ دڵم بۆی دەسووتێ، ئاخر ماوەیەکی گەلێ زۆرە خۆشەویستی جەنابتی لەنێو سینەی حەشارداوە و وێنای داهاتووی خۆی و تۆی کێشاوە، ئێستا لەپڕدا ئاوا پێی بێژم لەیادی بکە و ئەو کەسێکی دیکەی لەدڵدا ڕەنگە هەر شێت ببێ کاك سوهەیل. ئەگەر ئاسایی بێت لاتان من بە جۆرێك لە جۆرەکان تێی گەیەنم کە تۆ دڵت لای کەسێکی ترە، بەڵکو ئەویش بتوانێ بە تێپەڕینی کات خۆشەویستی ئێوە لە سینەیدا کپ کاتەوە و وەدەری نێ.

سوهەیل کە هێشتا چاوەکانی تەژی بوو لە ئاو گوتی: گەر کارێکی وا بکەن سوپاستان دەکەم، لێ توخودا لەکاتی تاقیکردنەوە و ئەم بابەتانە نەبێ.

زۆری لەگەڵ بڵێ، دڵی بدەرەوە، دووبارە سوێندت بۆ دەخۆم جەرگم بۆی لەتە و لەتۆم پتر خەمە. ئاخر ناتوانم بەرگەی ئەوە بگرم کەسێك بەهۆی منەوە ئازار بچێژێ.

- خەمت نەبێ کاك سوهەیل، بەجۆرێك هەوڵی لەگەڵ دەدەم، هەرچەندە دەشزانم بێ سوودە، چون ئەو قەراری خۆی داوە و لە خەیاڵ و ئەندێشە و هەموو خانەکانی لاشەی نەقش و نیگاری ئێوەی کێشاوە.

+ خۆزگە دەکرا کارێکم بۆی کردبا، لێ ئاخر چی لە دڵ بکەم ها؟ دووبارە شەرمەزارم خاتوون، دەی سوێند دەخۆم منیش لەو کەمتر دڵ پڕووسکاو[1] نییم، وەنەبێ هەر ئەو لە ئازار دابێ.

- ڕاستە زۆر نارەحەتە، کێشەکە ئەوەیە کە مرۆڤ شتێکی ویست ئەوپەڕی هەوڵی خۆی دەدا تا بەدەستی بێنێ. بەس توخودا کاك سوهەیل کەس بەم بابەتە نەزانێ، خۆت دەزانی ئابڕووی کچ چۆنە.

+ بێخەم بە خاتوون، خوا ئاگادارتان بێ.

- سوپاس بۆ ئەو کاتەی پێت بەخشیم.

لەگەڵ ئەم قسەیەدا ڕەوشەن بە غەمباری گەڕایەوە، سوهەیلیش گرێکی ئەوتۆ لەنێو سینەیدا بەرپابوو کە خەریك بوو بیسووتێنێ و تەواوی وجوودی بکاتە خۆڵەمێش. ئاخر ئەو دەیزانی ئەو دەمەی کچێك عاشق دەبێ هەرگیز وەکو کوڕان ناتوانێ دەری بڕێ و دەبێ تا ماوە بەم ئازارەی سینەی بتلێتەوە،

---

(١) پڕووسکاو: پچڕاو

چون کچ هەموو هەوڵ و توانای ئەوەیە شەرم و شکۆی خۆی بپارێزێ و هیچ کام لە ئەندامانی ماڵی شەرمەزار نەکا. بۆیە ئاخی قووڵی هەڵدەکێشا و دەیگوت: هاوار ئەی عیشق، لەسینەی ئەم بەستەزمانە وەرە دەرێ و وازی لێبێنە، ئەو ئازارەی ئەویش بخە سەر دڵی من و بەهۆی منەوە کەس ئازار مەدە. ئاخر چی وەڵامی حەکیمی مەزن بدەمەوە گەر فەرمووی ئەی سوهەیل کچێك لەبەر تۆ ژینی شێواو ئازاری چەشت. چ بێژم چی؟

سوهەیل بەم چەشنە لۆمەی خۆی دەکرد و ئەسرینی بەسەر خاك و خۆڵی ڕێگاکەدا دەڕژاند تاوەکو گەیشتەوە ماڵێ. ئەو دەمەی گەیشت خێرا خۆی لە ژوورەکەیدا تەنها کرد و تاکە هاوڕێی پێنووسەکەی بوو کە بتوانێ دڵی توندی سارێژ بکا و ژیری کاتەوە، بۆیە هەر زوو لەنێو جانتاکەیدا دەری کرد و دەستی بە نووسین کرد:

خۆشت نەوێم....
دڵم بەردی چیای قەندیل
بە لێدانی سەدان شەپۆڵ نەرم نابێ
گێژەڵووکەی ژانی دەروون
وەهای توند کرد
بە گڕکانی هەزار ئەوین
گەرم نابێ

خۆشت نەوێم....

ئەی نازانی...

دڵێك نییە لە جەستەمدا

وێنەی فەرش بۆت ڕابخەم

گوڵێکی وا نادۆزمەوە

لە خەزانی عومری لاویم

بیدەم لە تاڵی توڕڕەت و

دەرگای دڵتی پێ دابخەم

خۆشت نەوێم....

لەکوێ دەزانی کە چۆنە

حاڵی دڵم

ئەو دەمانەی...

بەرەو سەرچاوەی ساف دەچم

لەنێو جۆگەی پڕ زیخ و چەو

دەردەبمەوە

لەو دەمەیدا

بۆ گوڵی سووری باو دەچم
لە خاکێکی ڕەقی تاردا
وەکو شەونم
بەردەبمەوە

خۆشت نەوێم....
لە کاتێکدا
سەرپاکی من کژی زەردە
ئەو زیندەگیەی لە دڵمایە
خۆشی نییە، گشتی دەردە
بەبەرچاوی هەمووانەوە ئەمن دەڵێم
کە خۆشەویستی نازانم!
بەرامبەر بە عیشق و ئەوین
ئەمن ڕەندێکی نادانم!

خۆشت نەوێم....
گەر تۆ گەرەکتە تەناهی

دەی بزانە...

لە عیشقی من بوونی نییە

وەکو تەشکێکی سەرگەردان

لەنێو ئەشکەوتی ئەفلاتوون

دێم و دەچم

چ ڕێگای دەرچوونی نییە

خۆشت نەوێم....

خۆشەویستی تۆ لەبۆ من

وەك مناڵە

لە زەویەکی وشك و بێ ئاو

جێ هێڵرابێ...

وەك درەختە

لەسەر کێوێکی ڕەق و تەق

بێجگە لە تاڵی ژەقنەمووت

بەرێکی دیکەی نەدابێ.



خۆشت نەوێم.....

خۆشەویستی..

بانترە لەمنیش و لەوان

ئەو دەمانەی

کە ئەستێران سەر دەردێنن

نامەوێ تۆ خەو زڕاو بی

لەدیار ژماردنی ئەوان.



# ئاهەنگەکەی سوهەیل و ناشتنی گوڵێکی سوور



لەکۆتاییدا سوهەیل وانەکانی حیکمەتخانەی بەکۆتا هێنا و ماڵ بە ماڵ هاوڕێ و خزمانی لە ئاهەنگەکەی بەیانی و پۆشینی جلی حەکیمان ئاگادار دەکردەوە. لەگەڵ بەڕێوەبەر باس و خواسی ئەوەیان دەکرد کە بەیانی ئاهەنگەکە چۆن ئەنجام بدەن و کام حەکیم وتار بخوێنێتەوە و چ دەنگ خۆشێکی شاهێن بانگ بکەن بۆ خوێندنەوەی ئاواز و چەکامەکان. جلی حەکیمانی بە دەستەکانی توند گرتبوو و بە دایك و باوکی نیشان دەدا و بە پەرۆشیەوە چاوەڕێی بەیانی دەکرد کە بیپۆشێ.

تەواوی قوتابیان خۆیان بۆ ئاهەنگەکە تەیار(١) دەکرد و ئاواتیان دەخواست کە لە جێگای سوهەیل بوونایە. ئەو دەمەی لە ژووری حەکیمەکان نزیك بوویەوە ناوی دڵارای کەوتە بەر گوێ و لەشوێنی خۆیدا ڕاوەستا، لەپشتی دەرگاکەوە بیستی کە یەکێ لە حەکیمەکان دەیگوت: بەداخەوە دڵارا سەرەتا کچێکی زیرەك بوو، نەمدەویست کار بگاتە دەرکردنی لە حیکمەتخانە، لێ ناچار بووین ئەوە بکەین. وێدەچوو خەمێکی قووڵی هەبێ

---

(١) تەیار: ئامادە

ئەم داماوە، ئیدی ئەمە حیکمەتخانەی مەزنە، هەرکەسێ لە چەند تاقی کردنەوەیەك هەرەس بێنێ ناتوانێ لێرە بەردەوام بێ.

سوهەیل لەدڵی خۆیدا زانیبووی ئەو کچەی عاشقی بووە دڵارایە، لێ کە ئەمەی ژنەوت هێندەی دی دڵنیابوو لە باسەکە و دووبارە بەم هەواڵە ناخۆشە تاسا و خۆشیەکەی لێ بوویە نارەحەتی. خێرا حیکمەتخانەی جێهێشت و ویستی بچێتە دەو جۆبارەکە و لەوێ هەندێ لە خەمەکانی بڕەوێنێتەوە، لێ سەراسیمە بوو ئەو دەمەی تۆزێ لە قوتابخانەکە دوور کەوتەوە ڕوانی کچێکی شین پۆش لە سووچێکدا لەسەر بەردێکی گەورە ڕوونیشتوە و دەگری.

سوهەیل چەند هەنگاوێك لێی نزیك بوویەوە تا بزانێ ئەم غەریبەیە چ کێشەیەکی هەیە ئاوا لەسەر ئەم بەردە ڕەقە سەری وەکۆشی خۆی کردووە و ناڵە ناڵیەتی.

ئەو کاتەی تەواو لێی چوویە پێش کچە هەستی پێ کرد و سەری خۆی بەرز کردەوە و چاوە فرمێسکاویەکانی وەدەرخست کە دەتگوت دانەی مروارین لەسەر ڕوخساری پەرش و بڵاو بوونەتەوە. سوهەیل کە سەیری کرد و زانی دڵارایە لەشوێنی خۆیدا چەقی و خوێن لە دەمارەکانی ڕەق بوو.

دڵارا دوای ئەوەی تێر فرمێسکەکانی ڕژاند بەگریانەوە هاتە دەنگ:

لە کۆتاییدا دەڕۆی و جێمان دێڵی؟ لە کۆتاییدا هەموو خەون و ئاواتەکانی ژیانم دەڕوخێنی و دەیکەیتە پووشێك بەدەم بادا؟ هیچ بەزەییەکت بەم هەموو فرمێسکانە نایەتەوە کە ئێستا بە ئاشکرا دەبینی لەبەر تۆ دەڕژێن؟! ئاخر دەبوایە ئەم فرمێسکانە لە خۆشیدا ڕژابان کاك سوهەیل. بۆچی دەبێ هەمیشە فرمێسکی کچەکان بە نارەحەتی و بە گەرمی بێنە خوارێ؟! ئیمڕۆ لە حیکمەتخانە دەرکرام، ئیدی هیچ شتێکم نەما بۆی بژیم، ئەو حیکمەتخانەیەی ئاواتی منداڵیم بوو تەنێ ساڵێك و شتێك توانیم بەردەوامی پێ بدەم و بە قوربانی تۆم کرد. ئەو دڵەی لە هەموو شتێکم بەنرختر دەزانی و هەمیشە لەنێو بێستانی تەماتەکاندا خەیاڵم دەکرد بە شازادەکەمی ببەخشم، پێشکەشی تۆم کرد و کردمە قوربانی لەڕێی تۆدا.

ئاوی چاوەکانم کە بۆ هیچ شتێك نەمدەڕژاندن و هەمیشە وێنەی مرواری لەنێو گلێنەی چاومدا دەمشاردنەوە ئیمڕۆ هەمووم لە ڕێگای تۆدا ڕێشت. ئەو شۆڕشەی لەگەڵ هێلیندا ڕێکم خست و ژینی خۆم پێ خستە مەترسیەوە ئەمڕۆ لە ڕێگای تۆدا ڕووخاندم و تەنێ تۆز و خۆڵەکەی ماوە. ئەوەی لام ماوەتەوە تەنێ ڕۆحە، گەر ئەویش دەبەی بیبە کاك سوهەیل بیبە.

پێم بڵێ چی دیکەت لێم دەوێ ها؟ چیت دەوێ کاك سوهەیل تاوەکو ڕازی ببی؟ سوێند بە خوا هیچم نەماوە هیچ. لەخۆت ناپرسی کە دەبێ چی ئاوای لە منێکی شەرمن کردبێ کە ئێستا بەم بوێریەوە قسان بکەم!

سوهەیل لەگەڵ ئەم قسانەدا ئاگر لە جەرگی بەربوو، هەستی دەکرد خەریکە لەشوێنی خۆیدا دەتاوێتەوە، دڵی ببوویە دڵۆپێك ئاو و لە چاوەکانیدا دەهاتە دەرێ. هەستی بە شەرمەزاریەکی ئێجگار زۆر دەکرد، لەشوێنی خۆیدا چەشنی بەردێکی بێ جووڵە وەستا بوو و دەگریا و تەنێ گوێی گرتبوو.

دڵارا دەستی پێکردەوە: ئەوە دەشگری دڵ ڕەق! تۆش دەزانی گریان چی یە، تۆش وشەی گریانت بیستووە، وەکو من عاشق بووی؟ نا نا درۆیە درۆیە، هەرگیز ئەو خۆشەویستیەی من بۆتم هەیە ئەو نایبێ بۆت و تۆش ناتبێ بۆی. ئەو عیشقەی من دەبێ لە کتێبەکاندا بنووسرێتەوە، لە مێژوودا تۆمار بکرێ و بکرێ بە فیلم و هەموو جیهان لێی بڕوانن.

سوهەیل بە گریانەوە: بمبوورن، تکایە بمبوورن، ئێوە هەرچی بڵێن حەقی خۆتانە خاتوون، وەلێ تکایە هەڵسە و بڕۆ ماڵەوە، سوێند بە حەکیمی مەزن دڵم پڕ بووە لە خوێن، تکایە خاتوون هەڵسە و بڕۆ ماڵێ، نزات بۆ دەکەم خودا یارمەتیت بدا و من لەبیرکەی، لەمەودوا نامبینی بۆیە زوو لە یادم دەکەی دڵنیابە. ئێوە کەسێکی خانەدان و چاکن، دڵنیام لەوەی کەسی زۆر لەمن باشتر و چاکتر چاوەڕێی ئێوەیە، لەگەڵ منێکی خراپ و بێ دڵدا هەرگیز دڵخۆش نابن خاتوون. من نازانم عیشق چی یە، نازانم کەسێك کەسێکی خۆشبوێ چۆنە، من مرۆڤێکم بەدوای هەوەسەکانمەوەم، تکایە منتان نەوێ تکایە.

- ناڕاست مەبە، ناڕاست مەبە، دەتەوێ بەم گوتانە وام لێبکەی لەیادت بکەم، هەرگیز ئەمە ڕوونادا هەرگیز.

+ باشە خاتوون ئێوە تەنیا هەڵسن بڕۆنەوە، ئاخر لێرە خەڵکێك دەمان بینێ و هەزار قسەمان لەسەر دەکرێ، تکایە لەپێناو منێکی خراپەکاردا شەرم و شکۆی خۆتان مەخەنە مەترسیەوە خاتوونی بەڕێز، باڵاگەردانت[1] دەبم وامەکەن. ئەوە من دەڕۆم و تکایە ئێوەش لەدوای من هەڵسن.

لەگەڵ گوتنی ئەم قسەیەدا سوهەیل پشتی لە دڵارا کرد و تك تك فرمێسکەکانی لەسەر ڕوخساری دادەبەزین. لەنکاو لەدواوە دڵارا بە نەرمی بانگی کرد: کاك سوهەیل...

سوهەیل چاوەکانی سڕین و ئاوڕی دایەوە: بەڵێ خاتوون.

- دەڕۆی؟

+ بەڵێ دەڕۆم.

- دەڕۆی و عیشقێکی پاك لەگەڵ خۆتدا دەڕووخێنی؟

سوهەیل هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی: نەخێر دەڕۆم و مرۆڤێك دروست دەکەم.

دڵارا کە لەبری چاوەکانی هەموو ئەندامەکانی جەستەی دەگریان گوتی:

---

(١) باڵاگەردان: کەسێکە خۆی بگێڕێ بە دەوری یەکێکدا.



بیر لەوە بکەوە کچێکی نێو بێستان، کچێکی حیکمەتخانەی خاوەن ئەوپەڕی شەرم و شکۆ لەبەر تۆ ژینی خۆی خستۆتە مەترسی و هاتۆتە ئێرە دەگری، هیچ باکێکی بەوە نەماوە کە ڕەنگە ئێستا یەکێ لە ناسیاوانی ببینێ و قەراری کوشتنی دەرکرێ، ئەتۆش ئاوا جێی دەهێڵی؟!

+ ئەی هاوار خاتوون، ئاخر بۆ وادەکەی بۆ؟ دەمرم سوێند بێ دەمرم لە خەمی ئێوە. بەهێزبن خاتوون بەهێزبن، دڵنیابە خودا یارمەتیتان دەدا و لەیادم دەکەن و ئەو خۆشەویستیە دەمرێ.

- خۆشەویستی نامرێ کاك سوهەیل خۆشەویستی نامرێ، ڕەنگە ئەمە دواین گفتوگۆمان بێ گوێم لێ ڕاگرە. دەزانی ئەو دەمەی تۆ دەڕۆی و پیوار[1] دەبی دەبمە تاریکی و کوفر، تەنانەت ئەو دەمەی هەورەکانیش شریقە و گرمەیانە و نەقش و نیگارێك چێ دەکەن لەنێو ئەوانیشدا وێنەی تۆ دەبینم. پێم بێژە تۆ بۆچی وا دڕندەی بۆچی؟

+ دڕندە نییم، سوێند بە حەکیمی مەزن دڕندە نییم عاشقم، ئاخر هەرچی تەڕی لاشەمە وا چەشنی مەنجەڵێکی سەر ئاگر لە کوڵان دایە، ئاخر خاتوونی بەڕێز وام لێهاتووە وەکو نالی بڵێم:

بۆ گریەیی تـۆ ڕەنگە منیش هێندە بگرییم
گەوهەر بڕژێنین بە بوڵەندی قـەد و باڵات

---

(١) پیوار: نادیار، غایب.

ئاخر گەر دڕندەبم ئەو فرمێسكانەم لەكوێ بوو؟ دڕندە چووزانێ بگری. دەزانی كە ئەو فرمێسكانەت دەبینم بەچەشنێ گڕ دەگرم كە هەر خودا دەزانێ چیم لێدێ، هەر ئەوەندەم پێدەكرێ كە نزات بۆ بكەم و وێنەی مام هێمن بڵێم:

كە فرمێسكم لەسەر ڕوخساری كیژی دڵشكاو بینی
گوتم یاخوا لەسەر سورگوڵ نەبینم شـەونمێكی تـر

پێم بڵێ بۆچی ئاوا هەموو ژینی خۆت خاڵی كردۆتەوە لە یەك مرۆڤدا؟

- ئاخر ئەو مرۆڤەی تۆ دەیڵێیی هەموو ژیانە، من هەموو ژیان لەنێو ئەو مرۆڤەدا دەبینم.

هەردوو لەنێو ئەم گریانە دابوون، ناوە ناوە سوهەیل كە دەیهەویست بڕوا دڵارا لەدواوە بانگی دەكردەوە: تخوا سوهەیل مەڕۆ و ژینم مەشێوێنە، تخوا بێ كەس و تەنیام مەكە. لەگەڵ ئەم گوتانەدا دووبارە سوهەیل دەوەستا و سەرتاپای ئاگری دەگرت.

لەنكاو سوهەیل ڕوانی وا مرۆیەكی ئاتەشی بەرەو ڕوویان دێ و چەكێكی بڕنەوی لەدەستایە، دڵارا هەر كە لە مرۆیەكەی ڕوانی ترس و لەرزینێكی بێ ئەندازە ڕووی تێكرد. سوهەیل پەشۆكاو گوتی: ئەمە كێ یە دڵارا؟ پێویستە خێرا لێرە دووركەوینەوە.



دڵارا دەمی تەتەڵەی کرد و چ قسەی بۆ نەگوترا، هەر هێندەیان زانی پیاوەکە گەیشتە سەریان و چەکەکەی لێ ڕاکێشان و دەستی بە هاوار کرد:

ئەمەت دەویست دڵارا ها؟ دەتهەویست ئاوا بێ شەرم و ئابڕو ببی و ڕەگەڵ کوڕان بکەوی بۆیە لە ماڵی خۆت دانەدەنیشتی و داوای حیکمەتخانەت دەکرد. شەرت بێ ئەگەر پیاوبم نەهێڵم بچیتەوە ماڵەوە بە ساغی، هەر دەبێ ئەمڕۆ تەرمەکەت بۆ وسو بچێتەوە، بۆ ئەوەی بزانێ ئەگەر ئەویش بێ شەڕەفە ئەوا براکانی بێ شەڕەف نیین.

دڵارا لەگەڵ بیستنی ئەم قسانەدا هێندەی دی لەرزی هاتێ و زۆر بە توندی دەگریا و بە گریانەوە بانگی سوهەیلی دەکرد: کاك سوهەیل تکایە شتێك بڵێ کاکە، پێی بێژە کە هیچمان لە نێواندا نییە، سوێند بەخوا دەمکوژێ سوهەیل دەمکوژێ.

سوهەیل خێرا هاتە دەنگ: ببوورن برا ئێوە بەهەڵە تێگەیشتوون، ئەم خاتوونە لێرە کێشەیەکی هەبوو و دەگریا، من تەنێ هاتم بزانم کێشەکەی چی یە و هەر ئەوەندە، دڵنیابن ئێوە بابەتەکەتان بە هەڵە لێك داوەتەوە.

+ مناڵ هەڵدەخەڵەتێنی بێ ئابڕوو، سوێند بە خوا لە شوێنی خۆت بجووڵێی ڕەقت دەکەمەوە، ئێوە فێرن کە کچان هەڵدەخەڵەتێنن و

دواتریش بە فیڵێك دەتانەوێ خۆتانی لێ دەرکەن. ئەگەر تۆزێك پیاوەتی لە لاشەمدا بێ نایەڵم ئیمڕۆ بۆی دەرچن.

ئیدی کابرا دەستی بە هات و هاوار کرد و بە هەموو هێزی دەنگیەوە جنێوی ئاڕاستەی سوهەیل و دڵارا دەکرد، وردە وردە خەڵکی لە هەراکە نزیك دەبوونەوە و سەیری دیمەنەکەیان دەکرد بزانن چی ڕوودەدا، کابراش کە خەڵکەکەی دەدی هێندەی دی دەینەڕاند و تفەنگەکەی جارێ بە ئاڕاستەی سوهەیل ڕادەگرت و جارێکی دی بە ئاڕاستەی دڵارا. سوهەیل بەردەوام دەیهەویست ڕوونکردنەوە بدا، وەلێ خەڵکەکە و کابرا ژاوە ژاوێکی وایان چێ کردبوو کە دەنگەکەی نەدەگەیی، لەملاوەش دڵارای لاو بەردەوام هارژنی گریانی بوو بەڕووی سوهەیل و خەڵکەکەدا و دەیگوت: ئەی هاوار شتێك بکەن ئەم پیاوە دەمکوژێ، کاك سوهەیل توخودا نامەوێ بمرم، ئاخر دایکم شێت دەبێ من شتێکم لێبێ، سوێند بە حەکیمی مەزن شێت دەبێ، لەبەر خۆم نا لەبەر دایکم تکایە.

خەڵکەکەش هێندێکیان سوهەیلیان دەناسی و بەرگریان لێ دەکرد کە ئەو لەو مرۆیانە نییە کارێکی ناشیاو ئەنجام بدا و ئەم بابایە بوختانی بۆ هەڵبەستووە، لێ هێندێ لەوانەی نەیان دەناسی لەگەڵ کابرادا قسەی ناشیاویان پێ دەگوت و بە مرۆیەکی بەدڕەوشت و ناجسن[١] ناویان دێنا.

---

(١) ناجسن: ناڕەسەن

لەم ژاوە ژاوە دابوون پیاوێكی ڕیش سپی هاتەپێشێ و خەڵكەكەی بێدەنگ كرد و هاواری كرد: هەمووتان بێدەنگ بن، تۆش كابرا تفەنگەكەت دانێ، پێویستە بزانین چی ڕوویداوە و گوێ لە هەردوولا بگرین بەر لەوەی بكەوینە هەڵەوە.

كابرا دووبارە نەڕاندی: ئادەی لاچۆ پیرە پیاو، دەتەوێ بەرگری لە كەسانێكی بەدڕەوشت بكەی بەم تەمەنەتەوە، خێرا لەوێ لاچۆ تاوەكو بە فیشەكێك ساردم نەكردوویەوە.

پیرە پیاوەكە ڕووی تێكرد و هاواری كردەوە: ڕێزی خۆت بگرە كابرا، من سەرۆك هۆزێكی ئێرەم و گەر ئەمجارە فزەت لێوەبێ بەرامبەرم هەموو گیانت دەشكێنم، ئادەی خەڵكینە وەرنە پێشێ بزانین حەق بە كێ یە.

كابرا كە بیستی سەرۆك هۆزە تۆزێك ترسا و قسەی نەكرد، لێ هێشتا لولەی تفەنگەكەی لەسەر دوو لاوەكە لانەدابوو.

پیرە پیاو ڕووی تێكردەوە: ئادەی پێم بێژە چیت لەمانە دیوە ئاوا دەتهەوێ بیان كوژی؟

كابـــرا بە تووڕەییەوە: هێشـــتا هـــیچم نەدیوە! بەیەكەوە لێرە گفتوگۆیان بوو، خوا دەزانێ لە كەیەوە پەیوەندیان داناوە و ئاوا بۆ ژوانی یەكدی هاتوونەتە دەر. من مامی كچەم و حەقمە وەدەنگ بێم و سزایان بدەم.

دواتر پیاوە پیرەکە ڕووی لە سوهەیل کرد و گوتی: ڕاستم پێ بڵێ چیت دەکرد لەگەڵ ئەم کچە؟

سوهەیل بە پەشۆکاویەوە: من قوتابی حیکمەتخانەم مامە گیان، بەیانی ئاهەنگی دەرچوونمە و لەژووریَ لەگەڵ بەڕێوەبەر و مامۆستاکان خەریکی ڕێکخستنی ئاهەنگەکە بووین، لەکاتی هاتنە دەرەوە ئەم خوشکەیەم لێرە بینی لەسەر ئەم بەردە دەگریا و کێشەیەکی هەبوو، تەنیَ بۆ ئەوە چوومە پێشیَ بزانم چ کێشەی هەیە و پێی بێژم بڕواتەوە ماڵێ. زۆربەی خەڵکی شاهێن من دەناسن. هۆ خەڵکینە ئەوە منم سوهەیل، ئەم بابا نەناسراوە ڕێگامی گرتووە و دەیهەویَ بە زۆر تاوانبارم بکا. مەهێڵن برایەك لە براکانتان بەم چەشنە زوڵمی لیَ بکریَ.

ئەو دەمەی خەڵکەکە ناوی سوهەیلیان بیست هەموو تێکڕا بەرگریان لیَ کرد و کابرایان بە زاڵم و زۆردار ناوهێنا، چون زۆربەیان ناوی سوهەیلیان ژنەوتبوو، یاخود منداڵەکانیان لای ئەو خوێندبووی. لەم کاتەدا پیاوەکە ڕوانی بابەتەکە لە بەرژەوەندی ئەو ناگوزەریَ، خێرا بەر لەوەی خەڵکەکە بێنە پێشیَ بە برنەوەکەی نیشانەی لەسەری دڵارا گرت و پلی پێوەنا.

ئەمجارەیان تفەنگەکەی بە ئاڕاستەی سوهەیل سووڕاند، لیَ خێرا قیدار بە ڕوخسارێکی دزێو و لاترقە و چەپێچ[1] هاتە بەردەمی

---

(١) لاترقە و چەپێچ: بریتیە لە شتی نارێکی نابار



و کابرا لە ترسان پشتاو پشت بەربوویەوە. خەڵکەکە هێندێکی ڕایان کرد بەرەو جەستە خوێناویەکەی دڵارا و هێندێکی دیش بەرەو کابرا هێرشیان برد بۆ ئەوەی ڕانەکا و لە چنگیان دەرنەچێ. ئیدی جەنجاڵی و هات و هاوارێك لەوێدا سەری هەڵدا کە دەتگوت ڕۆژی حەشرە و کەس گوتەی کەس ناژنەوێ. دڵارای جوان لەگەڵ فیشەکەکەدا مێشکی پژابوو، عەزیە شینەکەی لەنێو خوێندا سوور بوو بوو، خەریك بوو دوایین هەناسەکانی ژینی بەڕێ دەکرد و خوێنە سوورەکە وردە وردە جەستە سپیەکەی دەنەخشاند. یەکەم جاربوو ببینم ڕەنگی سوور لەگەڵ شیندا هێندە دزێو بێ. یەکەم جاربوو ببینم ڕەنگی سوور بەسەر پەڕەیەکی سپیدا بکرێ ئاوا وێران و ناڕێکی بکا، ئاخر هەمیشە ڕەنگی سوورم پێ جوان بووە ئەو دەمەی لەگەڵ ڕەنگەکانی دیدا ئاوێتە دەبێ، لێ ئەو کاتەی جەستەی دڵارا ئاوا لەخوێندا گەوزا، ئیدی من لە سوور هەڵدەهاتم و نەمدەویست لەگەڵ هیچ ڕەنگێکی دیدا تێکەڵی بکەم.

سوهەیل کە ئەو دیمەنەی بینی وەکو شێتێك لەنێو ئاپۆڕای خەڵکەکەدا دەهات و دەچوو، کە سەیری ئەم جەستە خوێنینەی دەکرد لە تاواندا نەیدەزانی بەکام لادا بڕوا و ڕوو لە کوێ بکا. خوێنە سوورەکەی دڵارا وردە وردە دەچوویە نێو خۆڵە نەرمەکە و ڕێچکەی دروست دەکرد. کێ دەڵێ چەند گوڵ و سەوزایی و درەختی بەرز بەم خوێنە ئاو نەدراون؟ کێ دەزانێ بەڵکو ئێستا ئەم خوێنە ڕێچکەی بەستبێ بۆ بێستانی تەماتەکان و هەزاران

تەماتەی سوور بەم خوێنەی دڵارا هاتبنە بەرهەم، هەزاران خونچە بەم خوێنە کرابنەوە، هەزاران لق و پۆ و چووز[١] تامی ئەم خوێنەیان کردبێ و هەڵیان مژیبێ.

سوهەیل لەشوێنی خۆیدا تاوێك بەچۆکدا کەوت و خەریك بوو لەبەر ژانەسەر مێشکی بێتە دەرێ، لەپڕدا بەرگەی ئەم دیمەنەی نەگرت و هەڵسایەوە و ڕایکرد. خۆشی نەیدەزانی بەرەو کوێ ڕادەکا، لێ بە هەموو توانایەوە ڕایدەکرد و دەیهەویست ئەم ئازارە بە شێت بوون و ڕاکردن وەدەرنێ لە سینەی. هێندەی زانی خۆی لەبەردەم حیکمەتخانەدا دۆزیەوە، ویستی بچێتە ژووورێ و لەبەر دەرگادا قیدار وەدەرکەوت و گوتی: مەڕۆ ئێرە سوهەیل.

سوهەیل بەبێ ئەوەی هیچ بڵێ خۆی لێ لادا و چوویە ژووورێ، ئەسڵەن خۆشی نەیدەزانی بۆچی هاتۆتە ئێرە، وەلێ دیاربوو کە زۆر شێوابوو. دووبارە قیدار لەدواوە بانگی کردەوە: دەڵێم مەڕۆ ئێرە سوهەیل، خێرا بڕۆ دەرەوە. کارێکی خراپ لێرە ڕوویداوە کاکە، بە قسەم بکە و بڕۆ دەرەوە.

سوهەیل بە قسەی قیداری نەکرد و بەدوای ئەو ژوورەدا دەگەڕا کە لێی دەمایەوە، هێندەی زانی خۆی لەبەردەم ژووری بەڕێوەبەردا بینیەوە و دەسکی دەرگاکەی گرت و ڕایکێشا، وەلێ نەبوویەوە. دووبارە ڕایکێشایەوە و هەر نەکرایەوە، دیاربوو لەو

---

(١) چووز: لقی ناسکی تازەی سەوزی درەخت



دیو گاڵەیان دابوو. ئەمجارەیان بە توندی پاڵی پێوەنا و دەرگاکە کرایەوە، وەلێ چی بینی! دووبارە سوهەیل لە شوێنی خۆیدا ڕەق بوو کە ڕوانی وا حەکیم موڕادی بەڕێوەبەر هەر لەسەر کورسیەکەی خۆیدا چەقۆیەکی گەورەیان لەسەر دڵی چەقاندووە و کراسەکەیان لە خوێندا ڕەنگین کردووە.

سوهەیل کە ئەمەی بینی هەموو گیانی کەوتە لەرزین و خێرا پیاوێك لەدواوەی دەرگاکەی داخستەوە و چەقۆی لەسەر بەربینی(١) سوهەیل دانا و گوتی:

لەکاتی خـــۆیدا هــاتی هــاوڕێ، سوێند بە حـــەکیمی مەزن دەنگت لێوەبێ سەرت لە لاشەت جیا دەکەمەوە، لەمڕۆ بەدواوە حیکمەتخانە هی ئێمەیە و ئێوە و حەکیمە کۆن و بەسەرچووەکانتان هیچ مافێکتان لێرە نامێنێ. زۆرمان داوا لە حەکیم موڕاد کرد حیکمەتخانە بداتە دەستی ئێمە و دەست لە بەڕێوەبەری هەڵگرێ، لێ قەبووڵی نەکرد و ئەمە سەرەنجامەکەی بوو. باش بزانە کە حەکیمەکانی تریش ئەگەر نەکشێنەوە لەمە خراپتریان بەسەر دێ. ئێستا چەند دانەیەکیان خەریکی وانە گوتنەوەن و ئەوانەی تریشمان بەفێڵی داوەتێك ڕەوانەی دەرێ کردووە. بەر لەوەی بگەنەوە ئێرە تەرمەکەی تۆش لە تەنیشت حەکیم موڕاد دادەنیشێنین و لەسەر پارچە کاغەزێك دەنووسین: من ناوم سوهەیلە و ئیمڕۆ لەسەر

---

(١) بەربین: قورقوڕاگە لە دیوی دەرەوە

کێشەیەکی کۆمەڵایەتی بەدەستی خۆم حەکیم موڕادم کوشت و دواتر خۆشم لەناو برد. ئەمەت پێ چۆنە هاوڕێ ها؟ وای وای کە خۆشە، بۆ کوشتنی دانەیەکیان هاتبووین و دوویان پێوەبوون.

سوهەیل لەژێر دەستی جەللادەکەدا هەموو گیانی دەلەرزی و خەریك بوو لەهۆشی خۆی دەچوو، ئاخر ئەو هێشتا بەخۆی نەهاتبوویەوە و جەستەی خوێناوی دلارا لەبەر چاوەکانی بوو جەستەیەکی دیکەی بەدوادا هات. دەیهەویست زاری بکاتەوە، لێ هیچی بۆ نەدەگوترا و تەنێ دەلەرزی و جەستەی سپی سپی هەڵگەڕابوو. لەو دەمەی جەللادەکە چەقۆکەی نزیکتر کردەوە لە ملی و ویستی ببڕێ خێرا قیدار لەژووری لە شێوەی مارێکی گەورەدا هێرشی هێنا و کابرا زیڕەی کرد و هەڵهاتە دەرێ. دواتر قیدار هاتەوە سەر شێوەکەی خۆی و گوتی: خێرا سوهەیل لێرە بڕۆ، سوێندبێ ئەمجارە حەقم پێت دا نییە، ئاخر کاژێرێکە هاوار دەکەم مەچوویە ژووری هەر دەڕۆی، وەرەوە سەرخۆت خێرا، وەرەوە سەرخۆت کاکە بەر لەوەی کەسێك بێتە ژووری لێرە بڕۆ. سوهەیل لەگەڵ ئەم هەموو هاوارەی قیداردا هێشتا لە شوێنی خۆیدا ڕەق بوو بوو، پێیەکانی نەدەجووڵان و تەواو شێوابوو. ئەو دەمەی سەیری تەرمەکەی دەکرد هێندەی دی ترس و پەشۆکان ڕووی لێدەکرد. دووبارە قیدار هاواری کردەوە:

ئەی خودایە تووشی چی بووم ئەی هاوار، ئاخر لەبەر مامۆستای گەورەمان دانیال نەبێ کە وەسێتی بۆ کردووم ئاگادارت بم من چ



حەقم بە تۆ و هاوڕێیەتی تۆدا هەیە، کاکە بڕۆرە دەرێ و تووشی کێشەمان مەکە.

لەنکاو سوهەیل وەدەنگ هات: ڕێگای ماڵێ نازانم، خەریکە سەرم دەتەقێ و نازانم پێیەکانم بەکام ئاڕاستە بجوولێنم قیدار.

+ من دەڕۆم و لەدوام وەرە، تەنێ لەدوام وەرە دەتگەیەنمە ماڵێ، هیچی هەڵە نەکەی سوهەیل لە شوێنکەوتنی من زیاتر.

ئەو ڕۆژە قیدار بەحاڵ سوهەیلی گەیاندەوە ماڵێ کە هیچ هۆشی لەسەر خۆیدا نەبوو، چەند جارێك لە ڕێگاکەدا بەملاو لادا دەکەوت و هەڵدەنگووت[1]، ئەوەی دیبای لە ڕەنگە پەڕیوە سپیەکەی دەترسا و هەڵدەهات.

ئیدی سوهەیل کەوتە ژێر جێگا و چەند ڕۆژێك بوو بنەماڵەکەی بەتەمای ژیانی نەبوون. باوکی چەند دکتۆری هێنابوویە سەر بۆ ئەوەی چارەی بکەن و هەڵسێتەوە، لێ سوهەیل بەچەشنی شێتێك ناوە ناوە دەینالاند و زۆرجاریش لە خەودا زیرەی لێوە دەهات و هەموویانی ڕادەپەڕاند. ئیدی قسە و باس لە ئاهەنگەکەی سوهەیل لەگۆڕێ نەما و لەنێو شاردا مشت و مڕ و ئاژاوە سەری هەڵدا لەسەر کوشتنی لەناکاوی حەکیم موراد و کەسوکارەکەی داوای دۆزینەوەی بکوژەکە و خوێنەکەیان دەکرد.

---

(١) هەڵەنگوتن: ساتمەکردن

هەر لەم ماوەیەی کە سوهەیل لەژێر جێگابوو حیکمەتخانەی مەزن هەرەسی هێنا و بە فەرمانی پادشا دەرگاکەی گاڵە درا و قوتابیەکان بەسەر حیکمەتخانەکانی دیکەدا دابەش کران. بەداخەوە ئەو قوتابخانە مەزنەی ساڵەهای ساڵ بوو لە شاهێندا دەیان حەکیمی پەروەردە دەکرد ئیمڕۆ کەسانێکی توندڕەو بەرەو داڕووخانیان برد و هەرەسیان پێ هێنا. دوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆر و شکات کردنی حەکیمە کۆنەکان لە بزووتنەوەی سەرخەرانی حیکمەت، دەرکەوت کە حەکیم ناسڕ و چەند هاوەڵێکی پیلانی ئەم کوشتنەیان داناوە، چون حەکیمانی دی ئەوەی خەریکی وانە وتنەوە بوو ئەوەی تریشی بەفێڵ بۆ داوەت برابوون و تەنێ چەند کەسێکی کۆمەڵەی حەکیم ناسڕ لەژووریّ مابوونەوە. دوای چەند دانیشتنێکی دادگا بڕیار درا حەکیم ناسڕ و چەند هاوەڵێکی لە سێدارە بدرێن و ئیدی باس و ژاوەژاوەکەی شاهێن وردە وردە خامۆش بوویەوە. لەدوای ناسڕی حەکیم کۆمەڵەی سەرخەرانی حیکمەت ئەو بەهێزیەی جارانی نەما و زۆرکەس لێیان کشایەوە، لەگەڵ ئەم لاوازیەشیدا کۆمەڵەکە پەرتەوازەییان تێ کەوت و بوونە چەند تاقم و دەستەی جیا جیا لە یەکدی. هەر ئەم کۆمەڵە خراپە وای کردبوو لە شارەکانی دی کە ناوی حیکمەتیان دەبیست ڕاستەوخۆ خەڵکەکە هزری بەلای کوشتن و برینددا دەڕۆیی. وەلێ خراپ بوون و لادانی گرووپێك یان چەند کەسێك هەرگیز مانای خراپ بوونی حیکمەت و حیکمەتخانە

نییە، وەك چۆن لە هۆزێكدا خراپ بوونی چەند كەسێك مانای خراپ بوونی هۆزەكە نییە. لە كۆتاییدا دەركەوت ئەمانە لە شار و وڵاتانی دەرەوە كۆمەكی دەكرێن بۆ ئەوەی حیكمەت و ئاین لەبەر چاوی خەڵكیدا قێزەون بكەن و زانست لە شاهێندا نەهێڵن. دڵارای جوانیش بەرەو جیهانە باڵاكەی تر هەنگاوی ناو لەدوای خۆیەوە چەندین حیكمەتخانەی بۆ كچەكان جێهێشت، ئیدی لە شاهێندا تاوەكو ئیمڕۆ چەندین حەكیمی كچ هەڵكەوتوون و لە قوتابخانەكان خزمەت دەكەن.

سوهەیل نزیكەی مانگێك لە ماڵێ نەچوویە دەرێ تاوەكو وردە وردە بەرەو باشبوون ڕۆیی و دڵ و هۆشی هاتەوە جێگای خۆی، لێ هەر جارێ جەستەی خوێناوی دڵارای بەبیر دەهاتەوە لە پڕمەی گریانی دەدا. وردە وردە هەوڵی دەدا تێكەڵی خەڵك و هاوڕێیانی بێتەوە، بە تایبەت هاوڕێكانی حیكمەتخانەی زۆریان خۆشدەویست و ناوە ناوە سەریان لێدەدا.

ڕۆژێك ئەو دەمەی بۆ پیاسە چووبوویە دەرێ، لەژێر یەكێك لە درەختەكانی دەو جۆبارەكە نامەیەكی بۆ یەكێك لە هاوڕێكانی نووسی كە لە پریاسكە خاتوونەوە نزیك بوو، بۆ ئەوەی هەواڵی خاتوو پریاسكە بزانێ و لەو ماوەیەدا خۆی كۆكاتەوە بەڵكو بتوانێ بچێتە داوای، لێ ئەو دەمەی نامەكەی گەیی و هەواڵ هاتەوە كە پریاسكە خان شووی كردووە دووبارە جەرگی سوهەیل



زیواڵ زیواڵ[١] و پارە پارە بوویەوە و گەڕایەوە دۆخی جارانی. بەرگەی ئەم هەواڵەی نەگرت و خێرا ڕای کردە سەر کانیەکە، وەلێ چی بینی! چاوی بە هیلالی قوتابی ئازیزی کەوتەوە کە چەند ساڵ بوو نەیدیبوو، لێ لە تاوی خاتوو پریاسکە و ئازارەکەی سینەی بەری بەهیچ لایەکدا نەبوو، چەشنی شێتێك لەوێدا هاتوچۆی بوو.

هیلالی سوور لەگەڵ دوو سێ دانە لە هاوڕێکانی لە دەوروبەری کانیەکە ڕوونیشتبوون و دیاربوو لە بابەتێکی گرنگ دەدوان. ئەو دەمەی چاویان بە سوهەیل کەوت کە جووڵە و هاواری سەیر سەیری دەکرد یەکێ لەوان گوتی: وابزانم لێرە هەڵسین باشە هیلال، دەڵێن شێتەکان دەست دەوەشێنن و بەهێزیشن. ئەگەر هێرش بێنێ ڕەنگە بە هەرسێکمان بەرووەستی نەیەین. هیلال هێندێکی سەرنج دا و مرۆیە سەیرەکەی لا غەریب نەبوو، تۆزێك لێی چوویە پێش و سەرنجەکەی چڕتر کردەوە و بۆی دەرکەوت کە ئەمە مامۆستا سوهەیلە ئاوا چەشنی شێتێك لە دەوری کانیەکە دەسووڕێتەوە و خێرا دواندی.

+ سڵاوت لێبێ مامۆستا، ئایا ئێوە باشن؟

سوهەیل لەگەڵ قسەکەی هیلالدا ئاوڕی دایەوە و سەرنجی لە مێرد منداڵەکە دا، ئەگەرچی هۆشی لەسەرخۆی نەبوو، وەلێ

---

(١) زیواڵ: پارچەی کاڵا و شتی دڕاو

هیلالی بەزوویی ناسیەوە و لەبەرامبەریدا ڕەق ڕاوەستا. خێرا یەکێ لە هاوڕێکانی هیلال کە ناوی جەمال بوو لەدواوە هاواری کرد: ئەمە چی یە هیلال ئەم شێتە هاوڕێتە؟ ئەوە لەکەیەوە هاوڕێیەتی شێتانیش دەکەی نەمان زانیوە؟

هیلال سەیری جەمالی کرد و گوتی: ئەوە مامۆستا سوهەیلە، کاتی خۆی لەلایم دەخوێند، ئەو شێت نەبوو بەڵکو مامۆستایەکی زۆر زیرەك بوو، نازانم چی لێ بەسەر هاتووە، چون ماوەیەکی زۆرە نەمدیوە!

جەمال هاتەوە دەنگ: هەمان ئەو سوهەیلە سەر لێ شێواوەی حیکمەتخانە دەڵێی؟ وای وای حەکیمی مەزن چۆن تۆڵەی لێ کردۆتەوە دوای ئەو بوختانە مەزنەی بە حەکیمی گەورەمان ناسریان کرد و بە تاوانباریان لە قەڵەم دا، ئادەی هیلال لێی دوورکەوە و با لێرە بڕۆین، بیرت بێ ئەو لە کۆمەڵەکەی ئێمە نییە و کەسێکی گومڕایە.

لەگەڵ ئەم قسەیەدا هیلال چوویەوە نێو هاوڕێکانی و لەوێ دوورکەوتنەوە، سوهەیلیش چەشنی درەختێك لە جێگاکەی خۆی سەراسیمە ببوو لەم دیمەنە و قسەی بۆ نەدەگوترا.

ئەو هیلالەی ئەم هەموو ماوەیە پەروەردەی کرد و وەکو چاوانی خۆی دەیپاراست و خۆشی دەویست ئێستا بووەتە یەکێك لە کۆمەڵەی سەرخەرانی حیکمەت و شوێن گرووپەکەی



حەكیم ناسڕ كەوتووە! سوهەیل هێندەی دی مێشكی كەوتە ژان و لەوێش دووركەوتەوە، لێ نە ڕێگای ماڵەوەی پێ دەزانی و نە هیچ جێگایەكی دیش. ئیدی لەو ڕۆژەوە تووشی نەخۆشی دەروونی هات و هیچ كەسێكی نەدەناسیەوە. ڕۆژانە بە چۆڵایی و چیاكاندا دەگەڕا و خۆشەویستی بۆ دار و بەرد و بەندەنەكان[1] دەردەبڕی. هەر باڵندەیەك یاخود گوڵێك و لقێكی سەوزی دیبایە لە بەرامبەریدا ڕوودەنیشت و چەندین جار پێی دەگوت خۆشم دەوێی و هۆنراوەی بۆ دەچڕی. هێندێ جار ئەو دەمەی لە باڵندەكان نزیك دەبوویەوە و ئەوان دەفڕین بە ڕاكردن وەدوایان دەكەوت و پڕ بە گەرووی لە هارژنی دەدا و دەیگوت خۆشم دەوێی و ئەم هەواڵە بە هەموو باڵندەكانی دیش بگەیەنە.

ئیدی سوهەیلی پیر لێرەدا چیرۆكەكەی ڕاگرت و بە كچەی هەڵاتووی گوت ئایا ماندوو نەبووی؟

- زۆریش، دەستم شل بووە و پەنجەكانم سڕ بوون، لێ لە نووسینی ئەم ڕۆمانە تێر نابم. ئای لەم داخ و ئازارە! مردنی دڵارا و شێت بوونی سوهەیل زۆر زۆری ئازار دام، چاوەكانم لەبەر مەرگی دڵارا موددەتێكە فرمێسك دەڕێژن.

بەڕاستی ئەم كچە چیرۆكەكەی زۆر لە هی من دەچوو، لەبەر ئەوە داخی خستە دڵم. ببوورن كە هێندێك لە پەڕەكانم تەڕ كرد

---

(١) بەندەن: كێو

مامە گیان، کۆتاییەکی ئێجگار ئازار بەخش بوو، چاوەنووڕی ئەوە بووم کە دڵارا ببێتە هی سوهەیل، چون بەڕاستی زۆر لە یەکدی دەوەشانەوە. ئیدی بەپەرۆشم بزانم سوهەیل دوای ئەم نەخۆشیە چی لێهات، وەلێ بەر لەوە بە چەند دێڕێکی پێشەوا بوسیری دڵخۆشمان بکەن.

+ ببوورن کچم تۆزێ خەمم پێدان. دڵارا کچێکی زۆر باش بوو، میهرەبان بوو، دڵێکی زۆر نەرمی هەبوو، وەلێ ئەو بە تەواوی نوقم بوو لە دەریای عیشقدا و نەیتوانی مەلەی تێدا بکا. هەڵەی ئەم کچە ئەوە بوو کە نەیتوانی ئەم عیشقە جەستەییە دونیاییە بگۆڕێ بە عیشقێکی ڕۆحی خودایی. ئەگەر کارێکی لەم بابەتەی کردبا و ئاشنای نێو جیهانی ڕۆح ببا زۆر باشتر دەبوو بۆی. ئێستا با بچینەوە خزمەت پێشەوا و بزانین لەگەڵ عیشقەکەیدا بەکوێ گەیی.

دوای ئەوەی پێشەوا لە دادگاکەدا ویستی بە نەفسی خۆی بسەلمێنێ کە عاشق بووە، وەلێ ئەو هەر لاملی کرد و دانی نەنا، ئەمجارەیان دووبارە لێی دێتەوە مەیدان و دەفەرموێ:

ئــــایـــا عاشق تەمای هەس خۆشەویستی وەشارێ

وەختێك دڵی داگیرسێ و فرمێسکیش بێنە خوارێ؟[1]

---

(١) عەرەبیەکەی:

اَیَحسَبُ الصَّبُّ أَنَّ الحُبَّ مُنکَتِمٌ    مابَینَ مُنسَجِمٍ مِنهُ وَمُضطَرِمِ

هەرکەسێك عاشق بێ بێگومان فرمێسکی زۆر دەبن و دڵیشی بە ئاگرێکی سووتێنەر دادەگیرسێ، کەواتە ئەو مرۆڤە گەر تا بەیانی بڵێ عاشق نییم و بیەوێ بیشارێتەوە بێگومانم کە پێی ناشاردرێتەوە، چون ئەوە بابەتێك نییە هی شاردنەوە بێت. باشە گریهان شاردتەوە و هەوڵی تەواوت بۆی دا، ئەی چ ناوێك لەو فرمێسکانەت بنێین کە بەردەوام دەڕژێن و ڕێچکە دەبەستن؟ ئەی باشە ئەم دڵەت بۆچی ئاوا دەبرژێ و لەهیچ جێگایەکدا ئۆقرەی نییە؟ بێگومان ئەو جۆرە کەسەی چاو بە فرمێسکە و دڵی شەیدای خۆشەویستەکەیەتی ئەگەر دان نەهێنێ بەوەی کە عاشقە ئەوە بەهەڵەدا چووە و پێی باوەڕ ناکرێ و بەم دان نەهێنانەی دەردەکەی چارە نابێ، بەڵکو چارەی ئەو لای مەعشووقەکەیەتی و دەبێ هەوڵی پێگەیشتنی بدا. ئیبن فاریز فەرموویەتی:

خۆشەویستیم شاردەوە و فرمێسکم ئاشکرای کرد
مـراندم و شەوقی دڵ هەڵی ساند و ئـیحیای کرد

- ئەی گەر ئەم مەعشووقە مەعشووقێکی ڕۆحی بوو، بۆ نموونە کەسێکی وەکو نێردراوی مەزن، چۆن هەوڵی پێگەیشتنی بدەین لەکاتێکدا ئەو کۆچی کردووە؟

+ شوێن ڕێچکەکەی ئەو بکەوە و زۆر باسی بکە، بێگومان هەر شتێك خۆشت بوێ زۆر لەسەر زارتە و بەردەوام پێت خۆشە ناوی بێنی، هەر کاتێك خۆشەویستیەکەی تۆ گەیشتە ئەو ڕاددەیە کە

هەمیشە لەسەر زارت بێ و بەردەوام یادی بکەی دڵنیابە ئەوکات پێی دەگەی و دەیبینی، گەر لەم جیهانەش نەبێ لە جیهانەکەی دی لەگەڵی دەبی، چون هەروەکو خۆی فەرموویەتی: مرۆڤ لە دوارۆژ لەگەڵ ئەو کەسەیە کە خۆشی ویستووە.

- باشە شتێکی دیکە، بیستوومە دەڵێن ئەگەر عاشق نەبێ جوانی مەعشووق دەرناکەوێ، ئەمە چۆنە؟

+ بەڵێ ئەمەش یەکێکە لەو بابەتانەی کە گەورەمان مەلای جزیری باسی لێوە کردووە و فەرموویەتی:

حوسنێ بـێ ئایینەئـێ عــیشقێ تەجەلییێ نادەت
عیشقێ مەحمودی د مەعنا نەمەکێ حوسنا ئەیاس

بەڕاستی جوانی لە مەعشووقدا نومایان[1] نابێ و لەنێو خەڵکیدا بڵاو نابێتەوە بەبێ هەبوونی ئاوێنەی عیشق، چونکە گەر عاشق لە ئاوێنەی عیشقدا سەیری مەعشووقەکەی نەکا ئەوا حەقیقەتی جوانی و قەشەنگی وردەکاریەکانی مەعشووق دەرناکەون. خۆ ئەگەر جوانێك هەبێ لەوپەڕی جوانیدا بێ، بەڵام کەسانێك نەبن عاشقی بن و باس و خواسی جوانیەکەی بکەن هەرگیز جوانیەکەی دەرناکەوێ و هەر بە شاراوەیی دەمێنێتەوە. ئەوەتا ئەگەر سوڵتان مەحمود عاشقی ئەیازی خزمەتکاری خۆی

---

(١) نومایان: دەرکەوتن



نەبوایە هەرگیز ناوی ئەیاز نەدەبرا و جوانیەکەی ئەو هەر بە شاراوەیی دەمایەوە لە دونیادا.

ئینجا دوای ئەوەی پێشەوا بوسیری بە نەفسی خۆی گوت دان نەهێنانی تۆ بێ سوودە و هەرگیز ناتوانی عیشق بشاریەوە، دووبارە بەڵگەی بۆ دێنێتەوە کە ئەو عاشق بووە و دەفەرموێ:

عیشق نەبا نەتدەڕێشت ڕۆندك لەسەر وێرانە

خـەو لە چاوت ناتۆرا بەم کێو و درەخــتانە[1]

ئەو دەمەی مرۆڤ خۆشەویستەکەی سەفەر دەکا و شار جێ دێڵێ هەست دەکا لەدوای وی ئەم شارە مەزنە وەکو وێرانەی لێ هاتووە، گەڕەکەکان هیچ مرۆڤێکیان تێدا نییە، کۆڵان و شەقامەکان پارچە پارچە و شەق شەق بوون و هەر بەشێکی بەلایەکدا کەوتووە، هەموو جێگای نیشتەجێ و خانووەکان دارماون و کەوتوون بەسەر یەکدیدا.

هەموو شتێك لەم شارەدا نامۆیە، تەنانەت عاشق خۆشی لەم کاتەدا نامۆ دەکەوێ، هەروەکو نالی فەرموویەتی:

لەکن من با وجوودی ناس و ئەجناس

کەسی تێدا نییە ئــەم شــارە بێ تـۆ

---

(١) عەڕەبیەکەی:

لَولا الهَوى لَم تُرِق دَمعاً عَلى طَلَلِ     وَلا أَرِقتَ لِذِكرِ البانِ وَالعَلَمِ

هەر لەبەر ئەمەیە کە پێشەوا دەفەرموێ ئەگەر عیشق نەبایە بۆچی لەسەر ئەم کاولە خانووە وێران بووانە فرمێسکت دەڕشت؟ ئاخر ئەم خانووە وێرانانە ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان مەعشووقی تێدا نەبوایە هی ئەوە بوو تۆ فرمێسکی لەسەر بڕژێنی؟! خانوویەك کە لە خاك و قوڕ بنیات نراوە و ڕۆژانە هەزار جار پێی پێدا دەنێی ئێستا لەلات پیرۆز و گەورەیە، چون دەزانی ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەوی تێدا ژیاوە و هێشتا بۆنی ئەوی تێدا ماوەتەوە بۆیە ئاوا فرمێسکی لەسەر دەڕێژی، کەواتە ئەمە کاری خۆت نییە و کاری عیشقە وادەکا لەسەر ئەم خانووانە بگری.

دیارە ئەو دەمەی پێشەوا بوسیرِی سەیری شارەکەی یاخود خانووەکەی نێردراوی مەزنی کردووە کە لەدوای ئەو وەکو وێرانەی لێ هاتووە بەرگەی نەگرتووە و فرمێسکی لەسەر ڕشتووە. ئینجا دووبارە دەفەرموێ ئەگەر عیشق نەبوایە هەرگیز بەهۆی بیرکەوتنەوەی درەختی بان و کێوە بەرزەکە خەو لە چاوانت نەدەتۆرا. دیارە ئەو دەمەی پێشەوا درەختێکی کەوتۆتەوە یاد بەناوی (بان)، کە نزیکە لە ماڵی دولبەرەکەی و هەموو جار خۆشەویستەکەی لەگەڵ هاوڕێکانیدا لەژێری دادەنیشتن و یەکێکە لە درەختە بۆنخۆشەکان کە ڕۆنیشی لێ دەردەهێنرێ بەناوی ڕۆنی بان. هەروەها یەکێك لەو کێوە بەرزانەی هاتۆتەوە یاد کە خۆشەویستەکەی بەسەریدا هەڵزناوە و لەوێدا ڕوونیشتووە. کاتێك خەیاڵی ئەمانەی کردووە برینی

کولاوەتەوە و ناڕەحەتی دایگرتووە کە چیدی مەعشووقەکەی پێیە پیرۆزەکانی لەژێر درەختەکە دانانێت و بە بۆنی ژێر پێی ئەو کێوەکە پیرۆز و بۆنخۆش نابێ. هەر لەبەر ئەمەیە دەفەرموێ ئەگەر عیشق نەبوایە تۆ چیت لە کێو و درەختێك دابوو لەبەر ئەوان خەو لە چاوانت بتۆرێ.

-بەڕاستی سەیرە! بە سەیرکردنی هەر شتێك کە خۆشەویستەکەی هێناوەتەوە یاد فرمێسکی ڕشتووە و خەوی لێ تۆراوە!

+ئاخر کچی خۆم نوستن لە تەڕاییەك پەیدا دەبێ کە لە گەدەوە بەرز دەبێتەوە بەرەو دەماغی مرۆڤ و وادەکا ئەم مرۆڤە خەوی لێ بکەوێ، خۆ عاشقیش وەکو باسمان کرد هەردەم گەرمایی نێو سینەی لەزیادبوون دایە بە بیرهاتنەوەی خۆشەویستەکەی، کەواتە بەهۆی ئەم نێڵەی[1] سینەیەوە ئەم تەڕاییە وشك دەبێ و خەوی لێ ناکەوێ. دواتر ئەم تەڕاییەی دەبێتە هۆی خەوتن بەزۆری لە خواردن و خواردنەوە پەیدا دەبێ، بەڵام کەسی عاشق ئەو دەمەی خۆشەویستەکەی دەکەوێتەوە یاد و دڵی دادەگیرسێ هەرگیز ئارەزووی بۆ خواردن و خواردنەوە ناجووڵێ، کەوابوو چۆن خەوی لێ بکەوێ؟!

ئەم جارەیان پێشەوا بوسیرِی توندتر لە جاران هێرش دەکاتە سەر نەفسەکەی خۆی و لۆمەی دەکا کە بۆچی دان بە عاشق

---

(١) نێڵە: کڵپەی ئاگر

بوونت دا ناهێنی لەکاتێکدا چەندین بەڵگە لەگۆڕێ دایە کە تۆ عاشقی و دەفەرمویٚ:

پــاشی شــاهـێدی دانــی فـرمێسك و هەم نەخۆشی
چۆن ئینکاری حوب دەکەی تۆ ئەگەر خاوەن هۆشی؟[(١)]

تۆ ئەگەر مرۆڤێکی عاقڵ و خاوەن هۆشبی هەرگیز نکۆڵی لە عیشق ناکەی و دانی پێدا دێنی، لەکاتێکدا دوو شایەد هەن دەیسەلمێنن کە بەڵێ تۆ عاشقی و هەردوو شایەدەکەش لەو دادپەروەرانەن کە هەرگیز درۆ ناکەن و هەم لەڕووی ئاین و هەم لەڕووی نەریتەوە شایەدیەکەیان وەردەگیرێ لەسەرت. یەك لە شاهێدەکان فرمێسکی چاوەکانتە و ئەوەی تریش نەخۆشیە بەردەوامەکەتە، هەردووکیان هاتوونەتە دادگا و شایەدیت لەسەر دەدەن و دەڵێن ئەم مرۆیە عاشق بووە، چون ئەگەر عاشق نەبا هەرگیز ئاوا نەخۆش و ڕەنگ زەرد و چاو بە فرمێسك نەدەبوو. هەردوو شایەدەکانیش لەخۆتن و باوەڕ پێکراون. ئەوەتا حەکیمی مەزن فەرموویەتی(دوو کەسی دادپەروەر لەخۆتان بکەنە شاهێد[(٢)]). کەواتە تۆ ئەگەر سوێندیش بخۆی لە دادگادا کە عاشق نی سوێندەکەت قەبووڵ ناکرێ و ڕەت دەکرێتەوە، چونکە

---

(١) عەڕەبیەکەی:

فَكَيفَ تُنكِرُ حُبّاً بَعدَما شَهِدَت بِهِ عَلَيكَ عُدولُ الدَّمعِ والسَّقَمِ

(٢) سووڕەتی تەڵاق، ئایەتی ٢.



دوو شاهێد هەن دەیسەلمێنن کە عاشقی و پێویستە بڕیاری دادگا بەسەرتدا بسەپێنرێ. مەگەر نەتبیستووە نێردراوی مەزن فەرموویەتی(داواکار دەبێ شاهێد بێنێ، ئەگەر نەیهێنا ئەوکات کەسی داوا لەسەر تۆمارکراو سوێند دەخوا)، وەلێ تۆ مادام شاهێد هەیە هەرگیز ناتوانی سوێند بخۆی، ئەوکاتە سوێند و دان نەهێنانی تۆمان قەبووڵ بوو کە شاهێد نەبوایە. کەواتە هیچ ڕێگایەك نەمایەوە کە خۆت دەرباز بکەی و نکۆڵی لە عیشق بکەی، هەرکاتێ نکۆڵیت کرد فرمێسك و نەخۆشیەکەت بە درۆت دەخەنەوە. وەفاییش دەفەرموێ:

یا نەخۆشی چاوی تۆم یا بێقەراری زوڵفی تــۆ
عاشقی بێ چارە قەت بێ دەرد و واوەیلا نەبوو

وابزانم ئیدی بگەڕێینەوە سەر ڕۆمانەکەمان ئەگەر هیچ پرسیارێکت نییە.

- نا هیچ پرسیارم نییە، بەڕاستی ئەم دێڕانە سەراسیمەیان کردووم، ئەمە چ عیشقێکە لە دڵی ئەم پیاوە مەزنەدا بووە خوایە! بێگومان کەسێك بەم چەشنە عاشقی نێردراوی مەزن بووبێ هەردەبێ پێی بگا. ئێستا بفەرموو با بگەڕێینەوە سەر باسەکەمان، پەرۆشی ئەوەم بزانم سوهەیل چی لێهات.






## ( پاژی دووەم )
## سوهەیلی حەکیم و دوو قوتابییەکەی

سوهەیل لەدوای مەرگی دڵارا و شووکردنی پریاسکە و بینینەوەی هیلال بەم چەشنە هۆشی لەدەست دا و بەکەمی نەبایە ڕووی لەماڵێ نەدەکردەوە. هیچ مرۆیەکی نەدەناسی و ئاشنایەتی لەگەڵیدا چێ نەدەکرد، ئەوەی خۆشی دەویست تەنێ فڕندە[١] و گژوگیا و درەخت و خۆڵ و بەردی زورگ و سەرشاخەکان بوو. چەند جارێك باوکی دکتۆری دێنا بۆ چارەکردنی، وەلێ هەموو جار دکتۆر یەك قسەی دووپات دەکردەوە و دەیگوت: ئەم کوڕە زۆر ئازار دراوە، لەمەولا نابێ بە بچووکترین هۆکاریش دڵی ئازار بدرێ. ئومێدمان وایە بە تێپەڕبوونی کات هۆشی وەکو جارانی لێ بێتەوە، لێ ئەو کاتەی چاکیش بوویەوە دەبێ ئاگاتان لە دڵی بێ و نەهێڵن خەم ڕووبەڕووی ببێتەوە و تەنیا بێ. ئیدی لەماڵێ هەرچی گوتبایە بۆیان جێبەجێ دەکرد و بەهیچ چەشنێك ڕێگری چوونە دەریان لێ نەدەکرد و دەترسان لەوەی غەمباری بکەن حاڵی پتر تێك بچێ. ناوە ناوە قیدار خۆی نیشانی دەدا و هەوڵی ئەوەی دەدا ڕابردووی بێنێتەوە یاد و لە هەموو گرد و دۆڵێك وەدوای دەکەوت، لێ ماندووبوونی ئەویش بێ ئەنجام دەمایەوە و بەهیچ

---

(١) فڕندە: باڵندە



شێوازێك سوهەیل قیداری نەدەناسیەوە. هەندێ جاریش لەگەڵ قیدار دەبوویە شەڕ و هەرایان لەسەر ئەوەی قیدار دەیگوت مەڕۆ فڵانە جێگا و سوهەیل دەچوو.

دوو هەفتە بەسەر نەمانی هۆشیدا چووبوو، شەوێك لە شەوەکان لەخەودا دانیالی پیری بینی کە کراسێکی درێژی سەوز و تاجێکی زەردی زێڕینی لەسەردابوو بەرەو ڕووی سوهەیل دەهات. بەدەستی ڕاستی دەفرێکی زیوینی چرووسکەداری گرتبوو کە ئەم ناوەی ڕۆشن کردبوویەوە. دوای نزیك بوونەوە هاتە دەنگ و گوتی: کەسێك مورید و قوتابی من بێ هەرگیز بەبێ عەقڵی نایەتەوە بۆ ئەم جیهانە، لەگەڵ ئەم قسەیەدا دەفرە ئاوەکەی بەتوندی بە ڕوخساری سوهەیلدا کرد و دەم و دەست لە خەو ڕاپەڕی و لە هارژنی دا. هانە هانی لێوە دەهات و ڕوخساری ئارەقەی کردبوو. خێرا هەڵسایەوە و لە حەوشەکەدا ڕوخساری خۆی جوان شۆرد و ڕابردووی کەوتەوە بیر و دەستی کردە گریان، نەیدەزانی کەی خەوتووە و ئەمە چ کاتێکە و خێرا هاتەوە ژوورێ. دایکی کە لەگەڵ هارژنەکەی وەخەبەر هاتبوو دەستی بە گریان کرد و گوتی: ئەی نەمێنم بۆت کوڕی ئازیزم، هێندەیان گوت کوڕەکەت زیرەکە و یەکەمی حیکمەتخانەیە تا چاوێنیان[١] کردی و ئاوەها عەقڵت لەدەست دا. جلی حەکیمانت وەدەست گرتبوو و نیشانی ئێمەت دەدا و بەیانی ئاهەنگی دەرچوونت

---

(١) چاوێنی: چاوەزار

بوو ڕۆڵە، چەندە دڵت خۆشبوو. ئەی هاوار لەم بەڵایە، خۆ من دامنابوو دوای ئاهەنگی دەرچوون ژنت بۆ بێنم کوڕە نازدارەکەم، حەکیمی مەزن سەبەبکارت بگرێ، ڕەببی کوڕم بیگرێ.

سوهەیل بە سەرسامیەوە: چی بووە دایە! ئەم قسانە چی یە دەیکەی، بۆ من چ کێشەیەکم هەیە؟!

لەگەڵ ئەم قسەیەی سوهەیلدا دایکی چاوی ئابڵەق بوون و گوتی:

نەکا چاك بووبیەوە کوڕم!

+ تێناگەم چی دەڵێی دایە، ئایا من نەخۆش بووم؟ بیرم نییە چ کاتێك خەوم لێ کەوتووە و دوێنێ لەسەر کانیەکە بووم و بە خەیاڵم دا نایێ کە چۆن هاتوومەتەوە!

دایکی لە خۆشیاندا شاگەشکە بوو و گوتی: یانی من دەناسیەوە ڕۆڵە؟

+ ئەی هاوار دایکە شێتم مەکە، کەس هەیە دایك و باوکی خۆی نەناسێ، خێرا پێم بێژە چی ڕوویداوە؟

لەو دەمەدا دایك و باوکی هەردوو لە خۆشیاندا باوەشیان بە سوهەیلدا کرد و ئەسرینی خۆشیان بەسەر شانەکانیدا ڕژاند، بەسەرهاتی نەخۆشیەکەیان بۆی گێڕایەوە و سوهەیل گەلێ غەمبار بوو بەم باسە.



دوای ئەم ڕووداوانە سوهەیل بەتەواوی لە خەڵکی دوور کەوتەوە و گۆشەگیری هەڵبژارد. گەلێ جار هاوڕێکانی دەهاتن تاوەکو بێتە دەرێ و پیاسەیان لەگەڵ بکا، لێ سوهەیل داوای لێبوردنی دەکرد و دەیگوت ماندووم. تەنانەت ئەو دەمانەی دەهاتە دەرێش هەر بە تەنیایی دەسووڕایەوە و سەردانی بناری شاخەکە و کانی و جۆبارەکانی دەکرد و زۆرجاریش هۆنراوەی دەنووسین. بازێ جاریش دانیالی پیر دەهاتە خەوی و ئاگاداری دەکردەوە لە هەندێ کاروباری ژیان و لە ویردەکانی. ئەو بە تەواوی عاشقی نێردراوی مەزن بوو بوو، ڕۆژانە دەیان جار ناوی دێنا و شیعری بە باڵایدا دەگوت. هەموو ئاواتی ببوویە ئەوە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان چەشنی پێشەوا بوسیری لە خەودا نێردراوی مەزن ببینێ و چاوەکانی بە ڕوانین لەو ڕۆشن ببنەوە. هەرکەس گوتبای کە نێردراوی مەزنی بینیوە سوهەیل ئەو شەوە دڵی دەشکا و بە نارەحەتی دەمایەوە کە بۆچی خەڵکانێك دەیبینن و ئەو نایبینێ. زۆرێك لە شەوەکانی بە گریان دەبردنە سەر و چاوەکانی دەنوقاندن، بە خەیاڵی خۆی لەگەڵ نێردراوی مەزندا دەکەوتە گفتوگۆ و موناجات و دەپاڕایەوە کە جارێك لە جاران خۆی نیشانی ئەم بەندەیە لاواز و خراپەکارەش بدا. بۆچی هەر دەبێ چاك و پاکان ئەو ببینن لەکاتێکدا گوناهبارانێکی عاشقیش هەن حەزیان لە دیداری ئەوە. سوهەیل هەوڵی ئەوەی دەدا لەم جیهانە جەستەییە دابڕێ و بەتەواوی پەیوەندی بە جیهانەکەی

تری ڕۆحی بکا و لەگەڵیدا ئاشنابێ، ئاخر کەسانێکی مەزن هەبوون کە لە سەردەمی ئەودا نەژیابوون و بە دیدریان شاد نەبوو بوو، تاکە ڕێگا بۆ بینینیان جیهانەکەی دیکە بوو. بۆ ئەم مەبەستەش دەبوایە بەتەواوی نەفسی خۆی مراندبا و پشتی لەم جیهانە ماددیە کردبا.

ڕۆژێك یەکێك لە هاوڕێکانی بەنێوی کەمال لە دەرگای دا و سوهەیل هاتە دەرێ.

- حاڵت باشە کاکە سوهەیل، هەر ناتبینین برا؟

+ زۆر چاکم کەمال گیان، ئێوە چۆنن؟ وەلێ توخودا ببوورە توانای پیاسە و شتم نییە.

- نا نا بۆ پیاسە نەهاتووم برا، موژدانەیەکی گەورەم بۆت پێیە سوهەیل گیان.

+ چی بووە خێرا پێم بێژە؟!

- ئەمشەو لە خەودا من و تۆ لە بیابانێك دابووین، خۆڵەکان گرمۆڵە ببوون و تەپ و تۆزێکی زۆر لەم نێوەدا هەبوو، لەپڕدا گەیشتین بە گۆڕێك لەنێو بیابانەکەدا، دەنگێك هات و گوتی ئەمە گۆڕی نێرداوی مەزنە.

لەگەڵ ئەم قسەیەدا سوهەیل موچوڕکەی هاتێ و گوتی: بەڕاستی! دواتر چی ڕوویدا؟ ئایا منیش بینیم؟

- شتێكی زۆر زۆر سەیر ڕوویدا سوهەیل، لەناكاو گۆڕەكە بوویەوە و پیاوێكی نازدار هاتە دەرێ و لەلای تۆ ڕوونیشت، دەنگە پیوارەكە[١] دووبارە هاتەوە و گوتی: نێردراوی مەزن لەبەر خاتری سوهەیلی حەكیم هاتۆتە دەرێ و لەلای ڕوونیشتووە. ئەی هاوار سوهەیل پێم بێژە تۆ چیت كردووە گەیشتووی بەم پلەیە؟!

سوهەیل كە ئەمەی ژنەوت خێرا كەمالی ماچ كرد و لە خۆشیاندا نەیزانی چی بكا و بەرەو كاملا ڕابكا، هێندە دڵی خۆشبوو كە دەتگوت بۆ تاوێك غەمبار و بێزار نەكراوە. ئیدی تۆزێك دڵی داسەكنا، لێ هێشتا دەیهەویست خۆی بە خزمەتی بگا و بە چاوەكانی خۆی لێی بڕوانێ. هەر ئەم شەوە دانیالی حەكیم لە خەودا پێی گوت كە ئاوا دانەنیشێ و بڕواتە لای حەكیم خالید و داوای مۆڵەتی حیكمەتی لێ بكا، چون ئێستا سوهەیلیش یەكێكە لە حەكیمەكان و خوێندنی حیكمەتخانەی بە كۆتا هێناوە. حەكیم خالید یەكێ بوو لە حەكیمە گەورەكانی حیكمەتخانەی مەزن و لەدوای داخستنی ئەوێ حیكمەتخانەیەكی تایبەت بەخۆی كردبوویەوە و چەندین قوتابی ڕوویان لێ كردبوو.

بەیانی كە واگا هات بە زوویی خۆی گەیاندە قوتابخانەكەی خالیدی حەكیم و چاوەڕێی كرد تاوەكو وانەی قوتابیەكانی تەواو بوون و چووە لای. حەكیم خالید كە ئەوی بینی زۆر دڵی خۆشبوو، خێرا سوهەیلی لە باوەش گرت و گوتی:

---

(١) پیوار: نادیار، غەیب

ئەوە لەکوێی برا؟ هەواڵی چاك بوونەوەت لەم نەخۆشیە زۆر دڵی خۆشکردم، هەمیشە نزام بۆ دەکردی و ناڕەحەت بووم کە کەسێك لەخۆمان تووشی دەردێکی ئاوەها بێ. بەداخەوە لە حیکمەتخانەی مەزن ئەو کارەساتە گەورەیە ڕوویدا و نەمان توانی مۆڵەتت پێ ببەخشین، لەوانەیە هەر ئەمەش کاریگەری لەسەر دەروونت کردبێ، بێگومان گەلێ گوپچڕ و ناخۆشە دوای ئەم هەموو ساڵە خوێندن و تەواوکردنی ئیدی ئەو شوێنەی لێی دەخوێنی دابخرێ و بڕوانامەت پێ نەبەخشرێ.

+ بێگومان قوربان ئەمەش خێر و بێری تێدایە و ئێمەش ئاوامان نەدەویست، هەر بۆ ئەم مەبەستی مۆڵەتەش هاتبووم و کەسم لەتۆ شیاوتر نەبینی بۆ ئەم بابەتە.

- سوهەیل گیان، دەزانم تۆ شیاوی ئەوەی کە هەر ئێستا مۆڵەتی حەکیمایەتیت پێ ببەخشم، وەلێ بۆ ئەوەی قسەی کەسمان نەیەتە سەر ماوەی مانگێك هاتووچۆم بکە و بەیەکەوە وانەیەك دەخوێنین، دوای تەواو بوونی ئیدی ئاهەنگێکی خنجیلەت بۆ ساز دەکەین و مۆڵەتت پێ دەدەین.

+ من لە خزمەتی تۆدام قوربان، زۆریشم پێ خۆشە.

ئیدی لەم ڕۆژەوە سوهەیل هاتووچۆی حیکمەتخانەکەی خالیدی حەکیمی دەکرد و وانەی لەلا دەخوێند، گەر مەیلی لێبا هەر لەوێش دەمایەوە و هەندێ جاریش دەهاتەوە ماڵێ، وەلێ

قوتابییەکانی دی هەموویان دەمانەوە و مانگی جارێك سەردانی ماڵێیان دەکردەوە. ڕۆژێك بە هەندێ کاری ماڵەوە زۆر ماندوو ببوو، ئەو دەمەی بەرەو خوێندنگەکە هات خێرا وانەکەی لای حەکیم خالید خوێند و چوو لە یەکێك لە ژوورەکاندا ڕۆکەوت. چاوەکانی خەریك بوو بچنە خەو لەگەڵ دەنگێك خەبەری بوویەوە، ڕوانی وا لاوێك لەژووریێ ڕوونیشتووە و لە قوتابی ئەوێش ناچێ.

سوهەیل هەر لەژێر جێگاکەیدا تاوێك سەرنجی لە گەنجەکە دا، گەنجێکی سوورەی قژ خاوی چاوشین بوو، وێدەچوو هەر چوار پێنج ساڵێك لە سوهەیل بچووکتر بێ، ڕوخسارێکی سوور و سپی و پڕی هەبوو، وەلێ بە جەستە تۆزێ لاواز دەینواند. تاڵەکانی قژی لە خاویدا هێندێ جار دەهاتنە سەر ڕوخساری و بێزاری دەکرد و بە دەستەکانی بەرەو لای ڕاست دەیبردن. تەنکە ڕیشێکی سووری تاڵ تاڵی هەبوو کە هێشتا مایبوو بۆ پڕبوون. جلەکانی جلی ئاسایی خەڵکی دەرەوە بوون نەك جلی قوتابیان. ڕوخساری لەوە نەدەچوو هیچ لە حیکمەت بزانێ، لێ جاروبار سەیری کتێبێکی دەکرد کە بە دەستی ڕاستی گرتبووی و لەبەر خۆیدا دەیخوێندەوە، لەوە نەدەچوو ئاگاداری ئەوەبێ کە سوهەیل لە ژوورێیە. سوهەیل لەگەڵ بینینی ئەم لاوە ڕێك وێنەی هیلالی سووری هاتەوە بەرچاو کە یەکێ بوو لە قوتابیە خۆشەویستەکانی و بەدەستی کەسانێکی توندڕەو هەڵخەڵەتێنرا. ماوەیەکی باش

سەرنجی دابووێ، ناوە ناوەش گەنجەکە هەڵدەستا و دەرگاکەی دەکردەوە و سەیرێکی دەرێی دەکرد و تۆزێ مژومۆرە[1] دیاربوو، لەوە دەچوو چاوەڕێی کەسێك بکا. لەپڕدا یەکێك لە قوتابیەکان هاتە ژووری و گوتی: سەریاڵ هەڵسە با بڕۆین، ئەگەر مەیلت لێرەش نەبوو هەوڵ دەدەم حیکمەتخانەیەکت بۆ بدۆزمەوە لەگەڵتدا بگونجێ، ماشەڵا تۆ کەسێکی زیرەکی و پێشتر لە حیکمەتخانەت خوێندووە و ئێستا نابێ بێ شوێن و جێگا بی.

سوهەیل سەیری بەم گوتەیە هات و لەبەر خۆیەوە خەندەیەکی کرد، چون ئەو کوڕەی دینابوو هیچ دەربارەی حیکمەت نەزانێ دەرکەوت قوتابی حیکمەتخانەش بووە. هەستی کرد ئیدی خەوی لێ ناکەوێ و لەسەر جێگاکەی هەڵساوە و ڕوونیشت، لەو دەمەدا ئاکام کە یەکێ بوو لە قوتابیان هاتە ژووری و سوهەیل لەگەڵیدا کەوتە گۆ.

+ ئەم گەنجە کێبوو لێرە ئاکام؟ پێشووتر نەمدیوە.

- ئەها سەریاڵ دەڵێی، لەڕاستیدا منیش نایناسم و هاوڕێی ئیکرامە، خەڵکی دەرەوەی شاهێنە و بەدوای حیکمەتخانەیەك دەگەڕا تێیدا بمێنێتەوە و بخوێنێ، ئەمشەو لێرە مایەوە و ئێستا خەریکە دەڕوا.

---

(١) مژومۆرە: مەشغوڵبوون، پەشۆکاوی

سوهەیل لە جێگاکەی خۆی هەڵسا و چوویە حەوشەکە تاوەکو ڕوخساری بشۆرێ، خێرا ئیکڕام بانگی کرد و سوهەیل چووە لای.

+ مامۆستا سوهەیل، ئەم کوڕەی ئاتەکم ناوی سەریاڵە و کوڕێکی تا بڵێی ڕێکە، تازە هاتۆتە شاهێن و دەیهەوێ جێگایەك بدۆزێتەوە بۆ مانەوە یاسا و ڕێساکانی زۆر توند نەبن، ئەگەر یارمەتی بدەن سوپاست دەکەین.

سوهەیل خێرا دەستەکانی درێژ کرد و تۆقەی لەگەڵ کرد و گوتی خۆشحاڵم.

سەریاڵ: من خۆشحاڵترم مامۆستا، سوپاست دەکەم.

+ خەمت نەبێ هەوڵ دەدەم و دەپرسم بزانم چ جێگایێ بۆ ئێوە شیاوە، ئەگەر نەمرین یەکدی دەبینینەوە ئینشالا، لەئێستادا هیچ جێگایەك هەیە تێیدا بمێننەوە؟

- لەڕاستیدا ئێمە چەند کەسێ بووین کە هاتین، هاوڕێکانمان شوێنیان دەست کەوتووە، تەنێ من و هاوڕێیەکم نەبێ، جارێ لە ماڵی خزمێك دەمێنینەوە، ئەگەر ئیزن هەبێ ئێستا دەڕۆم و ئەو هاوڕێیەم چاوەڕێم دەکا.

+ زۆر چاکە بفەرموون، دووبارە خۆشحاڵ بووم.

سوهەیل ڕوخساری خۆی شۆری و چوویەوە ژوورەکەی و لەو دەمەدا قیدار پەیدابوو.

+ سەلام لە مامۆستای ئازیزمان حەکیم سوهەیل.

- ئاوا گەورەم مەکە قیدار، پێم خۆش نییە.

+ ئەمە ڕاستیە قوربان، تۆ ئیدی وانەکانی حیکمەتت تەواو کردووە و حەکیمی، دەبێ ئەمە قەبووڵ بکەی.

- ئێستا تۆ چیت دەوێ کاکە بەم کاتە؟

+ ئەوجا وەرە سەر لە مرۆیەکی وا بدە، یانی نابێ سەر لە هاوڕێی خۆمان بدەین؟

- بەخێربێن سەرچاوان قیدار گیان، پێم بێژە چی هەیە؟

+ ئەو کوڕە سەریاڵە چی یە، هیچ پێم خۆش نییە یارمەتی بدەی.

- ئێ بۆچی؟!

+ چووزانم، ئەوانە بەدوای جێگای ئاسان و کەم یاسان، پێناچێ وێڵی خوێندن بن.

- نا نا قیدار وا مەڵێ، تۆ موریدی دانیالی مەزنی ئاگادار بە لەوەی گومانی خراپ بە کەس ببەی. دانیالی پیر هەمیشە پێمانی دەگوت یارمەتی هەموو کەسێك بدەن، ئەوەی دەیناسن و ئەوەی ناشی ناسن. دواتر ئەمە لەبەر چاوم زۆر بە هیلال دەچوو، هەر بینیم ماشەڵا کەوتە دڵمەوە.

+ زانیم زانیم بەو سوورەیە دەچێ، هەر بۆیە ترسام ئەوەش تووشی خەمێکت بکا چەشنی ئەوەی دی.

- کوڕە بابە من چ کارم پێی دایە، ئەگەر توانیمان یارمەتیەکی بدەین باشە، ئەگەرنا خۆمان بێدەنگ دەکەین و هەر ئەوەندەیە.

+ نازانم بۆ عەقڵم ئەو سوورە چاوشینانە نابڕێ.

- کەواتە تۆ هێشتان لە دیمەن دەڕوانی قیدار، ئاگادار بە لەوەی نێردراوی بەڕێز فەرموویەتی: (حەکیمی مەزن سەیری دیمەن و جەستەتان ناکا بزانێ چۆنە، بەڵکو لە دڵ و کردەوەکانتان دەڕوانێ). بۆیە ئەم قسانە باش نییە بیان کەی، هەموو مرۆڤێك دروستکراوی حەکیمی مەزنە، گەر بتەوێ ڕەخنە لە ڕوخسار و شێوازی بگری کەواتە ڕەخنەت لە دروستکەرەکەی گرتووە.

+ نا نا مەبەستم ئەوە نەبوو، کارەکەم هێندە لەسەر گەورە مەکە بـــــرا.

دوای کەمێ گفتوگۆ ئیدی قیدار ڕۆیی و سوهەیلیش گەڕایەوە ماڵێ. ئەو شەوە زۆر بەدڵ یادی نێردراوی مەزنی کرد و بە خەیاڵی ئەوەوە خەو بردیەوە. لە خەویدا مرۆیەکی زۆر جوانیان نیشان دا و سوهەیل بۆ تاوێك تێی ڕاما. کەسێکی نوورانی ڕوخسار سپی خاوەن چاوێکی شین شین بوو کە سوهەیل لەمەوبەر مرۆی لەم چەشنە جوانی نەبینی بوو. قژێکی درێژی هەبوو کە لەنێوان خاوی و لوولی دابوو. سوهەیل زۆر



مەراقی کرد بزانێ ئەم مرۆیە چاوشینە کێ یە، چون نێردراوی مەزن هەرگیز چاوی شین نەبووە! کەوابوو نابێ ئەوبێ، نەشی بیستبوو یەکێك لە پیاوە ڕۆحانیەکان چاوەکانی شین بن. دەی دەبێ ئەم مرۆیە نوورانی و بەڕێزە کێ بێ کە هێندە جوانە و ڕوخساری پڕشنگ دەداتەوە!

سوهەیل لەخەیاڵی ناسینی ئەم مرۆڤەدابوو، لەپڕدا دەنگێك هات و گوتی ئەمە نێردراوی مەزنە. لەگەڵ ئەم قسەیەدا سوهەیل واقی وڕما و خێرا خەبەری بوویەوە.

لەسەر جێگاکەی هەڵسا و هێندە دڵی خۆشبوو کە نەیدەزانی چۆن پێبکەنێ و بەکام لادا بچێ، ئاخر بینینی نێردراوی مەزن یەکێ بوو لە ئاواتە هەرە گەورەکانی و ئێستا هاتەدی، وەلێ ئەو پرسیارەی کە هزری جەنجاڵ کردبوو ئەوەبوو کە بۆچی چاوەکانی شین بوون؟! ئاخر لە هەموو کتێبەکان هەر وەهای خوێندبوویەوە کە نێردراوی مەزن چاوەکانی ڕەشن، ئێستا بۆ لەم خەونە شین بووە! خێرا خۆی گەیاندە لای حەکیم خالید و خەوەکەی سەرتاپا بۆ گێڕایەوە و حەکیم خالید فەرمووی:

+ کوڕی خۆم، لەڕاستیدا نێردراوی مەزن چاوەکانی ڕەشن، وەلێ چونکە تۆ چاوی شینت زۆر لەلا جوان و شیرین بووە، بۆیە پێی خۆش بووە بەم شێوازە خۆیت نیشان بدا.

سوهەیل لەگەڵ ئەم گوتەیەی مامۆستادا فرمێسکی خۆشی لە چاوەکانی وێنەی لەنگێزە[1] خزینە خوارێ و خێرا دەستی مامۆستای ماچ کرد و لە خۆشیاندا بەرەو لای کانیەکە وەڕێ کەوت و دەستی بە نووسینی هۆنراوە کرد:

دڵێکـــــم بـــوو کوڵانــــدی چـــاوی شـــینی
بەیەك دیــن وا خـــزانـــدی چـاوی شــــینی
کە تـــاومدا ئـــــەوینی دڵ وەکـــو شــــێر
غـــــەزالانــــە گـــــلانــــدی چاوی شینی
لــەبەر بێ تـاقـەتـی خـــەو چـــوونـە چاوم
بــــە تــــاقــەت وا زڕانــدی چاوی شینی
ئــوبــەی گـەر دەرد و ڕیــســوایـی وەشا بۆی
لــەمن حـــوب بـــوو وەشـاندی چاوی شینی
کە سیس بوو بوو گەڵای عــومرم شـوکر بـــۆی
کە شـــینی کرد و چـــــاندی چـــاوی شـــینی
ئەمن دیم ئەو کە چۆن خۆی کرد نومـــایـــان
ئەسەف ئەنگـۆ نــەتـانـدی چـاوی شــــینی
سـوهەیل بـێــژە عـەجەب هـــۆنراوەیێ بـوو
کە دوێنێ شـــەو چـڕانــدی چـــاوی شینی

---

(١) لەنگێزە: بارانی خوڕەمی بەتاو.



ئیدی تەواوی ئەم ڕۆژە ئەم چاوە شینانە لەبەر دیدەی سوهەیل لانەدەچوون و بەردەوام بیری لێ دەکردنەوە. چەند ڕۆژێك دوای ئەمە سوهەیل سەردانی یەکێك لە حیکمەتخانەکانی کرد کە هاوڕێیەکی لەوێدا دەیخوێند و ماوەیەکی زۆربوو نەیدیبوو. دوای شەن و کەو کردنی هێندێ باس لەگەڵ هاوڕێکەیدا سوهەیل بەتەنیا پیاسەیەکی حەوشەی حیکمەتخانەکەی کرد، لێ واق بوو ئەو دەمەی ڕوانی کوڕە چاوشینە سوورەکەی ئەوێ ڕۆژێ لە حەوشەکەدا لەگەڵ هاوڕێیەکی ڕوونیشتووە. سوهەیل خۆی نزیك کردەوە و سەلامی لێ کردن و ڕووە و سەریاڵ گوتی: پێم وابێ تۆم لە شوێنێك دیوە و دەتناسم؟

سەریاڵ تۆزێ سەرنجی دایێ و گوتی: نازانم، لەوە ناچێ من تۆم دیبێ، جەنابتان کێن؟

+ ئەگەر هەڵە نەبم تۆ ناوت سەریاڵ بوو وایە؟

- وایە، وەلێ من لەکوێ دەناسی؟!

+سوهەیلم،ئەهاچەندڕۆژێ‌لەمەوبەرهاتی‌بۆحیکمەتخانەکەمان و گوتم ئینشاڵلا یارمەتیت دەدەم بۆ ئەوەی شوێنێکت دەسکەوێ.

لەگەڵ ئەم قسەیەدا سەریاڵ هەڵسایەوە سەرپێ و گوتی: ئەها، ئەوە تۆی مامۆستا، زۆر داوای لێبوردن دەکەم کە نەمناسیەوە، لەڕاستیدا لە ناسینەوەی کەسەکان زۆر باش نیم، دووبارە ببوورن.

+ نا نا هیچ لەگۆڕێ نییە، ئەم هاوڕێیەتم نەناسی؟

- ناوی ئارتینە، ئێمە هەمیشە بەیەکەوەین قوربان، هەردووکمان خەڵکی یەك جێگاین و وەکو گوتم بۆ خوێندن هاتووینە ئێرە.

+ ئارتین! من ناوەکەی تۆم لەلا سەیر بوو، خۆ هی ئەم برادەرە لە هی تۆ سەیرترە. باشە مانای ئەم ناوانە چین؟

سەریاڵ پێکەنی و گوتی: قوربان سەریاڵ بە مانای سەرشانی گرد و شاخ و ئەم شوێنە بەرزانە دێ، با ئارتینیش خۆی مانای ناوەکەیت پێ بێژێ.

ئارتین: ئێ خۆ ئاوا بە پێوە نابێ مامۆستا، دە تۆزێ لەگەڵمان ڕوونیشە.

سوهەیل: باشە ئەوە ڕوونیشتم، ئێستا پێم بێژە ئەم ناوە مانای چی یە؟

- قوربان ئارِ بە مانای ئاگر دێ، تینیش هەر گڕەکەیەتی و ئیدی لێکیان داوە، پێم وابێ ناوی یەکێ لە پادشاکانی کۆن بووە.

سوهەیل کردیە شۆخی و گوتی: ئەهاا، کەواتە تۆ ئاگری و هاوڕێکەشت شاخە، ناوی جوانن، یاخوا هەر سەلامەت بن. ئەی کاك سەریاڵ پێم بێژە چی دەکەن لێرە، ئایا شوێنتان دەست کەوت؟

- نەوەڵا تا ئێستا هەر لەماڵی هاوڕێیان دەمێنینەوە، ئیمڕۆ هاتین بۆ ئێرە ئەویش دیاربوو کە لەگەڵ ئێمە ناگونجێ. مامۆستا

دەڵێ دەبێ دوو مانگ جارێ بچنەوە و ئێمەش هێندە بەرگە ناگرین کە نەچینەوە، چون لەلای خۆمان هەر لە هاتووچۆ ڕاهاتووین بۆیە شوێنێك کە زۆر توند بێ بۆ ئێمە ناشێ.

+ ئێوە پێویستە لای حەکیمێك بن بتان ناسێ و کار ئاسانیتان بۆ بکا، دەنا حیکمەتخانەکانی ئێرە زۆربەیان بەم چەشنەن. هەوڵی خۆم دەدەم شوێنێکتان بۆ پەیداکەم برایان، ئینشاڵا گەر چاك بخوێنن لە یەکەمەکانی حیکمەتخانە دەبن.

سەریاڵ: وابزانم تۆ یەکەمی حیکمەتخانەی مەزن بووی مامۆستا وایە؟

+ بەڵێ سەریاڵ گیان، شوکر تا تەواویشم کرد هەر لە پلەی یەکەمدا بووم.

- ئەی چۆن مۆڵەتی حیکمەتیان پێ نەداوی تا ئێستا قوربان؟

+ ئاخر چونکە حیکمەتخانەی مەزن داخرا. قەرارە هەر لەم ماوەیە لای حەکیم خالید مۆڵەت وەرگرم، ئێوەش بانگێشت دەکەم ئینشاڵا بۆ داوەتەکە.

- زۆرمان پێ خۆشە قوربان سوپاست دەکەین، بۆ ئەوەی یەکەم بی لە حیکمەتخانەیەك خوێندنێکی زۆری پێویستە وانییە؟

+ نا سەریاڵ گیان بەم چەشنەش نییە، تێگەیشتن زۆر گرنگە، چون ئەگەر باش تێگەیشتبی لەکاتی تاقیکردنەوەکان دەتوانی

بە تێگەیشتنی خۆت هەرچیت بویٰ دایبڕێژی، مەرج نییە دەق و دەق وەکو کتێبەکە بینووسی، وەلیٰ گەر نابەڵەد[١] بووی و تەنیٰ وەکو تووتی ئەزبەرت کرد ناتوانی ئەنجامێکی وەها دەست بخەی. ئینجا گەر کارتان نەبیٰ من تۆزیٰ بە پەلەم، هەر بۆلای هاوڕێیەك هاتبووم لێرە.

دوای ماڵئاوایی سوهەیل هەر لەخۆیەوە هەستی دەکرد ئەم دوو گەنجەی خۆشدەویٰ و مرۆڤی چاکن، پڕ بەدڵ پێی خۆشبوو یارمەتیان بدا و جێگایەکیان بۆ وەدۆزیٰ، لیٰ چەندی بیری دەکردەوە ئەو حەکیمانەی ئەو دەیناسین لەوانە نەبوون کە ئەم دوو لاوە بتوانن لەلایان قەرار بگرن. هەر ئەم شەوە کە خەوی لێکەوت بینی بووەتە حەکیمێکی مەزن و لە حیکمەتخانەیەکی گەورەدا وانە دەڵێتەوە، چوار دەورەکەی تەژین لە قوتابی و دانە دانە دێنە پێشیٰ بۆ ئەوەی لای سوهەیل بخوێنن، لەنکاودا سەریاڵ و ئاڕتین لەبەردەمیدا لەسەر چۆك ڕوونیشتن و سوهەیل دێڕ دێڕ یەکێك لە کتێبە مەزنەکانی حیکمەتی بۆ شی دەکردنەوە، لیٰ لە خەوەکەدا ڕووی کردبوویە سەریاڵ و بایەخی پتر بەو دەدا، لەنکاوێك واگاهات و ڕێك لەگەڵ واگاهاتنی گوتەی دانیالی مەزنی هاتەوە خەیاڵ کە بەر لە وەفاتی پێی گوت: (ماوەیەکی دی دوو کەس دێنە لات تاوەکو فێری حیکمەتیان بکەی، ئاگات لێیان بیٰ و ئاگاداری خۆشت بە دەربارەیان، چون ئەوان هۆکاری تاقیکردنەوەن

---

(١) نابەڵەد: نەشارەزا

بۆت). سوهەیل ئەم قسەیەی دانیالی پیری بیرچووبوویەوە و لەگەڵ خەوەکەدا هاتەوە یادی. زانی ئەوانە ڕێك ئەو دوو کەسەن کە دانیالی مەزن ئاماژەی پێدان و ئیدی پتر خۆشەویستی ئەوان کەوتە دڵیەوە و پتر بایەخی پێ دەدان. چەند جارێك سوهەیل خەونی لەم چەشنەی دەدیت کە لاوەکان بۆ خوێندن ڕوویان لێی دەکرد، دەیزانی لە داهاتوودا ئەم لاوانە دەبنە قوتابی ئەو و حیکمەتی لەلا دەخوێنن، وەلێ نەیدەزانی کە چۆن ئەمە ڕوودەدا. جاروباریش لاوەکان کە پرسیاریان لە هەندێ بابەتی حیکمەت بۆ چێ دەبوو دەهاتنە لای سوهەیل و بۆی شیدەکردنەوە. هەر جارێك سوهەیل چاوی بە سەریاڵ دەکەوت خێرا لەدوای ئەو قیدار دەهات و هەمان قسەی جارانی دووپات دەکردەوە و دەیگوت ئەم کوڕە لە هیلال دەچێ و ئاگاداری بە تووشی خەمێکت نەکا، وەلێ سوهەیل زەردەکەنی دەهاتێ و دەیگوت ئەگەر لە یارمەتی ئەوانی دی تووشی خەم ببین ئەوا پێویستە پێشوازی لەو خەمە بکەین. ئیدی مانگەکەی سوهەیل لای حەکیم خالید کۆتایی هات و کاتی ئەوە هاتە پێشێ کە مۆڵەتی حەکیمایەتی وەرگرێ. ڕۆژی سێشەمیان بۆ ئاهەنگەکە دیاری کرد، وەلێ هەر لە شەممە ڕا بانگەوازی حەکیمان و قوتابیانی حیکمەتخانەکان و پیاو ماقووڵان و خەڵکی شاری دەستی پێکردبوو. سوهەیل ئەو جلی حیکمەتەی پێشتر کڕی بووی هەر مایبوو، بەپەرۆشیەوە لەسەر دەستەکانی داینابوو و تێی ڕادەما.

دووبارە دڵارای جوان و بەڕێوەبەری کەوتەوە خەیاڵ کە ڕۆژێك پێش ئاهەنگەکەی چۆن هەردوو لە خوێندا گەوزان و خۆشیەکەی لێ ئاوەژوو بوویەوە. ئەمەش چاوەکانی سوهەیلی وردە وردە تەڕ دەکرد و ناڕەحەتی دەکردەوە. نزای دەکرد کە ئەمجارە بەخۆشی و شادیەوە ئەم جلانە بپۆشێ، وەلێ داخی گرانم ئیدی خەونی چوونە داوای پریاسکە چوویە ژێر گۆڕ و تاهەتایی وەکو برینێك لە دڵیدا دەمێنێتەوە. تۆ بڵێی لەدوای ئەو کەسێکی دیکەی خۆشبوێ و دووبارە دڵی بە تاراج[1] لەلایەن دولبەرێکی دی ببردرێ! یان تا هەتایی ئەم برینە ئاوا بەتەڕی دەمێنێتەوە و چ کەسیش جێگای پریاسکە پڕ ناکاتەوە؟ دوو ڕۆژ مابوو بۆ ئاهەنگەکەی، لە ڕێگای ئیکرامەوە جێگای سەریاڵ و ئارتینی دۆزیەوە و چووە لایان، وەلێ لەو دەمەدا ئارتین چووبوو هێندێ خواردن بسەنێ و سەریاڵ بەتەنیا بوو، دیاربوو یەکێ لە هاوڕێکانیان ژوورێکی بۆ دابین کردبوون کە تێیدا بحەسێنەوە. دوای چاك و چۆنی لێی پرسی کە چ ڕۆژێك قەرارە بگەڕێنەوە مەنزڵیان؟

سەریاڵ: قەرارە بەیانی بچینەوە مامۆستا، خۆت دەزانی کە لەمێژە لێرەین.

+ ئەی گەر من پێم خۆشبێ جارێ نەچنەوە چی؟

---

(١) تاراج: تاڵان

سەریاڵ بە زەردەخەنەوە: ئاخر خێرە مامۆستا، هیچ شتێکی گرنگ هەیە کە وابکا نەچینەوە؟ بەخوا هەر دەبێ بڕۆین، جارێ ئاڕتین هەر زۆر زۆری پەلەیە، ئیمڕۆ نامەیەکی لەماڵەوە وەدەست گەیشتووە کە بیری دەکەن و پێیان گوتووە بگەڕێتەوە.

+ بەڵام من کارم پێتانە، ئەی من هیچ گرنگ نییم لەلاتان؟

- بێگومان قوربان تۆ گرنگی، وەلێ نابێ بزانین کارەکە چی یە؟

سوهەیل سەرنجێکی لە چاوەکانی سەریاڵ داو بە شۆخیەوە گوتی: ئای سەریاڵ... دەزانی تۆ دوژمنی منی ها، چاوەکانت خەمێکی قووڵم بیر دەخەنەوە.

سەریاڵ پێکەنی و گوتی: هاوار بووین بە دوژمنیش، جا چار چییە قوربان بەڕای تۆ؟

+ هیچ نییە سوڵح دەکەین، چاوەکانت دەمامك دە.

- هاهاها دەمامك؟! با هەر دوژمنداریەکەبێ باشترە ئێمە سوڵح ناکەین، هەر بەڕاست قوربان بابەتە سەرەکیەکە لەیاد نەکەین، چ کارت پێمان بوو؟

+ سەریاڵ گیان قەرارە ئەم سێشەممەیە مۆڵەتی حیکمەت وەرگرم، دەمهەوێ ئێوەش لە ئاهەنگەکە ئامادەبن، هەم دڵخۆشم دەکەن بەوە، هەمیش دەبێتە هاندانێك بۆتان تاوەکو ئێوەش بخوێنن و پێ بگەن.

- من لە خزمەت دام قوربان، زۆرم پێخۆشە لە خۆشیەکانی جەنابت بەژداربم، وەلێ ئارتین چۆن ڕازی بکەین؟

+ بیکە شۆخی لەگەڵی و پێی بێژە ناچینەوە، بزانە چی دەکا.

- بەخوا دەمکوژێ مامۆستا، تۆ نایناسی کە تووڕە دەبێ چۆنە.

+ باشە با شۆخیەکی لەگەڵ بکەین و تووڕە بوونەکەی ببینین، کە هاتەوە من خۆم لەپشتی دەرگاکە حەشار دەدەم و تۆ پێی بێژە کە ئیمڕۆ ناچینەوە، ئەگەر لە هۆکارەکەی پرسی بڵێ پێم خۆش نییە ئیمڕۆ بچمەوە، با بزانین کاردانەوەی چی دەبێ.

سەریاڵ بە پێکەنینەوە: خەمت نەبێ مامۆستا، ئێستا دەزانم چۆن بۆتی تووڕە دەکەم.

تەقەی دەرگاکە هات و خێرا سوهەیل چوویە پشتی دەرگاکە و لاوەکان دەستیان بە قسە کرد.

سەریاڵ: خواردنەکانت هێنا؟

ئارتین: بەڵێ هێنام، خۆت ئامادەکە و دوای نان خواردن دەگەڕێینەوە.

+ گەڕانەوە؟! نا نا تا سێشەممە ناڕۆینەوە، من قەرار نییە بچمەوە.

- ئەو قسەت لەکوێ هێناوە بابە، بیری ماڵێم کردووە و بیریان کردووم، ناتوانم ئیدی پتر بمێنمەوە.

+ دەڵێم ناچینەوە و تەواو ئارتین، بۆچی بچینەوە بۆ ئاخر؟

ئارتین بە تووڕەییەوە: ئەرێ تۆ تەواوی کاکە، هزرت لەسەر خۆتە چی دەڵێی؟ دێیەوە باشە گەرنا لێرەت بەجێ دێڵم، وا دەڵێم ماڵێ نامەیان ناردووە تێ ناگا، ئای خودایە تووشی چی بووم!

لە پڕدا سوهـــەیل هاتە دەرێ و ئـــارتین لەگـەڵ بینینی دا سەراسیمەبوو، سەریاڵیش خۆی بۆ نەدەگیرا و لەخۆشیاندا تریقەی دەهات و پێدەکەنی. ئەو دەمەی ئارتین مامۆستای بینی شەرمی لەخۆی کردەوە و گوتی: تۆ لێرەی مامۆستا؟

سوهەیل بە زەردەکەنیەوە: هیچ نییە ئارتین گیان، ویستمان تۆزێ تووڕەت بکەین، بابەتەکە خەتای من بوو، لەمڕۆوە منیش خۆم بەبرای ئێوە دەزانم ئیدی، ماشاڵا چەند خۆش تووڕە دەبی.

- خەجاڵەتم مامۆستا، مادام تۆ بووی پێم خۆشە و سەرچاوانم، وەلێ سەریاڵ هەر حەزی لێیە گێچەڵم پێ بکا و بۆ ئەوم پێ خۆش نییە.

+ ئارتین گیان، سێشەممە دەبێ بێی بۆ ئاهەنگەکەم، مۆڵەتی حیکمەت وەردەگرم، لەبەر من وەرە.

- مامۆستا خۆشی تۆ خۆشی ئێمەیە، وەلێ ماڵێ نامەیان ناردووە، برایەکی بچووکم هەیە زۆرم بیر دەکا.

+ دەی ئارتین گیان بەم ڕۆژەش هیچ نابێ، کە چوویەوە دیاریەکیش بۆ برا بچووکەکەت دەنێرین، با ئەویش دڵی خۆشبێ باشە.

سوهەیل ماوەیەك لەگەڵ ئارتیندا خەریك بوو تاوەکو ڕازی کرد بمێننەوە، دەیهەویست ئەوانیش لەم جۆرە ئاهەنگە ببینن و پتر هانیان بدا لەسەر خوێندنی حیکمەت.

ڕۆژی سێشەممە لەنێو باخچەی گۆڕەپانی شاردا دەستە دەستە خەڵك کۆدەبوونەوە بۆ ئاهەنگەکەی سوهەیل. حەکیمان و قوتابیان و تەنانەت پادشا و وەزیرەکانیش ئامادەبوون. ئاهەنگەکە بە چەند دەقێکی ئاینی دەستی پێکرد کە لەلایەن حەکیمێکەوە خوێندرایەوە. دواتر پادشا و چەند حەکیمێکی گەورە وتاریان پێشکەش کرد و ناوە ناوەش شاعیر و گۆرانیبێژ و گۆیندە[١] دەنگ خۆشەکان ئاهەنگەکەیان ڕازاوە و چێژبەخش تر دەکرد.

ئینجا حەکیم خالید بە دەستەکانی خۆی جل و بەرگی حیکمەتی لەبەر سوهەیل کرد و هەردوو ئامێزیان لێك وەرێنا و دەستیان بە گریان کرد. ئەوە خۆشترین ڕۆژی ژیانی سوهەیل و گەورەترین ئاواتی بوو هاتەدی، چەندین ساڵ بوو چاوەڕێی ئەو ڕۆژەی دەکرد، چاوەکانی بەرگەی ئەو خۆشیەیان نەدەگرت و چەشنی جۆبار ڕۆندکیان لێ دەهاتە خوارێ، لێ خۆزگە حەکیم

---

(١) گۆیندە: ئاوازەخوان، بویژ.

موڕادیش مابوایە و ئەم دیمەنەی دیبا. دەم نا دەمێك لە چاوەکانی باوکی ڕادەما کە ئەسرینیان تێ زابوو، لە ڕوخساری دیاربوو کە شانازی بە کوڕەکەیەوە دەکا، ئاخر چی لەوە خۆشترە کوڕەکەت حەکیم بێ و خەڵکی لێیەوە فێری حیکمەت بن. ئەوە گەورەترین شەڕەف بوو لە شاهێندا. هەرچی ئەو شەڕەفەی دەست کەوتبا هەموویان خۆزگەیان پێ دەخواست. خەڵکەکە یەك یەك دەهاتن و سوهەیلیان ماچ دەکرد، لەنێو ئاپۆڕای خەڵکەکەدا چاوەکانی کەوتە سەر سەریاڵ و ئاڕتین کە لە پێشەوەی قەرەباڵغیەکەدا دەبینران و لەدوورەوە زەردەخەنەیان بۆی دەکرد. دواتر هەردوو لاوەکە هاتنە پێشێ و سوهەیلیان ماچ کرد و سوهەیلیش یاریەکی بچووکی منداڵانی بە ئاڕتین بەخشی کە لەگەڵ خۆیدا هێنابووی بۆ برا بچووکەکەی. ئەو نیوەڕۆیە خەڵکی نەچوونەوە ماڵیان، چون نان و چێشتێکی زۆر چێ کرابوو. دوای نان خواردن سوهەیل دوو لاوەکەی بەڕێ کرد و وردە وردەش خەڵکەکە ئاهەنگەکەیان چۆڵ دەکرد و دەگەڕانەوە ماڵێ. هەر بەم کەوا و جلەی حیکمەتەوە سوهەیل ئەو ڕۆژە چۆوە ماڵ، هەستی دەکرد بەم کراسە درێژەی حیکمەت کەمێك سەیر دەردەکەوێ و ناتوانێ بە جوانی پێی بڕوا. دووبارە تراژیدیاکەی خاتوو پریاسکە هاتەوە یادی و چەند فرمێسکێکی پێ ڕشتەوە، ئاخر ئەو داینابوو هەر کە جلی حیکمەتی پۆشی یەکەم کاری خوازبێنی پریاسکە بێ، وەلێ ئاخ کە هەمیشە ژیان بەدڵی ئێمە نابێ و دەبێ ئێش و نارەحەتیەکانی بچەژین.

سوهەیل هەر دوای بوونی بە حەكیم دەستی بە چاڵاكی و وتاردان كرد، لە شوێنە جیا جیاكانی شاردا خەڵكی كۆدەبوونەوە بۆ وتارەكانی و حیكمەتی فێر دەكردن. ڕۆژانە چەند قوتابیەك لەماڵێ سەردانیان دەكرد و وانەی پێ دەگوتن، ئەمە جگە لەوەی حەكیم خالید هێندێ لە قوتابیەكانی خۆی ڕادەستی وی كردبوون و ڕۆژانە لە حیكمەتخانەكەی ئەودا وانەی دەگوتەوە، لێ هەرگیز نەیدەویست حیكمەتخانەیەكی سەربەخۆ دانێ و خۆی بە شایستەی ئەوە نەدەزانی. لەبەر ئەوەی حەكیم خالیدیش لەسەر قوتابیەكان زۆر توند بوو سەریاڵ و ئاڕتین تەمای ئەوێیان نەبوو. دوای ماوەیەك یەكێك لە حەكیمەكان كە هاوڕێی سوهەیل بوو كۆچی دوایی كرد و حیكمەتخانەكەی بێ حەكیم مایەوە، سوهەیل دەیهەویست سەریاڵ و ئاڕتین بباتە ئەوێ و تا حەكیمێك پەیدا دەبێ خۆی بە هاتووچۆ وانەیان پێ بێژێ. بۆ ئەم مەبەستەش سەردانی خاوەنی حیكمەتخانەكەی كرد كە بە مرۆیەكی باش باسیان لێوە نەدەكرد.

خاوەنی حیكمەتخانەكە ناوی جەمشید بوو، مرۆیەكی تەمەن ناوەنجی كەڵەگەت بوو، تازە سەر و ڕیشی بۆز[1] دەبوو. چون كاتی خۆی تۆزێك حیكمەتی خوێندبوو خۆی بە حەكیم دەزانی. لەبەر سەروەتەكەی لەنێو خەڵكی بە پیاو ماقووڵ ناوی دەركردبوو. ئەو حیكمەتخانەیەی لەژێر چاودێری خۆیدا چێ

---

(١) بۆز: ڕەنگێكە لە تێكەڵبوونی ڕەش و سپی پەیدا دەبێ.

کردبوو و حەکیمێکی بۆ هێنابوو تا وانەی تێدا بلێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا خانوویەکی بۆ لە تەنیشت حیکمەتخانەکە بنیات نابوو، لێ دیاربوو ئەم حەکیمە بەهۆی نەخۆشیەوە کۆچی دوایی کردبوو و حیکمەتخانەکە بێ حەکیم مابوویەوە. دەیان گوت ئەو جەمشیدە بابایەکی ڕەزیل و چاو چنۆکە و ئەو حیکمەتخانەیەشی هەر بە پارەی خەڵك بنیات ناوە و خۆی دیرهەمێکی تێدا خەرج نەکردووە. کاتی خۆی هێندەی خەم داوەتە حەکیمەکە و سەری خستۆتە سەر، لە خەمی ئەودا نەخۆش کەوتووە و بەزگی داوە، هەر بۆیەش چ حەکیمی دی نەیدەویست بچێتە ئەم حیکمەتخانەیە. سوهەیل دەیهەویست بۆ ماوەیەکی کاتی ئاڕتین و سەریاڵ لەوێدا نیشتەجێ بکا بەڵکو حەکیمێکی باشیان بۆبێ، یاخود هەر خۆی بە هاتووچۆ لەوێدا وانەیان پێ بێژێ. لە دەرگای ماڵی کاك جەمشیدی دا و دوای چاك و چۆنی و دانیشتن دەستی پێکرد.

+ لەڕاستیدا کاك جەمشید بۆ کارێکی زۆر گرنگ هاتووم و نابێ دەست بە ڕوومەوە بنێی.

- فەرموو فەرموو سوهەیل گیان، کارێك بە ئێمە بکرێ بۆتی دەکەین کاکە ئێمە تۆمان خۆشدەوێ.

+ دوو هاوڕێم هەن خەڵکی دەرەوەی شاهێنن، لەڕاستیدا ئەوان برای منن، دەیانەوێ حیکمەت بخوێنن و جێگایەکیان نییە تێیدا



بمێننەوە، گەر لە حیکمەتخانەکەی جەنابتدا بمێننەوە زۆرت لێ مەمنوون دەبم. تا حەکیمێك بۆ ئەوێ پەیدا دەبێ هەر خۆم ڕۆژانە وانەیان پێ دەڵێم.

- وەڵا حەکیم سوهەیل گیان زۆریشم پێ خۆشە، ماوەیەکە حیکمەتخانەکەم چۆڵە و دڵم پێی توند بووە، هەر لە بەیانی ڕا بیان هێنە. ئینجا من و تۆ شتێکی تر دەکەین ئەگەر تۆ ڕازی بی.

+ زۆرت لێ مەمنوونم کاك جەمشید، پێم بێژە ئەم شتە چی یە؟

- من کارەکەی تۆم جێبەجێ کرد و ئەو کوڕانەم قەبووڵ کرد، تۆش دەبێ دڵی من نەشکێنی لەو قسەیەی دەیکەم باشە.

+ گەر لە توانام دابێ لە خزمەتم، بفەرموون.

- خۆت دەزانی حەکیم بوڕهان وەفاتی کرد و ئێستا قوتابخانەکەم چۆڵە و ماوەیەکە بەدوای حەکیمێك دا دەگەڕێم و دەستم ناکەوێ، وەرە ڕاست بارگە و بارخانە و پریاسکەی[1] خۆت بێنە و هەواڵ بدە ئەم کوڕانەش و یەکجاری لێرە ببە حەکیم. ژنێکیشت بۆ دێنین و خانوویەکی گەورەشم سازداوە لە تەنیشت حیکمەتخانەکە. ئیدی قەت لەمە باشترت دەست ناکەوێ.

+ وەڵاهی کاك جەمشید لەڕاستیدا من بۆ ئەوە نەهاتبووم و زۆر سوپاست دەکەم، من تەنێ دەمهەوێ جێگایەك بۆ ئەم دووانە دابین

---

(١) پریاسکە: توورەکە، هەگبە.

بکەم، قەرار نییە من حیکمەتخانە دانێم و خۆم بە شایستەی ئەوە نازانم.

- نا نا سوهەیل تۆ حەکیمی و مۆڵەتت هەیە، لە قسەم دەرمەچۆ و شتوومەکەکانت بێنە، لە هەرچیت کەم بوو یارمەتیت دەدەین و نایەڵم کەموکوڕیت هەبێ. تۆ ئافرەتێك لە شاهێندا بدۆزەرەوە دەبینی چۆن کارئاسانیت بۆ دەکەین لە ماڵ و حاڵدا.

+گەلێکت سوپاس دەکەم کاك جەمشید، وەلێ بەخوا من زەحمەتە لە نووکەڕا بە تەنیا حیکمەتخانەیەك بەڕێوە ببەم و پێم خۆشە جارێ هەر لای حەکیم خالید بم.

- بیری لێ بکەوە حەکیم سوهەیل، بیری لێ بکەوە و دواتر وەڵامم بۆ بنێرەوە.

ئەو ڕۆژە جەمشید گەلێکی سەر خستە سەری و سوهەیل وەڵامێکی وەهای نەدایەوە و تەنێ گوتی بیری لێ دەکەمەوە، لەڕاستیدا ئەو نەیدەویست هەر بیریشی لێ بکاتەوە، چون لێرە و لەوێ دەیبیست کە حەکیم بوڕهان چەندە لەدەستی نارەحەت بوو تا لە خەمی ئەودا وەفاتی کرد، دواتریش دەیزانی ئەو کەسێکە بەڵێنەکانی خۆی ناباتە سەر و گەلێك قرچۆکە. سەرەڕای ئەوەش جەمشید خۆی بە شت دەزانی و هەمیشە پێی خۆشبوو چەند حەکیمێکی لەدەورە بن و مەجلیسەکانی جمەی بێ لە خەڵکی. سوهەیل دەیزانی گەر بڕواتە ئەوێ ژیانی نامێنێ و بەچەشنێ دەبەسرێتەوە دەبێ تەواوی

کاتەکانی لە حیکمەتخانە و نێوماڵ و میوانانی جەمشید بەسەر ببا، جگە لەمانەش حەکیم بوڕهان هاوڕێی بوو، نەیدەویست جێگاکەی ئەو بگرێتەوە تەنانەت گەر هەموو دونیاشیان پێ بەخشیبا. سوهەیل خۆی حەزی لەوە نەبوو حیکمەتخانە دابنێ، ئەسڵەن لە ئێستادا هەر بەتەمای شتێکی وانەبوو، چون دەیبینی کە چۆن حەکیمەکان شەو و ڕۆژ خەریکی حیکمەتخانەن و تەنانەت کاتیان بۆ ماڵ و منداڵیشیان نەماوە و وەکو پێویست سەردانێکیان پێ ناکرێ. ئەو لەو مرۆڤانەبوو کە لە ئاو و هەوای دەرێ ڕاهاتبوو، هێشتا تەواو گەنج بوو، نەیدەویست لە شوێنێکدا قەتیس بکرێ و ببەسترێتەوە، دەیهەویست لە شوێنە جودا جوداکاندا بە کوڕ و تارەکانی خزمەت بکا. جگە لەمەش چەند قوتابیەکی هەبن و ڕۆژانە سەردانی بکەن و حیکمەتیان پێ بڵێ، لێ گەر حیکمەتخانەی هەبێ هیچ کاتێکی نامێنێ بۆ دەرەوە. جگە لەمانەش ئەو ڕووداوانەی بەم دواییە بەسەری هات لە زۆر شتی ژیانی دوور خستەوە و وەکو جاران مرۆیەکی کۆمەڵایەتی نەبوو. هەمیشە هەستی بە ئاسەواری ئەو برینانەی نێو دڵی دەکرد کە ناوە ناوە لێی دەکولانەوە.

چەند ڕۆژێك دوای ئەوە سەریاڵ و ئارتینی بینی و پێی ڕاگەیاندن کە شوێنێکی بۆ دابین کردوون و تا حەکیمێك دێتە ئەوێ هەر خۆی وانەیان پێ دەڵێ.

دوو لاوەکە دڵیان زۆر بەمە کرایەوە و گەلێ منەتباری سوهەیل بوون، بەتایبەتی کە زانیان لەو نزیکن و دەتوانن لای ئەو بخوێنن،

وەلێ هەردوو پێیان خۆشبوو سوهەیل یەکجاری بێتە ئەوێ و داواکەی کاك جەمشید ڕەت نەکاتەوە، هەر بۆیە سەریاڵ گوتی:

مامۆستا گیان چاکەیەکی زۆر گەورەت لەگەڵ کردین، وەلێ ئەو چاکەیەش بکە خۆت وەرە ئەوێ و ببە حەکیم، ئەم شوێنە گەورەیە لە چنگی خۆت مەدە مامۆستا، کەم کەس جێگایەکی ئاوای بۆ هەڵدەکەوێ. دەزانی چەندمان پێخۆشە کە لەلای تۆ بخوێنین، ئاخر ئێمە شارەزای تۆ بووین و بووینەتە ناسیار، گەر حەکیمێکی تربێ تاوەکو لەگەڵ ئەو یەك دەناسین و ڕێك دەکەوین موددەتێکی دەوێ، دواتر دەترسین کەسێکی ئاتەشی بێ و خوێندنەکەش لە ئێمە بشێوێنێ.

+ نا هەرگیز سەریاڵ، من نامەوێ خۆم لە جێگایەکی ئاوادا ببەستمەوە، با هەموو دونیاشم بدەنێ و دەوڵەمەندیش بم، کە دڵم لە جێگایەك خۆش نەبوو پارە و سامان بەمن چی؟ دواتر ئەم کابرایە لەنێو خەڵکیدا بەباشە باس ناکرێ، جگە لەمەش هەرگیز نامەوێ بێمە جێگاکەی حەکیم بوڕهان، قەت ئەمەم پێ خۆش نییە.

- وەلێ قوربان تۆ دەبیتە خاوەن حیکمەتخانەی خۆت و لەنێو خەڵکیدا ناو و شۆرەت دەردەکەی، ئینجا ئەوێ وەکو باس دەکەن شوێنێکی فراوانە و خانوویەکی زۆر خۆشیشی هەیە، لەوێ دەتوانی خزمەتەکانت زۆر بە باشتر لە ئێستا بکەی و ئەم دوو برایەی خۆشت بخەیە سەر خوێندن و یارمەتیان بدەی.

+ نازانم سەریاڵ نازانم، هەوڵ دەدەم بیرێکی لێ بکەمەوە، هەوڵ دەدەم.

- باشە قوربان ئەگەر چووینە وێ چۆن چێشت ئامادە بکەین؟

+ هەی هوو برا، من خەریکی چیم و تۆ باسی چێشتم بۆ دەکەی، خەمت نەبێ نامری لە برسان، لەوێ زەخیرە و هەموو شتێکی لێیە.

- وەلێ ئێمە نازانین چێشت لێنێین؟

+ فێردەبی سەریاڵ گیان فێردەبی، جارێ ڕێگەم بدە تەنێ بیر لەم بابەتە بکەمەوە، هەر یەکجار دڕدۆنگم[١].

سوهەیل ڕۆژ بە ڕۆژ دڕدۆنگیەکەی پتر دەبوو، کاك جەمشیدیش ناوە ناوە حەکیمێك یان پیاو ماقوولێکی دەناردە ماڵی سوهەیل تاوەکو ڕازی بکا و بیهێنێتە جێگای حەکیم بورهان. سوهەیل هەستی دەکرد وردە وردە نەرمی دەکەن و بڕیارەکەی سەرەتای پێ دەگۆڕن، لێ لە هەرکەسێك پرسیاری کاك جەمشیدی دەکرد بە مرۆیەکی خۆ بە گەورەزان و چ نەبوو وەسفیان دەکرد و جێگرتنەوەی حەکیم بورهانیش بۆ ئەو زۆر زۆر ناخۆش بوو، بۆیە دووبارە بڕیاری نەچوونی دەدا. شەوان دادەنیشت و لەگەڵ خۆی دەکەوتە گۆ: من هەرگیز ناچم بۆ ئەوێ،

---

(١) دڕدۆنگ: دوودڵ.



ژیانی ئێستام هیچ کێشەیەکی نییە بۆ دەچم خۆ لە شوێنێکدا دەبەستمەوە و خۆم تووشی مرۆیەکی وا خراپ و قرچۆك دەکەم. من چی لە خانوو و پارە بکەم کە لە خەماندا بمرم، هێشتا گەنجم و پێویستە ژیان بکەم، بەڵێ پێویستە خۆش بژیم و چەشنی ئەم خەڵکە ژیان بکەم. گەر بچمە وێ داوم لە داوی کاك جەمشید نابێتەوە و بە خەمانم دەکوژێ. ئەسڵەن هەر من قەرار نییە لەم تەمەنە زووە حیکمەتخانە دانێم. لەلای حەکیم خالید بم زۆر بە شەڕەف تر و پیاوانە ترە. خۆ هەزار کارم هەبێ و نەشچم بۆ ئەوێ کەس ناڵێ ماڵت لە کوێ یە. بەڵام سەریاڵ و ئاڕتین چی؟ ئەوان هانایان بۆ من هێناوە، خۆ نابێ ئاوا فەرامۆشیان بکەم، دانیالی مەزن گوتی ئاگات لێیان بێ. ئەی خەونەکان چی کە لەلای منیان دەخوێند؟ نا نابێ دەست لەوان بەردەم هەرگیز، نابێ دەستیان لێ بەردەم و پێویستە لای خۆم بخوێنن. ئەگەر بچم تەنێ لەبەر وان دەچم، بەڵێ تەنێ لەبەر وان.

لەنێو ئەم قسانە دابوو قیداری لێ پەیدابوو و خێرا گوتی: لەبەروان دەچی؟!

+ بەڵێ قیدار گیان لەبەر وان دەچم.

- ئەرێ تۆ شێت بووی کاکە! سوهەیل گیان شێت بووی، ئەوە چیت لێ قەوماوە؟! من هێندەی تۆ بناسم قەت ناتوانی خۆت لە شوێنێکدا قەتیس بکەی، تۆ لەگەڵ دەرێ ڕاهاتووی، گەر ڕۆژێك

پیاسەیەکی سەرکانی و بناری شاخەکە نەکەی دەمری بەخوا دەمری. یەك دونیا برین لەنێو سینەت بە سارێژنەکراوی جێهاون کاکە. بیرت چوو دکتۆر گوتی ئەمە نابێ لە ماڵێ قەتیس بکرێ و خەم بخوا، پێویستە بگەڕێ و دڵخۆش بێ دەنا لەهەر کاتێکدا ئەگەری هەیە نەخۆشیەکەی سەر هەڵبداتەوە. ئێستا تۆ لە خۆشەویستی ئەم دوو لاوە ئەو کارە دەکەی، وەلێ بەیانی کەس منەتی پێ نییە و لەم حیکمەتخانەیەدا خۆت دەکوژی. لەلای حەکیم خالید سەربەخۆی و وانەکەت دەڵێیەوە و دێیتەوە ماڵێ.

+ هەموو ئەمانە دەزانم قیدار هەمووی دەزانم، وەلێ دەمەوێ یارمەتی ئەم دوو لاوە بدەم، ئەسڵەن ژیان لەلای من گرنگیەکی ئەوتۆی نەماوە دوای ئەو ڕووداوانەی بەسەرم هاتن. دەمەوێ لە هەموو جیهان دابڕێم قیدار، دەمەوێ دابڕێم.

- یانی بەس لەبەر خاتری دوو کەس واز لە هەموو شتی ژیانت دێنی! واز لە خۆشیەکانت دێنی، خۆت دەخەیە نارەحەتیەوە! ئایا ئەوان بەیانی جێت ناهێڵن؟ تا هەتایی لەلات دەبن ها؟ وەڵامم دەوە حەکیم سوهەیل وەڵامم دەوە، ئەوان قەدری ئەوە دەگرن کە تۆ چیت بۆیان کردووە؟

+ گرنگ نییە، هیچ گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە لەئێستادا دەمەوێ یارمەتی دوو کەس بدەم و تەواو، من ئاوا فێرکراوم، تۆش کەیفی خۆتە قیدار، کەیفی خۆتە.

- كێ ئاوای فێركردی؟

+ حەكیمی مەزن فەرمووی:( یارمەتی یەكدی بدەن لەسەر كاری خێر و چاكە، یارمەتی یەكدی مەدەن لەسەر كاری تاوان و خراپە[١])، مەگەر ئەم دەقەت نەخوێندۆتەوە قیدار؟

- تەواو سوهەیل گیان كەیفی خۆتە، دەتەوێ یارمەتیان بدەی بیدە، هیوادارم ئەوانیش منەتیان بەمە هەبێ كە تۆ بۆیان دەكەی.

+ گرنگ ئەوەیە من گوتەیەكی حەكیمی مەزن بەجێ دێنم، ئەوان منەتباری ئەوەن یاخود نا كەیفی خۆیانە. نازانم بۆچی هەست دەكەم ئەوانم زۆر خۆشدەوێ و پێویستە لەگەڵیان بم.

- دەی حەكیمی مەزن لێكتان نەكا سوهەیل گیان، ئێمەش سەیری دیمەنەكە دەكەین بزانین چەندە بەرگەی كاك جەمشید دەگری.

ئەو ڕۆژە قیدار نەیتوانی سوهەیل ساردكاتەوە لەسەر بڕیارەكەی، لێ سوهەیل هێشتا كەمێ دڕدۆنگی پێوە دیار مابوو، ئەو شەوە زۆر دوعای كرد و خەو بەسەریدا زاڵ بوو، لە خەوەكەدا بینی چۆتە حیكمەتخانەیەكی نوێ و خانوویەكی تازە، وەلێ لەنێو حیكمەتخانەكەدا چەند سیسركەیەكی بۆگەناوی بوونیان هەبوو كە سوهەیل بە پێڵاوەكانی هەوڵی كوشتن و دەركردنیانی دەدا. بۆ بەیانی خێرا خۆی گەیاندە لای حەكیم خالید

---

(١) سوورەتی مائیدە، ئایەتی ٢.

و پرسیاری خەونەکەی لێ کرد، وەلێ نەیگوت من بینیومە و هەر هێندەی گوت کە کەسێك دەیهەوێ ماڵی بباتە شوێنێك و خەوێکی ئاوەهای بەم جێگایە دیوە.

حەکیم خالید کە خەوەکەی بیست گوتی: کوڕم سوهەیل، نازانم کێ یە ئەمەی بینیوە، وەلێ هەر کەسێکە پێی بێژە با نەچێتە ئەم جێگایە و لەوێدا تووشی کێشە دێ، هەر ئەوەندەی پێ بێژە و تەواو.

سوهـــەیل تۆزێك پەشـــۆکاو گوتی: تۆ دڵنیای قوربان لەم لێکدانەوەیە؟

+ من لەمێژە مانای خەونان دەزانم و ئیمڕۆ نییە لەنێو ئەم بابەتە دام حەکیم سوهەیل، بۆیە دڵنیام لە وەڵامەکەم.

سوهەیل لەگەڵ مانای ئەم خەوەدا دڕدۆنگیەکەی پتر بوو، ئێستا دەبێ بڕیاری کۆتایی بدا، یان ئەوەیە ئەم گەنجانە لای کاك جەمشید دابنێ تاوەکو حەکیمێکی نوێ پەیدا دەبێ بۆ ئەوێ کە ئەمەش زۆر زەحمەت بوو، چون هەموو خەڵك جەمشیدیان دەناسی و کەس ئامادەیی ئەوەی نەبوو وەکو حەکیم بچێتە وێ. دواتر گەر لەوێشیان دابنێ هەر دەبێ خۆی بچێ وانەیان پێ بێژێ و لەکۆتاییدا کە جەمشید کەسی پێ پەیدا نەبوو بێگومان سوهەیل یەکجاری تووشی ئەوێ دەکا. یاخود دەبێ واز لەم دوو

گەنجە بێنێ و پامالیان[١] بکا و بۆخۆیان جێگایەك بدۆزنەوە کە ئەمەشی نەدەتوانی، یانیش دەبێ لەبەر خاتری وان خۆی بخاتە نێو کێشە و گرفتەوە و چاوەڕێی هێرشی خەم و ئازارەکان بکا.

بەردەوام پرسیاری لە کەسی شارەزاو خەڵکی دەکرد، لەڕاستیدا هەموو ئاماژەکان بۆ ئەوەبوون کە سوهەیل نەچێتە ئەوێ، لێ ئەو بڕیاری دابوو کە دەست لەم دوو لاوە هەڵنەگرێ و فێری حیکمەتیان بکا. ئەو شەوە ڕوونیشت و لەگەڵ حەکیمی مەزندا کەوتە موناجات: ئەی حەکیمی مەزن، ئاماژەکان بۆ ئەوەن کە من نەچمە ئەو جێگایە، لێ من ئەو دوو لاوەم زۆر خۆشدەوێ و لەبەر خاتری جەنابت و یارمەتی دانی ئەوان دەڕۆم و فێری حیکمەتیان دەکەم. دەترسم ئەو دەمەی شوێنێکی شیاویان دەست نەکەوێ پشت لە خوێندن هەڵبکەن، یاخود بە بیروبۆچوونی کۆمەڵەی سەرخەرانی حیکمەت سەرسام بن و چەشنی هیلال شوێن ئەوان بکەون. یارمەتیم بدە لەم کارەمدا، تۆ بە گەورەیی خۆت یارمەتیم بدە.

هەر لەدوای موناجاتەکە قیدار هات: خۆت خستە کێشەوە، سوێند بە حەکیمی مەزن خۆت خستە کێشەوە، وەلێ تۆ هەر بە قسەی خۆت دەکەی. دەبوایە لەگەڵ بینینی ئەم خەوەدا خێرا کشابایەوە، دەبا بزانین چی لێدێ، دەبینین کاك سوهەیل دەبینین ژیانت چی لێدێ.

---

(١) پاماڵ: پێشێل

سوهەیل بە قسەکانی قیدار خۆی تێك نەدا و بەیانی زوو چوویە لای کاك جەمشید و هەواڵی پێدا کە دێت، بەیەکەوە کۆمەڵێ مەرجیان دانا و لەسەری ڕێك کەوتن و کاك جەمشیدیش بەڵێنی پێدا کە هەرکات خێزانی پێك هێنا کلیلی خانووەکەی ڕادەست بکا، پێویستی ناوماڵیشی بۆ دابین بکا و نەهێڵێ سوهەیل لە هیچی کەم بێ و مانگانەی بۆ ببڕێتەوە.

ئیدی سوهەیل هەواڵی بۆ سەریاڵ و ئاڕتین نارد کە شتومەکەکانیان کۆبکەنەوە و بێنە حیکمەتخانەکە، خۆشی وردە وردە کتێب و کەلوپەلی خۆی دێنا و لەنێو حیکمەتخانەکەدا لە ژوورەکەی خۆی دایدەنان. ئەم دوو لاوە بەم هەواڵە زۆر دڵیان خۆشبوو، ئیدی هەستیان دەکرد ئەوانیش دەتوانن لەمەودوا حیکمەت بخوێنن و لەلای حەکیم سوهەیل خۆیان پێ بگەیەنن. ئەو هەم مامۆستایانە هەم وەکو هاوڕێیەکیشە لەگەڵیان، جێگاکەش فراوان و دڵگیرە و ئیدی چی لەمە چاکتر دەست دەکەوێ.

ئەو دەمەی هاتن سوهەیل هەردووکیانی لەباوەش گرت و ماچی کردن، دواتر ئەوانی بردە ژووری و شوێنەکانی حیکمەتخانەی نیشان دەدان و یەك یەك جێگاکانی پێ ئاشنا دەکردن.

سەریاڵ گوتی: قوربان هەست دەکەم لێرە خوێندنمان زۆر زۆر باش دەبێ، وەلێ بۆ چێشت لێنان و قاپ شۆرین و ئیش و کاری



ئێرە چی بکەین؟ من تەنێ یەك جۆر چێشت دەزانم و تەواو، ئەگەر هەر ئەو دوو کەسە بین زۆر قوڕس دەکەوێ لەسەرمان و پێویستە قوتابی پتر وەرگری تاوەکو کارەکان بەش بکەین لەنێو خۆماندا.

سوهەیل بە شۆخیەوە: دەزانی چی یە سەریاڵ، واچاکە هەموو کارەکان بەتۆ بکەم، ئیدی لەمەودوا کەوتوویە بەردەستم چیت پێ دەکرێ؟ چێشتەکان لێدەنێی و قاپەکانیش هەر خۆت بیشۆرە کاکە، دەتەوێ مرۆ بەرامبەر دوژمنی خۆی سۆزی هەبێ؟!

- وەلێ قوربان مەبەستم ئەوەیە شوێنێکی ئاوا گەورە بە دوو کەس بەڕێوە ناچێ.

+ دەزانم دەزانم برا گیانم، بێگومان قوتابی تریش وەردەگرین و خۆشم لەگەڵتان دەبم و فێری چێشت لێنانتان دەکەم. نایەڵم لە هیچتان کەم بێ و ئێوە برای منن، قابیلە بتان هێنمە ئێرە و بهێڵم برسی و ناڕەحەت بن! خەمی هیچ شتێکتان نەبێ، هەمیشە دەفر و توورەکەکانی ئێرە لیپاولیپن[1] لە زەخیرە و بەردوام خێرخوازان دەیهێنن، هەر شتێکمان بوێ بەیەکەوە دروستی دەکەین، من شیرینی دەزانم و جاروبار ئەویشتان بۆ چێ دەکەم.

لەو ڕۆژەوە سوهەیل لە هەموو جیهان دوورکەوتەوە و تەنێ خۆی مژووڵی لاوەکان و حیکمەتخانەکە کرد. وازی لە هەموو هاوڕێ و کەسانی دەوروبەری هێنا و لێیان هەڵهات.

---

(١) لیپاولیپ: پڕاوپڕ

مرۆگەلێك هەبوون سوهەیلیان خۆشدەویست و دەیانویست لێیەوە نزیك بن، لێ ئەو بە چەشنێك خۆی لە حیکمەتخانەکەدا قەتیس کرد کە زۆر بە کەمی خەڵکی دەرەوەی دەبینی. ئەو هێشتا برینی مەرگی دڵارا و شووکردنی پریاسکە و لەدەست چوونی هیلال لەسەر دڵیدا قەتماغەی نەگرتبوو، دەیهەویست واز لە جیهان بێنێ و تەنێ گرنگی بەم دوو لاوە بدا و پێیان بگەیەنێ. لە نزیکەکانی دوورکەوتەوە و ئەوانی کردە نزیکانی خۆی، لە خۆشیەکانی دوورکەوتەوە و هەوڵی دەدا لەگەڵ ئەواندا خۆشی دەست بکەوێ. هەموو خەم و تێکۆشانی ئەو ببوویە فێرکردنی ئەوان و پێگەیشتنیان. گوتەکەی حەکیم دانیال هەر لە هزریدا دەهات و دەچوو، وەلێ ئەم دوو لاوە ئاگاداری ئەوە نەبوون حەکیم سوهەیل لەبەر ئەوان وازی لەچی هێناوە، وایان دەزانی کە خۆی ئەم ژیانەی دەوێ و حەزی لێیەتی. سوهەیلی حەکیم چون جارێ خێزاندار نەبوو شەویش هەر لە حیکمەتخانەکەدا دەمایەوە. شەوە دوور و درێژ و یەڵداکانی لەنێو ژوورێکی تاریکی حیکمەتخانەدا دەبردە سەر و لەگەڵ ئازار و دووریدا دەژیا، وەلێ هەرگیز نەیدەویست لاوەکان بەئێشی دڵی بزانن و بەردەوام لەگەڵیان پێدەکەنی و شۆخی دەکرد. لە سەرەتادا جگە لەم دوو لاوە کەسی دی لە قوتابخانەکەی سوهەیل نەبوو، وەلێ دوای ماوەیەك وردە وردە چەند قوتابیەکی دیکەی وەرگرت، چون ئەو لای وابوو زۆری قوتابی بایەخێکی نییە لە کاتێکدا نەتوانی

وەكو پێویست گرنگیان پێ بدەی. پێگەیاندنی یەك مرۆڤ بە تەواوی چاترە لە فێركردنی چەندین كەس لەگەڵ كەم و كورتی و ناتەواویدا. حیكمەتخانەكە لە چەند ژوورێك و حەوشەیەكی فراوان و باغێكی بچووك پێك هاتبوو كە لە نێوەندی باغەكەدا حەوزێكی چكۆلەی بە بەرد چێكراو بوونی هەبوو. ژوورەكەی سوهەیل لەگەڵ هی قوتابییەكان لە یەكتر جودا بوو، تۆكمە و گەورەتر بنیات نرابوو، ژوورێك بوو تەژی لە كتێبی جۆراوجۆر، تەژی لەو كەل و پەلانەی كە حەكیمێك پێویستی پێیەتی، وەلێ ڕاخەر و سەرینەكانی هێندێ كۆن دەهاتنە بەرچاو. سوهەیل كتێبەكانی خۆشی ئەوانەی زۆری خۆشدەویستن هێندێكی لەوێ دانابوون بۆ ئەوەی ژوورەكە پتر دڵگیر و ڕازاوە بێ. لەبەر ئەوەی هەستی بە تەنیاییەكی لەڕادە بەدەر دەكرد لەو ژوورەدا، دڵیشی نەدەهات سەریاڵ و ئارتین بنێرێتە ژوورێكی بچووك و تەنیا، هەردووكیانی هێنابوویە ژوورەكەی خۆی و لەوێدا جێگیری كردبوون. لەكاتێكدا هیچ كام لە حەكیمەكان ئامادە نەبوون ژوورەكەی خۆیان بدەنە قوتابیان و لەگەڵیاندا لەیەك شوێندا بمێننەوە، لێ سوهەیلی حەكیم لەگەڵ ئەم دوو لاوەدا چەشنی خێزانێكی بچووك ژیانیان دەگوزەراند و بەوێنەی برا بچووكی خۆی لێی دەڕوانین. بەیانیان زوو بەر لەوان هەڵدەستا و هەردووكیانی بەخەبەر دێنا، هەر جارە و یەكێكیان نانی بەیانیان ئامادە دەكرد و هەر دوای نان خواردن دەستیان بە خوێندن دەكرد.

قوتابییەکان یەك یەك لەبەردەمی سوهەیلی حەکیمدا دادەنیشتن و تا ئەو تەواو نەبا ئەوی دیکە نەدەهات. ئەو دەمەی کاژێرێك دەما بۆ نیوەڕۆ وانەکان تەواو دەبوون و دەستیان بە چێشت لێنان دەکرد. حەکیم سوهەیل وردە وردە فێریانی دەکرد کە چۆن چێشت لێ بنێن و هەر ڕۆژە و جۆرە خواردنێکی پێ ئامادە دەکردن. هەندێ جاریش خۆی دەبوویە وەستاکە و بانگی دەکردن تاوەکو یاوەری بکەن. نیوەڕوان پشوویان دەدا و کەمێك دەنوستن، وەلێ لەگەڵ هاتنی دەمی عەسر وەخەبەر دەهاتن و خۆیان کۆدەکردەوە و دووبارە دەستیان بە خوێندن و موتاڵای وانەکان دەکردەوە تاوەکو بەر لە مەغریب. مەغریبان ئەگەر چێشتەکەی نیوەڕۆ مابا بەداران لە ناندینەکەدا گەرمیان دەکردەوە، ئەگەرنا نان و تەماتە با خەیار با یاخود ئاروو با، یانیش یەکێك لە سەریاڵ و ئاڕتین دەچوونە لای ماڵێکی ئاژەڵدار لە دراوسێی حیکمەتخانەکە و ماست و پەنیریان دەکڕی. شەوان یەك دوو کاژێری تر لەبەر فانۆسەکەدا موتاڵای وانەکانی خۆیان دەکردەوە و حەکیم سوهەیلیش لەدووری ئەوانەوە ڕوودەنیشت و چاودێری دەکردن تاوەکو لێ دەبوونەوە. ئەو کاتانەی لە شەو دەمایەوە بە شۆخی و گاڵتەوە دەیانبردە سەر. هەرسێ لە ژوورەکەدا تاوەکو ماندوو دەبوون و خەو دەیبردنەوە بەیەکەوە سەرهات و چیرۆك و قسەی قەدیمی جودا جودایان دەگێڕایەوە. هێندێ جاریش هێندە قسەی خۆش و نەستەقیان دەکرد کە هەر بە پێکەنینەوە دەبۆرژان و



خەویان لێ دەکەوت. زۆر جارانیش کە کاك جەمشید میوانی دەهاتن بانگی دەکردنە ماڵی خۆی و دەبوایە لەگەڵ میوانانی وی ڕووبنیشن و مەجلیسێ گەرم بکەن.

ئەوان هەستیان نەدەکرد لەگەڵ مامۆستایەك یاخود حەکیمێك دان، چون سوهەیلی حەکیم هەمیشە لەگەڵیاندا چەشنی هاوڕێ و برایەك ڕەفتاری دەکرد و لەیەك ژوور و لەسەر یەك خواندا لەگەڵیاندا دەمایەوە. تەنێ بۆ ئەوەی ئەوان ئاسوودە و ڕاحەت بن و باش بخوێنن بەتەواوی ڕەفتاری خۆی چەشنی ئەوان لێکردبوو. ئەو پێشتر زۆر بە کەمی دەدوا و خۆی تێکەڵی خەڵك دەکرد، هەمیشە لە خەیاڵ و بیرکردنەوە و خامۆشی دابوو، وەلێ تەنها بۆ ئەوەی ئەم دوو لاوە هەست نەکەن لەگەڵ مامۆستایەك دان و شەرم نەیان گرێ بەردەوام دەیدواندن و قسەی خۆش و گاڵتەی لەگەڵ دەکردن. زۆر جاران خۆی چێشتی بۆ ساز دەکردن و شیرینی و لیچاڵیشی[1] بۆ چێ دەکردن، لە کاتە بەتاڵەکاندا لەگەڵیاندا دەچوویە دەرێ و جێگا کۆن و دڵگیرەکانی شاهێنی نیشان دەدان. لەکاتێکدا حەکیمەکانی دی نەك هەر نەدەچوونە دەرێ لەگەڵ قوتابیەکانیان، بەڵکو قوتابی گەر بەرامبەر مامۆستاکەی دوو قسەی کردبا لە شەرماندا ئارەقەی دەکردەوە. زۆر جار لە وانەکان نەدەگەیی و لە شەرمی مامۆستا دەری نەدەبڕی. سوهەیل ڕقی

---

(١) لیچاڵ: مرەبا



لەوەبوو کە بێتە ژووریٰ لەبەری هەڵسن و زیاد لە پێویست ڕێزی لێ بنێن، هەمیشە بە سەریاڵ و ئارتینی دەگوت ئێمە برای یەکدین و چۆنی ئاسوودەن ئاوا لەگەڵمدا ڕوونیشن، ئەوەی لەلای من گرنگە خوێندن و پێگەیشتنی ئێوەیە. لەکاتێکدا کە وانە دەخوێنین یاوەخۆ میوانێکمان دێ پابەند بن بە پۆشینی جلی قوتابیانەوە و چەندی ڕێز لە میوانەکە و لە مامۆستای خۆتان بگرن هەر کەمە، وەلێ ئەو دەمانەی کاتی وانە نیین و کەسمان لەلادا نییە بە چ جۆرە جلێك و ڕوونیشتنێك لەگەڵمدا ئاسوودەن بەم شێوازە بن. نامەوێ لە بەرامبەرمدا لەسەر چۆك ڕوونیشن لەکاتێکدا هزر و دڵتان بەتاڵ بێ لە عیلم و ماریفەت. نامەوێ بە ڕادەیەك شەرمم لێ بکەن کە نەتوانن لەگەڵمدا هەموو شتێك بێژن، چۆن لەنێوان خۆتاندا دەدوێن ئاواش لەگەڵ من بدوێن. ئەگەر گەیشتە ڕادەیەك شەرمتان کرد بەرامبەرم و ئاسوودە نەبوون ئەوا ناتوانین هەرسێ لە ژوورێکدا بمێنینەوە و ئاسوودەییتان لێ تێك بدەم. پێم خۆشە هیچی شاراوە لەگەڵ مندا لەگۆڕێ نەبێ و هەرچی خەم و پێداویستیەکتان هەیە ئاگادارم بکەنەوە. من هاتوومە لێرە هەڵگری خەم و برا و باوك و کەسوکارتان بم. هاتووم بتان کەم بە حەکیم، فێری زانستتان بکەم، ئەگەر ئاوا نەبووم لەگەڵتان هەست دەکەم ستەمم لێ کردوون. ئەگەر خۆم خواردنی بەتام و جێگای نەرمم بۆ خۆم ڕاخست و ئاگام لە ئێوە نەبوو کە چی دەخۆن و لەسەر چی دەخەون ئەوا ستەمم لێ کردوون. گەر خەم

و ئازار، یان پێویستیەکتان هەبوو هەوڵی چارەکردنیم نەدا ئەوا ستەمم لێ کردوون. وەك چۆن من شۆخیتان لەگەڵ دەکەم ئێوەش شەرم مەکەن و بیکەن، گرنگ ئەوەیە لە سنوورەکان دەرنەچن و نەگاتە ڕادەیەك پێی بگوترێ بێ ڕێزی و دڵشکان.

سوهەیلی حەکیم بە ڕادەیەك لەگەڵ ئەم گەنجانەدا تێکەڵ ببوو کە هەر دەتگوت لە یەك خوێن و گۆشتن، یەك خێزان و یەك پارچەن، یەك تەن و جیسمن. هەرچی خۆشەویستیەك کە لە دڵی مابوویەوە بەوانی بەخشی بوو، هەرچی ئەوینێك هەیە لەدەرەوە پڕووسکاندبووی[1] و لەنێو ئەم حیکمەتخانەیە لەم دوو لاوەی قەتیس کردبوو. هەموو ئێش و ئازارەکانی ڕابردووی وەلا نابوون و ئارامی و ئاسوودەیی خۆی بەم دوو لاوە هێنابوو. ئەو بۆ پێگەیشتنی ئەوان لەهەموو ئەو شتانەی حەزی لێبوو دوورکەوتەوە. لەلایەن هاوڕێ و دۆستەکانیەوە هەمیشە گلەیی دیارنەبوونی بۆ دەهات و سەرکۆنەیان دەکرد، وەلێ ئەو دەیگوت لێرەم تاوەکو کەسانێك دروست بکەم و جێ پەنجەی خۆم دابنێم، ئیدی نامەوێ لەگەڵ ئاو و هەوای غەمباری دەرێ تێکەڵ ببمەوە. دەرەوە هێندەی ئازاردام کە تا ماوم برینەکانی لەسەر دڵم دەمێننەوە، دەمهەوێ ئەمجارە هەر لە ژوورێدا خۆشەویستی دروستکەم.

---

(١) پڕووسکان: پچڕان

زۆرجاران سوهەیلی حەکیم دوو لاوەکەی لەگەڵ خۆیدا دەبردە بازاڕی شاهێن و چی خواردن و پێویستیان هەبوو بۆی دەسەندن. بەردەوام جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە نابێ ئەوان پێویستیەکیان هەبێ و بەو نەڵێن، بەڵکو حەز و ئارەزوویان چوویە هەر شتێك دەبێ ئاگاداری بکەنەوە. هەروەها دەیگوت قوتابیانی دەرەوە با نەزانن ئێمە هێندە کەیف سازین لەڕووی جێگا و ڕێگا و خواردنەوە ، ئەوان نابێ بزانن کە هێندە بایەختان پێ دەدەم و خۆشم دەوێن، با هەست بکەن توندم لەگەڵتان، تاوەکو کەمترین قوتابی بێتە ئێرە، چون چەندی قوتابی زیاد ببن بۆ من سەخت ترە و ناتوانم بایەخی پێویست بدەم بە هەموویان.

بەزوویی حیکمەتخانەکەی سوهەیل لەنێو قوتابیانی شارەکەدا دەنگی دایەوە و زۆرێك لەوان هەوڵی ئەوەیان دەدا سوهەیلی حەکیم وەریان بگرێ، سەراسیمە ببوون لەوەی کە ئەمە تاکە حەکیمێکە لەم شارەدا هێندە گرنگی بە فێرخوازەکانی بدا و خۆشی بوێن. زۆرێك لە قوتابیانیش ئیرەییان پێ دەبردن، ئاخر ئەوەی حەکیم سوهەیل دەیکرد بۆ ئەم لاوانە نە بەر لە ئەو و نە پاشی ئەویش هیچ حەکیم و مامۆستایەك بۆ فێرخوازەکانی نەیکردووە و نایکاتەوە.

تەنانەت گەر کەسێ چووبایە ژوورێ نەیدەزانی کامەی حەکیمە و کامەی فێرخواز!

ئەمەش زۆرجار گلەیی بەدوای خۆیدا دێنا لەلایەن حەکیمەکانی ترەوە کە نابێ مامۆستا هێندە تێکەڵی قوتابیانی بێ.

سوهەیلی حەکیم تەنێ چەند قوتابیەکی تری وەرگرت و نەیدەویست حیکمەتخانەکەی جەنجاڵ بێ و نەتوانێ مافی هەموویان بدا. قوتابیەکانی تری لە ژوورەکانی دی نیشتەجێ دەکردن و تەنێ سەریاڵ و ئارتین لە ژوورەکەی ئەو بوون. ئەو بایەخی بە هەموو قوتابیەکانی دەدا، لێ هیچ کامیانی چەشنی ئەم دوو لاوە خۆشنەدەویست و زۆربەی ئومێدەکانی خۆی لەسەر ئەم دووەیان بنیات نابوو. سەریاڵ لە سەرەتادا شەرمی لە سوهەیل دەکرد و زۆر بە کەمی دەدوا. لە کاتی نان خواردندا چەند پاروویەکی دەخوارد و دەکشایەوە. بازێ جاریش هێندێ ئاوی دەخواردەوە و دەیگوت تێربووم. زۆر جاران کە خواردن و شیرینی بۆ دێنان وەکو خۆی دەمایەوە و کەمێك نەبێ لێیان نەدەخوارد و خواردنەکە تێك دەچوو. حەکیم سوهەیل لەم حاڵەتە نیگەران ببوو، زۆری لەگەڵ سەریاڵ دەگوت تاوەکو شەرمەکەی بشکێنێ. هێندێ لە شەوان تاوەکو درەنگانی شەو شۆخی لەگەڵ دەکردن و زۆر جاریش هەوڵی توورەکردنی سەریاڵی دەدا و بە ئەنقەست هێندێ فەرمانی سەیر و سەمەرەی پێ دەکرد تاوەکو بیهێنێتە قسە و شەرمەکەی وەلا بنێ.

شەوێك دەیگوت پێویستە سێ جاران لە دەورەی حیکمەتخانەکە بسوورێیەوە، شەوێکی دی دەیگوت حەقی ئەوەی قسەمان بۆ

ناكەی دەبێ چەند خولەكێك بچیتە نێو دۆڵابی جلەكان و لەوێ بمێنیتەوە.

هەندێ جار بە شۆخیەكانی سەریاڵی هێندە ئاتەشی دەكرد كە لە شوێنی خۆیدا نەدەبزواو نقەی لێوە نەدەهات و دادەما، بە ئاشكرا توورەیی بە ڕوخساریەوە دیاری دەدا، وەلێ نەیدەتوانی هیچ لەگەڵ حەكیم سوهەیلدا بێژێ، چون مامۆستای بوو. هەرچی توورەیی هەیە لەنێو سنگیدا دەیهێشتەوە، ئەمە لە كاتێكدا بوو كە ئەگەر ئاڕتین ئەم شۆخیانەی لەگەڵ كردبا سەریاڵ زۆر خراتری پێ دەكردەوە. سوهەیل چونكە سەریاڵی پتر خۆشدەویست زۆربەی جاران شۆخیەكانی ڕووە و ئاڕاستەی ئەو بوون، وەلێ هەمیشە دوای گاڵتەكان كە دەیزانی سەریاڵ توورەیە خێرا دەچوویە ئاتەكی و دەستی لەمل دەكرد و نێو چاوانی ماچ دەكرد و دەیگوت ئێمە براین، برا هەرگیز لە برای خۆی توورە نابێ. ئەوەی دەیكەین شۆخی و گاڵتەیە و بۆ دڵخۆشیمانە، بۆ ئەوەمە كە تۆ بێیتە قسە و ئیدی شەرم نەكەی. ڕۆژێ دێ ئەوانە هەمووی دەبن بە یادگاری و لەوانەیە بشنووسرێنەوە و بەدیاریەوە زەردەكەنی و قاقامان بێتێ. هەمیشە دوای توورە كردنەكان سەریاڵی دڵخۆش دەكردەوە و دووبارە خۆشەویستی و برایەتی دووپات دەكردەوە بۆی. هێندێ جاریش شۆخیەكانی ئاڕاستەی ئاڕتین دەكرد و سەریاڵ زۆر خۆشی لەمە دەهات و لەگەڵ حەكیم سوهەیلدا دەستی پێدەكرد. ئیدی وردە وردە سوهەیلی حەكیم شەرمەكەی

سەریاڵی نەهێشت و وای لێهاتبوو ئەوانیش شەوان شۆخیان لەگەڵ مامۆستادا دەکرد و هەر شەوەی هێرشەکان ڕووە و کەسێك بوو. ئەگەر هێرشەکە ڕووە و مامۆستا با ئەوان هەردوو خۆیان دەکردە یەك، ئەگەریش ڕووە و یەکێك لەوان با ئەوی دی لەگەڵ مامۆستادا دەبوویە شەریك.

لەبەر ئەوەی سەریاڵ کەمێك بێ هێز و لاواز بوو، زۆر جاران کە وانەکەی دەخوێند هێندە کفت[1] دەبوو خێرا لە شوێنەکەی خۆیدا دەکەوت و خەو دەیبردەوە. حەکیم سوهەیل بە جیا ئەو خواردنانەی بۆ ئەو دێنا کە وزە بەخش وخاوەن سوود بوون، ئەگەر زانیبای وەکو پێویست خواردن ناخوا لەلای ڕوودەنیشت و هەڵنەدەستا تاوەکو دەیزانی تێری خواردووە. ئەو دەمەی شەو زۆر درەنگی دەکرد سوهەیلی حەکیم لەسەر جێگاکەیدا ڕادەکشا و بانگی سەریاڵی دەکرد کە هۆنراوەکانی نالی و مەحوی بۆ وەخوێنێ. ئیدی تاوەکو خەو دەیبردەوە سەریاڵ لەلای سەری مامۆستاکەیدا ڕوودەنیشت و بە دەنگە خۆشەکەی هۆنراوەی بۆ دەچڕی.

حەکیم سوهـــەیل هــەمیشە لە قوتــــابی وەرگرتنــدا دوای لێکۆڵینەوەی خۆی پرسی بە سەریاڵ و ئارتین دەکرد و ئەگەر ئەوان بەدڵیان نەبوایە وەری نەدەگرتن، چون دەیگوت نامهەوێ

---

(١) کفت: ماندوو

کەسێك لێرەبێ ئێوە دڵتان نەیگرێ و بەهۆی ئەوەوە خوێندنەکەتان لێ تێك بچێ. ئەو نەیدەویست کەسێك بهێنێتە حیکمەتخانەکە بە دڵی خۆی فەرمان بەسەر سەریاڵ و ئاڕتیندا بکا و بەهۆی ویەوە لە خوێندن سارد ببنەوە، چون زۆرجار لە حیکمەتخانەکاندا دەیبینی کە چۆن قوتابیە گەورەکان یاخود ئەوانەی لە وانەکانی سەرەوە بوون ستەمیان لەوانەی خوار خۆیان دەکرد و کاری بێ ئەندازەیان پێ دەکردن. تەنانەت چەند جارێك کاك جەمشیدیش ئاماژەی بە چەند قوتابیەك کرد کە حەکیم سوهەیل وەریان بگرێ، وەلێ ئەو لەبەر سەریاڵ و ئاڕتین ڕەتی کردنەوە و ئامادە نەبوو کەسێك وەرگرێ کە ئەم دوو لاوە پێیان خۆش نەبێ. ئەمەش هەندێ جار کاك جەمشیدی تووڕە دەکرد و گلەیی دێنایە سەر سوهەیل، بگرە بازێ جار لەسەر ئەم وەرنەگرتنە قوتابیانیش زویر دەبوون لێی.

سوهەیلی حەکیم هەندێ کات کۆمەڵێ یاسای نوێی بۆ خوێندنگەکە دادەنا و دەیهەویست کەمێ توندی بکا، وەلێ هەر ئەوەندەی زانیبای سەریاڵ و ئاڕتین یاساکەیان لەلا خۆش نییە و پێیی قەڵسن خێرا ئاسانکاری بۆ دەکردن و هێندێ لە یاسا نوێکانی هەڵدەوەشاندنەوە. ئەوانیش کە دەیانزانی مامۆستا لەبەروان ئاسانکاری کردووە پتر دەیان خوێند و خۆیان ماندوو دەکرد. لەڕاستیدا ئەوە خۆشەویستی بوو وایکردبوو ئەوان بخوێنن نەك یاسا و ڕێساکان. خۆشەویستی توانای هەیە جێگای هەموو یاسا و نەریتەکان بگرێتەوە، خۆشەویستی نەك هەر خوێندنگایەك،

بەڵكو دەتوانێ وڵاتێك بەڕێوە ببا بەبێ ئەوەی کەم و کورتی ڕووی تێبکا و هەرەس بێنێ.

ئەوە خۆشترین ساتەکانی حەکیم سوهەیل بوو لەگەڵ قوتابیەکانی دا، نایابترین یادگاری و پڕچێژترین جوانی بوو لە ژیانیدا. دەبێ چی لەم هەموو خۆشەویستیە جوانتر هەبێ؟ چی لە خۆشەویستی و عیشقێك دڵگیر و نایاب ترە کە لە نێوان مامۆستا و قوتابیەکەی دایە؟ ئەگەر دەتانزانی ئەم جۆرە ئەوینە چەندە لێوانلێوە لە سۆز و وەفا ئەوا پتر بایەخدار دەبوو لاتان و هەوڵی چەشتنیتان دەدا. دەبێ چ جۆرە بەرژەوەندیەك لەم جۆرە خۆشەویستیەدا ڕەچاو بکرێ جگە لەوەی کە مامۆستا دەیهەوێ ببینێ قوتابیەکەی پێ بگا و سەری پێی بەرز بێ. سوهەیلی حەکیم زۆربەی شەوەکان کە سەریاڵ و ئاڕتین خەو دەیبردنەوە هەڵدەستا و لەگەڵ حەکیمی مەزندا دەکەوتە قسە و نزای بۆ قوتابیەکانی دەکرد، هەمیشە داوای لە حەکیمی مەزن دەکرد کە سەریاڵ و ئاڕتینی لێ نەستێنێ و بەردەوامی بدا بەم خۆشەویستیە. ئەوان لە خەوی شیرین دابوون و مامۆستاکەیان بێدار بوو بۆ ئەوەی نزایان بۆ بکا. ناوە ناوە دەچوویە ژوورەکە و دەیڕوانی نەبادا یەکێ لەوان لێفەکەی لەسەر لاچووبێ و سەرمای ببێ. لەبەر ئەوەی سەریاڵ لەکاتی خەوتندا بەزۆری دەجما[1]،

---

(١) دەجما: دەجووڵا



زۆربەی جاران لێفەکە لەسەری لادەکەوت و سوهەیلی حەکیم پێیدا دەدایەوە. هەندێ جارانیش کە لێفەکەی بۆ چاك دەکرد بەدەستەکانی قژە خاوەکەی لەسەر چاوی لادەبرد و نێوچاوانی ماچ دەکرد. ئەو بە جۆرێکی سەیر سەریاڵی خۆشدەویست، بە بینینی ئەو هەم خەونەکەی نێرداوی مەزن و هەم گوتەکەی دانیالی پیر و هەمیش هیلالی دەهاتەوە یاد. شەوان ئەو دەمەی لە ژووریٚ بێزار دەبوون دەچوونە حەوشەکە و لەنێو باغە بچووکەکەی حیکمەتخانەدا ڕوودەنیشتن و میوە و چاییان دادەنا. هەمیشە سەریاڵ میوەکانی بۆ مامۆستاکەی سپی دەکرد و چایی بۆ تێدەکرد و دەیدایە دەستی، زۆر جارانیش ماستاوی بۆ چادەکرد.

شەو هەبوو تا بەرە بەری سەحەر لاوەکان دەردە دڵیان بۆ مامۆستاکەیان دەکرد و ئەویش گوێی بۆ ڕادەگرتن. مامۆستاش ئەگەر کێشەیەکی هەبوایە بەر لە هەمووان ئەوانی لیٚ ئاگادار دەکردەوە. چەشنی خێزانێکی بچووك و قەشەنگ لەگەڵ یەکدی دابوون و ئەوەی سەرنجی لێدابان ئیرەیی پیٚ دەبردن.

قیدار ماوەیەکی زۆربوو دیارنەبوو، ڕۆژێك ئەو دەمەی سەریاڵ لە بەرامبەر مامۆستادا ڕوونیشتبوو تاوەکو وانەکە بخوێنن خێرا قیدار وەژووریٚ کەوت و گوتی: بڵیٚ بەم کوڕە با بچێتە دەریٚ.

سوهەیل بە دەنگێکی نزمەوە: بۆچی چی بووە قیدار؟

سەریاڵ وایزانی مامۆستا لەگەڵ ئەویەتی و گوتی: چیت گوت قوربان؟

+ هیچ نییە سەریاڵ گیان، لەگەڵ تۆم نەبوو کاکە.

قیدار بە دەنگی بەرز: دەزانی خەریکی چی حەکیم سوهەیل دەزانی؟ لەبەر لاوێك هەموو ئەوانی دیت فەرامۆش کردووە و کەس ناناسی، هەر بە ئەنقەست چەند ڕۆژە دیارنیم، ناڵێی ئەم کابرایە چی لێهات و چی لێنەهات، ئەرێ مردووە، ماوە چی لێ قەوماوە!

سوهەیل لەگەڵ ئەم هات و هاوارەی قیداردا ڕەنگی تێك چوو، لێ لەبەر سەریاڵ چی نەدەگوت.

سەریاڵ: قوربان دەڵێی نەخۆشی؟ بێتاقەت دیاری؟

+ باشم باشم برا گیان، با دەست بە وانەکە بکەین و کتێبەکەت بکەرەوە.

قیدار کە ئەمەی ژنەوت بەتووڕەییەوە لەلایەك ڕوونیشت تاوەکو وانەکەی سەریاڵ کۆتایی هات و ئەو چوویە دەرێ، ئینجا دەستی پێ کردەوە: تۆ ئاگات لەخۆتە جەنابی حەکیم؟

+ قیدار هات و هاوار مەگرەوە لەسەرم، ئەمە لەبری ئەوەی دەست خۆشیم لێ بکەی کە لێرەدا خزمەت دەکەم و وانە دەڵێمەوە.



- دەست خۆشی لە چی بکەم ها؟ لە چی بکەم ئاخر؟ من تا ئێستا نازانم تۆ مامۆستایانی یان قوتابی لەگەڵ ئەواندا! باشە بۆچی خۆت چێشت لێدەنێی و حەلواو شیرینی دروست دەکەی، پێم بێژە ئەوە کاری مامۆستایە؟ بابە تۆ هەموو خەڵکت فەرامۆش کردووە فەرامۆش. ئاخر کەسانێك هەن خۆشیان دەوێی و تۆ مەجالت بۆ کەس نەهێشتۆتەوە! باشە باش لەمەش گەڕێ، تخوا چ حەکیمێك ئامادەیە ژوورەکەی خۆی بدا بە قوتابیەکانی و لەژوورێکدا لەگەڵ ئەوان بخەوێ ها؟ ئەوانت هێناوەتە ژوورەکەی خۆت و جوداوازی دەکەی لەنێو قوتابیەکاندا. دەزانی کاك جەمشید ئەمە بزانێ چەندە پێ تێك دەچێ؟ تۆ سوهەیل نی نا بۆچی هێندە گۆڕاوی؟ لە ژیانمدا نەمدیوە تۆ هێندە شۆخی و گاڵتە بکەی، تۆ پێشی بێیە ئێرە بەتۆبزی قسەت دەکرد برا هێندە خامۆش بووی، تەنێ بۆ دڵخۆشی ئەوان تەواوی ڕەفتار و ئاکاری خۆت گۆڕیوە. ئینجا ئەم چوونە دەرەوەی شەوان لەگەڵیاندا تۆ بە دروستی دەزانی؟ ئایا دەزانی خەڵك چ قسەت لەسەر دەکەن، دەڵێن حەکیمێکی گەورە و گرانە و جلی حەکیمایەتی دادەنێ و لەگەڵ قوتابیەکانی دەچەرخێ[1]. باشە ناترسی کاك جەمشید ئەوە ببینێ و دەرت بکا؟ ئەی چۆن دەهێڵی لە بەرامبەر تۆدا هەرچۆنیان بوێ ئاوا ڕوونیشن و جلی قوتابیانیش دابنێن؟ ئایا هیچ حەکیمێك لە شاهێندا ئەمە قەبووڵ دەکا؟! کورە کاکە کابرا شەرمت لێدەکا

---

(١) چەرخان: سووڕانەوە

شەرم، بە تۆبزی دەتهەوێ شەرمەکەی بشکێنی و لێی ناگەڕێی. دواتر چ پێویستە بە تەنیا خواردن بۆ سەریاڵ بێنی لەسەر گیرفانی خۆت تەنیا لەبەر ئەوەی لاواز و بێ هێزە، ئەم کوڕە دایك و باوکی نییە قوربان؟ ئەی کڕینی ئەم هەموو خواردنە جۆراوجۆرە لەبەر چی؟ تۆ هەرچی حەزیان لێبوو خێرا بۆیان دەسەنی، لەنێو بازاڕدا دەیان سووڕێنیتەوە، لەکاتێکدا لە حیکمەتخانەکانی تر قوتابی تێر سکی خۆی ناخوا. کاکە کوڕە دەڵێ مامۆستا تێر بووم تێر، تۆ هەر وازی لێ ناهێنی. ڕاوەستە چۆن لە کۆتاییدا بێ شەرمی دەکەی لە خۆت و پەنجەی پەشیمانی دەگەزی. گۆڕینی یاساکانی حیکمەتخانە لەبەر ئەوان و وەرنەگرتنی قوتابی لەبەر ئەوان، ئاخر ئەوە شێتم دەکا لەبەر وان خەڵکی دی وەرنەگری و یاسا و ڕێساکان بگۆڕی، جگە لەمەش کاك جەمشید خۆی بڵێ فڵان کەس وەرگرە تۆ وەری نەگری! ئینجا خۆشت ڕۆمانسی بکەی و شەوان لێف بە قوتابیەکانت دابدەیەوە. لەمە زەرەر دەکەی سوهەیل گیان، سوێند دەخۆم ئەمە بە زەرەری خۆت تەواو دەبێ. کورە ئاخر لە چ حیکمەتخانەیەکدا قوتابی تا بەرەبەری بەیان بەئاگایە لە حیکمەتخانەکەی تۆ نەبێ!

+ تەواو بووی قیدار؟

- تەواو تەواو داخی ئەو چەند ڕۆژەم هەموو ڕشت، پێم وابێ هیچم نەهێشت.

سوهەیل بە نەرمیەوە: قسەکانی تۆ بەسەرێك تەواون، هیچ حەکیمێك بەم شێوازە نییە لەگەڵ قوتابیەکانی، وەلێ یاسا و ڕێسا و سروشتی هەموو کەسێك جودایە لەگەڵ کەسێکی دی. من لەنێو هەموو ڕێگاکاندا خۆشەویستیم هەڵبژاردووە و پێم وایە ئەمە سەرکەوتووترین ڕێگایە. هەست دەکەم قازانجی زۆرە و ئەوانیش بەهۆی ئەم خۆشەویستیەی منەوە باشتر دەخوێنن. دەی مەگەر منیش هەر ئەمەم ناوێ کە بخوێنن و ببنە حەکیم؟

- باشە زۆرباشە، ئەوە زانیمان جەنابی پایە بەرزت ڕێچکەیەکی تایبەتی خۆت هەیە لە فێرکردنی قوتابیەکانت کە بریتیە لە خۆشەویستی، بەڵام بۆچی تەنها بۆ ئەم دوو کەسە و بەتایبەتی تریش بۆ سەریاڵ؟ مەگەر ئەوانی تریش قوتابی نیین؟!

+ پێویستە دادپەروەر بی لە قسەکانت قیدار گیان، من زیاد لە پێویستم بۆ ئەوانی تریش کردووە، ڕۆژێك لە ڕۆژان نەمهێشتووە وانەیەکیان بڕوا، برسی ببن، تینوو ببن، پێویستیەکیان هەبێ. ئەگەر تەنێ گرنگی بەم دووە بدەم لەسەر حیسابی ئەوانی دی ئەوا مافی خۆتە ئەم قسەیە بکەی، وەلێ کە من مافی ئەوانی ترم بە تەواوی دابێ و لەچاکەی خۆم پتر چاکە لەگەڵ ئەم دووەیان بکەم بۆچی ڕەخنەم لێ دەگری؟! تەنانەت باوکیش ناتوانێ منداڵەکانی هەموو بە یەك ئەندازە خۆشبوێ، بێگومان هێندێکی لە هێندێکی دیکە پتر خۆشدەوێن، ئەمەش کاری دڵە و کاری من



نییە قیدار. بۆ وەرگرتنی قوتابییش خۆت دەزانی ئەمن لەبەر ئەم دوو گەنجە هاتمە ئێرە، ئێستا چۆن کەسێك وەردەگرم کە بزانم خوێندنەکەی ئەوانی پێ دەشێوێ. ئەوانم بە برا و کەسی خۆم داناوە قیدار تێ بگە لێم، بۆ پێگەیشتنی ئەوان هەموو کارێك دەکەم. با خەڵك هەر وا بزانن من قوتابیم. ئەوە چ بایەخێکی هەیە؟ مرۆی باوەڕدار دەبێ ملکەچ و نەرم و نیان بێ و بەزەیی هەبێ بەرامبەر هەمووان. تۆ دەتەوێ خۆم بە گەورە بگرم و جێگای تایبەت بۆ خۆم دانێم و لەسەرەوەی میوانەکانی کاك جەمشید دانیشم و خەڵك بێن دەستم ماچ بکەن؟ خزمەتی قوتابیەکانم لە هەموو شتێك بە بایەخ تر دەزانم.

- منەتیان بەم چاکانەت هەیە ئەوان؟ زۆر زۆر ساڵێکی تر، کورە دوو ساڵی تر لەلات دەبن و دەڕۆن و کەسانێکی تر دێن. لەبەر یەك دوو کەس بۆچی خۆت خراپ دەکەی لەلای خەڵکی؟ بەیانی جێت دێڵن و هەر ناشت ناسن، قوتابیان ئاوان و بێوەفان بەرامبەر مامۆستاکانیان، تۆ نازانی سوهەیل گیان زۆر خۆش باوەڕی. بەخوا دەترسم سبەی ڕۆژێ خراپیش ببی لەسەر چاکەی خۆت.

+ نا قیدار گیان نا، ئەوان قەت لەمن دانابڕێن، ئەوانیش منیان خۆشدەوێ، خەمی منیانە، ئێمە چەشنی خێزانێکین، کەس و کاری یەکترین، خۆشەویستی لە نێوانماندا هەیە، ئەگەر چەند



ساڵێکی تر بوونە حەکیمیش هەر سەر لە مامۆستاکەی خۆیان نابڕن، ئەرخەیانم[١] لەوە.

- هاهاها، دڵنیا مەبە حەکیم سوهەیل دڵنیا مەبە، تۆ چاوەڕێی ئەوە دەکەی تا دەبنە حەکیم لەلات بن! قوتابی تا حیکمەتخانە تەواو دەکا بیست حەکیم دەگۆڕێ، ئینجا ئەگەر ئەوانە پێشیان تەواو بکرێ هەر باشە. هەمیشە لەو کەسانە بترسە ئازارت بدەن کە چاکەت زۆرە بەسەریانەوە، ئەم قسەیە بەلاش نەکراوە حەکیم سوهەیل، بەلاش نەکراوە. دڵنیام جێت دەهێڵن و ئەمانەش بە چەشنی هیلال دەبنە برینێکی دی لەسەر دڵت، بۆیە باش نییە هێندە خوویان پێوە بگری و ئارامی خۆتیان پێ بێنی.

+ تخوا بەسە قیدار باسی جێهێشتن و شت مەکە کاکە بەسە.

- تەواو تەواو برا گیان، من داوای لێبوردن دەکەم، دەزانم بەم بابەتانە تێك دەچی و لە ڕابردوودا چیت بەسەر هاتووە. دووبارە ببوورە کە هێندێ جار دەنگ بەسەرتدا هەڵدەبڕم، ئەمەم لێ مەگرە سوهەیل گیان، خوێکە و لە مناڵیەوە وا ڕاهاتووم کە زوو بە شتەکان پەست دەبم. دەزانم تۆ پلەت زۆر لەمن بەرزترە و دەشزانم کە دانیالی پیر چەندە باسی دەکردی و گرنگی پێ دەدای، وەلێ سوێند بە حەکیمی مەزن منیش خەمی تۆمە بۆیە وا دەکەم، ئاخر نامەوێ تۆ دووبارە ئازار بچەژی.

---

(١) ئەرخەیان: دڵنیا

+ باشە قیدار گیان بۆچی ڕقت لەم دووانە دەبێتەوە؟ تۆ کەسێکی دینداری، چۆن دەبێ ڕق لەنێو سینەی کەسێکی دینداردا جێی ببێتەوە؟

- سوێندت بۆ دەخۆم ڕقم لێیان نییە حەکیم سوهەیل، بگرە زۆریشم خۆشدەوێن، تەنێ لەبەر ئەوە وا دەکەم دەترسم ببنە مایەی ئازاردانت، ئاخر تۆ نابێ دووبارە ئازار بچێژی، دکتۆر وای گوتوە سوهەیل گیان دکتۆر.

سوهەیلی حەکیم لەسەر ڕێچکەکەی خۆی لەگەڵ فێرخوازەکانی بەردەوام بوو، زۆریان پێوە ماندوو دەبوو تاکو فێرببن، ڕۆژ بە ڕۆژ خۆشەویستی لەنێوان ئەم مامۆستا و قوتابیانە پتر دەبوو. حەکیم برای نەبوون و تاقانەبوو، ئەو سەریاڵی لەجێی برا بچووکی خۆی دانابوو. ڕۆژێك لەنێو باغە بچووکەکەی حیکمەتخانەدا سەریاڵی بانگ کرد و گوتی: دەزانی سەریاڵ گیان من هیچ برایەکم نییە.

- بەڵێ مامۆستا ئاگادارم.

+ لە ژیانمدا ئاواتم ئەوە بووە برایەکی بچووکم هەبێ و گرنگی پێ بدەم و ئاگاداری بم، لە ئاتەکم بێ و هێندەی هەموو دونیا خۆشم بوێ. دەزانی بۆچی تۆم بانگی ئێرە کردووە؟

- نەخێر قوربان نازانم.

+ دەبیتە ئەو برا بچووکەی من سەریاڵ گیان؟ قەبووڵتە تۆ ئەو برا بچووکەی من بی کاکە؟

سەریاڵ بە تۆزێك شەرمەوە: تۆ هەمیشە برای گەورەی من بووی مامۆستا، من هەر لە سەرەتاوە تۆم بە برای خۆم داناوە.

سوهەیل لەگەڵ ئەم قسەیەدا فرمێسکی لە چاوان دابەزین و بەدەستەکانی خێرا سرِی و سەریاڵی لەباوەش گرت. لەو ڕۆژەوە پەیمانی دا کە تا ماوە برایەتی بۆ بکا و ئاگای لێ بێ.

ئەو دەمانەی کە سەریاڵ و ئارتین کاتی چوونەوەیان دەهات و دەڕۆیشتنەوە حەکیم سوهەیل لەشوێنی خۆیدا غەمباری تینی بۆ دێنا و بێتاقەت دەبوو. دەستی هەردووکیانی توند دەگوشی و تا بەر دەرگا بەڕێی دەکردن و تا لەبەر چاوانی ون دەبوون تێیان ڕادەما.

دەیگوت بەڕاستی هەفتەیەك بێ ئێوە زۆرە و بیرتان دەکەم تا دێنەوە. ئاخر بێ ئێوە حیکمەتخانە چۆڵە و وەکو ئەوە وایە کەسی تێدا نەبێ. من هەموو ڕۆژێ وا ڕاهاتووم کە بتان بینم و وانەتان پێ بڵێم. بە تایبەتی ڕووی لە سەریاڵ دەکرد و دەیگوت:

ئەوە دیسان دەڕۆی و دێڵی مامۆستات بیرت بکا سوورە؟

سەریاڵیش خەندەیەکی بۆ دەکرد و دەیگوت: دێمەوە دێمەوە مامۆستا، دڵنیابە جێت ناهێڵم.

ئەو هەفتەی تا ئەوان دەگەڕانەوە حەکیم سوهەیل هەر خەیاڵی لەلایان بوو، کە دەچوویە حیکمەتخانە و ژوورەکەی خۆی هەستی

بە خامۆشی و چۆڵیەکی لەڕادە بەدەر دەکرد. کەسێك نەبوو لەوێ شۆخی بکا و دەنگی قاقای سەریاڵ و ئاڕتین نەدەهات. سەرەڕای ئەوەش شەوان کەس نەبوو هۆنراوەکانی نالی و مەحوی بۆ بخوێنێتەوە و بە دەنگە خۆش و بەسۆزەکەی دڵی ئارام بکاتەوە.

حەکیم سوهەیل شەوان تاوەکو ئەوان نەنوستبان نەدەنوست، سەریاڵیش بەتەواوی دژی خەو بوو، هەمیشە ئەو کێشەیەیان هەبوو کە دەبوایە چەندین جار سوهەیل پێی بێژێ و دەنگی بەسەردا هەڵبڕێ تاوەکو دەچوویە ژێر جێگاکەی و خەوی لێدەکەوت. ئیدی ئەوکات کاتی موناجات و پاڕانەوەی سوهەیل بوو لە خزمەت حەکیمی مەزندا.

بەیانیانیش زوو بەر لە هەموو قوتابییەکان حەکیم سوهەیل واگا دەهات و یەکەم کەس بانگی سەریاڵی دەکرد، دەچوویە بان سەری و دەستی بە قژی دادێنا و بە دەنگێکی نەرم هۆشیاری دەکردەوە و سەریاڵیش ئەوانی دی وەخەبەر دێنا. ئەو لەنێو قوتابییەکاندا کرابوویە برا گەورە، ئەگەر سوهەیل خۆشی لەوێ نەبا پارە و پوولەکانی بە سەریاڵ دەدا بۆ ئەوەی پێداویستی بۆ حیکمەتخانەکە و قوتابییەکان بکڕێ و سەریاڵیش زۆری دڵ بەمە خۆشبوو.

سوهەیل جاروبار دوو لاوەکەی لەگەڵ خۆیدا دەبردە سەفەر و شوێنە دڵگیرەکانی شاهێن و دەرەوەی شاهێنی نیشان دەدان.

بارکێشەکەی[١] ماڵی باوکی لەگەڵ خۆیدا دێنا و خۆی و ئاڕتین لەنێو گالیسکەکەدا ڕوودەنیشتن و سەریاڵیش چون لە ئەسپ سواریدا کارامەبوو دەبوویە هاژۆر. هەمیشە دەیگوت مامۆستا من ئەسپ سواری تۆم و بەرەو هەر کوێیەك پێت خۆشە دەتگەیەنم. جۆرە شەربەتێك لە شاهێن هەبوو ناوی شەکرێن بوو، سەریاڵ زۆر وازی لێبوو، وەلێ هەمیشە حەکیم سوهەیل ڕێگری لێدەکرد کە بیکڕێ و دەیگوت شەکرێکی زۆری تێدەکرێ و بۆ تەندروستیت خراپە، لێ ئەو هێندێ جار بەدزی مامۆستا دەیخواردەوە. ئەو دەمانەی سەریاڵ نەخۆش کەوتبایە حەکیم سوهەیل خێرا دەیبردە لای دکتۆر و چارەسەری بۆ وەردەگرت، کە دەیهێناوەش زوو دەچوویە ناندینەکە و شۆرباوی گەرمی بۆ چێ دەکرد و لەلای هەڵنەدەستا تاوەکو هێندێکی لێ دەخوارد و دەکشایەوە. شەو تا بەیانی لەلای ڕوودەنیشت و خەو نەدەچوویە چاوانی تا چاك دەبوویەوە. هێندێ جاریش گۆشتی بۆ سوورەوە دەکرد تاوەکو زوو تەندروستی بۆ بگەڕێتەوە. لەگەڵ نەخۆش کەوتنی ئەودا جەستەی سوهەیلیش بەرەو نەساغی و ناتەواوی دەچوو. جارێکیان ئەو دەمەی سەریاڵ چووبوویەوە و چەند ڕۆژێك لەکاتی خۆیدا دواکەوت و نەهاتەوە، سوهەیلی حەکیم زیاد لە ئەندازە بێتاقەتی دایگرت و خێرا کەسێکی ناردە ئەو شارەی سەریاڵی لێیە تاوەکو هەواڵی بزانێ. ئەو دەمەی

---

(١) بارکێش: وڵاخ

هەواڵ هاتەوە کە نەخۆشە و لانی کەم پێویستی بە هەفتەیەکی تره تاوەکو چاك دەبێتەوە و دەگەڕێتەوە، بێزاریەکی تاقەت پڕوکێن ڕووی لە سوهەیل کرد و بەتەواوی غەمبار بوو بۆ برا بچووکەکەی. خێرا وەکو جاران ڕووی لە بناری شاخ و دەو جۆبارەکە کرد و بۆ دڵخۆشی سەریاڵ چەند دێڕە شیعرێکی خەندە ئامێزی نووسین و بە نامەبەرێکدا بۆی ڕەوانە کرد.

وەرەوە بــێ تـــۆ ئــەم وەزعە نـاکرێ
وەرەوە تـــاکو حـەلــوات بـــۆ چـاکرێ
بێ تۆ ناخورێ شەکرێن و کێکی شــیرین
چۆن دابنێین لە دووریت شیر و هەنگین
وەره هەتـا ڕابـردوو سـەر بـا بخـــەم
پوول و پــارەت با لەژێر پـێ ڕابــخـــەم
کێ یە شیعـرم بۆ بلێ وەختی خـــەوێ
بـــە کێ بێژم بنـوو زوو نیـوەی شـەوێ
وەره سبەینان من بـانگی کێ بـــــکەم
وەره تـاکو شۆربات لـــەبـۆ تـێ بـکەم

ئیدی ئەم هۆنراوەیە وەکو یادگاریەکی شیرین و جوان لەلای سەریاڵ مایەوە و ئەم دوو برایە هەر جارێك چاویان پێ دەکەوتەوە زەردەکەنی و قاقایان دەهاتێ.



## ژن هێنانی حەكیم سوهەیل



سوهەیلی حەكیم لەدوای لەدەست دانی پریاسكە زۆر خەیاڵی ژن هێنانی لەسەردا نەبوو، بەتایبەتیش كە ئەو ژیانی خۆی بۆ خزمەتی قوتابیەكانی دانابوو، وەلێ هەمیشە خزم و ناسیاوەكانی چەندین كچی شۆخ و شەنگی جودا جودایان بۆ دەست نیشان دەكرد و هێندێ لە هاوڕێكانیشی خزم و كەس و نزیكانی خۆیان بۆ سوهەیل پێشنیار دەكرد. سوهەیلی حەكیم بۆ هەموویان تەنها هێندەی دەگوت كە جارێ تەمای ژن هێنانم نییە و لەئێستادا ناتوانم ئەم پرۆسەیە ئەنجام بدەم.

ڕۆژێك یەكێك لە حەكیمە هاوڕێكانی بەناوی ڕەزوان كە پێشووتر لە حیكمەتخانەدا لەگەڵی بوو سەردانی كرد و دوای چەندین قسە و باس پێی گوت:

شوكر بۆ خودا ئێستا لە هیچت كەم نییە و حیكمەتخانە و خانووت هەیە مامۆستا سوهەیل، پێم بێژە قەراری ژن هێنانت نەداوە؟

+ لەڕاستیدا هاوڕێ و نزیكانم كەسانێكی زۆریان بۆ پێشنیار كردووم و خەڵكانێكی زۆر حەزیان بەوە كردووە كە خزمایەتی و تێكەڵاویان لەگەڵ بكەم، وەلێ نازانم بۆچی من تا ئێستا ئەم بڕیارەم نەداوە و دڵم بۆی نەجماوە[١].

---

(١) جمان: جووڵان، نەجماوە: نەجووڵاوە

- بمبوورە کە ئەم قسەیە دەکەم، وەلێ ئەمە کەم و کورتیە بۆ تۆ حەکیم گیان، زۆربەی هەرە زۆری حەکیمەکان لە کۆن و نوێدا هاوسەرگیریان کردووە و بە کردارێکی زۆر باشیان زانیوە. تۆ ئەگەر ئێستا لەم تەمەنی گەنجیەدا نەیهێنی دواتر زۆر پەژیوان دەبیەوە.

+ خۆ من نەمگوتوە نایهێنم برا، دەڵێم لە ئێستادا بڕیارم نەداوە و زۆر مژوولی حیکمەتخانەکەمم.

- من کەسێکی زۆر زۆر باش دەناسم، لەنزیك ماڵی ئێمە خێزانێکی یەکجار دیندار و بە ڕەوشت و ڕێزدار هەن، لەڕاستیدا من بەم دواییە زانیم کچیان هەیە، چون هەرگیز لە دەرێ نەمدیوە ئەوەندە شەرمن و بە حیشمەتە، دەنا خۆم تێکەڵاویم دەکردن، وەلێ خۆت دەزانی کە من بەم دواییە خێزانم پێك هێنا.

+ نازانم چ بێژم بەڕاستی، وەلێ مادام تۆ ئاوا ستایشیان بکەی دەبێ مرۆی چاك بن.

- وا پێت دەڵێم سوێند بەخوا من نەمزانیوە کچیان هەیە، ئینجا لەگەڵ ئەوەشدا لەو گەڕەکەی ئێمە تا ئێستا خێزانی ئاوا چاك و پاك وجوودیان نەبووە و هەموو خەڵکی ئەوێ شایەدیان بۆ دەدەن.

+ جوانیشە؟

- زۆر، خۆم نەمدیوە، وەلێ کە باسی دەکەن دەڵێن زۆر جوانە. دوو برا بچووکەکەی قوتابیم بوون و وانەم پێ گوتوون و کەسانی



بەرچاون. ئەگەر دەڵێی کار ئاسانیەکی باشت بۆ دەکەم، چون پەیوەندیم زۆر خۆشە لەگەڵ باوك و براکانیدا. ئینجا ئەم کچە هێندە پەرۆشی حیکمەتە کە گوتبووی تا حەکیمێك نێتە داوام من شوو ناکەم. دەی لەمە چاکتر هەیە کە کچە حەزی لە پیشەکەت بێ و پێی مەمنوون بێ؟

سوهەیل بە شۆخیەوە: تا ئێستا خەڵکی ئەم باسانەم بۆ دەکەن بە کەسیانم نەگوتووە بیری لێ دەکەمەوە، وەلێ تۆ هێندە بە خۆشی و تامەزرۆییەوە لە باسەکە دەدوێی وات کرد کە بیری لێ بکەمەوە حەکیم ڕەزوان. کە چوومەوە چەند قسەیەك لەگەڵ ماڵێدا دەکەم و بزانم خۆشم چۆنم عەقڵ دەیبڕێ و هەواڵت پێ دەگەیەنمەوە.

حەکیم ڕەزوان بەچەشنێ بابەتەکەی بۆ سوهەیل ڕازاندەوە وایکرد کارەکە بچێتە دڵی و بیری لێ بکاتەوە. ئەو ڕۆژە سوهەیل لەگەڵ دایك و باوکیدا ئەو بابەتەی وروژاند و ئەوانیش زۆریان لەدڵ خۆشبوو، هەر زوو دایکی گوتی بەیانی دەچین و دەیبینین با بزانین تا چەندە لەگەڵ ئێمە گونجاوە و ڕێکە. دەبێ ئافرەتێکی خاتوون و کابان بێ و لە بەڕێوەبردنی ماڵ و حاڵدا شارەزابێ. ئینجا کوڕم دەبێ جوانیش بێ. تۆ زەحمەتە لە جوانی و شت بزانی بۆیە خەمت نەبێ من چاك تێی ڕادەمێنم.

+ لەڕاستیدا نازانم بڵێم چی، من دەیان کەسیان بۆ پێشنیار کردووم نەمگوتووە دەچین، لێ نازانم هۆکار چی یە بۆ ئەمەیان

هێندە دڵم نەرم بووە دایکە. دەی دەی با بچین قابیلە چی ڕوودەدا، ئەگەر زۆرمان عەقڵ گرت ئەوا چاکە، خۆ ئەگەر عەقڵیشمان نەیبڕی زەرەرێکمان نەکردووە.

سوهەیلی حەکیم هەر ڕۆژی دواتر بە حەکیم ڕەزوانی ڕاگەیاند کە ماڵی کچە ئاگادار بکەنەوە لەوەی ئێمە بەیانی دێین و هەر بۆ بەیانی لەگەڵ دایك و خوشکەکانیدا چوونە خوازبێنی و داوای دەستی خاتوو (مەنسا)یان کرد بۆ سوهەیلی حەکیم.

ئەو دەمەی سوهەیل خاتوو مەنسای بینی زانی کچێکی زۆر ڕێك و لەبارە و خوێندەواریشە، وەلێ لەهەمان کاتیشدا دڕدۆنگیەکی لە ڕادەبەدەر دڵ و دەروونی سوهەیلی داگرتبوو. ئاخۆ دەبێ ئەم کچە بۆ ئەو بشێ یاخود نا؟ دەبێ بتوانێ جێگای پریاسکەی بۆ پڕکاتەوە و ئەو خەیاڵانەی لە کەڵکەڵەی دابوو کە لەگەڵ خاتوو پریاسکە بیان گەیەنێتە جێ، ئایا لەگەڵ ئەم خاتوونەدا دەتوانێ بە ئەنجامی بگەیەنێ یاخود نا؟ ئەم باسانە تەواو دڕدۆنگی کردبوو، هەر ئەو دەمەی لە ماڵەکە هاتنە دەرێ خێرا ڕووی لە دایکی و خوشکەکانی کرد و گوتی: چۆنتان عەقڵ بڕی؟

دایکی هاتە دەنگ: زۆر ڕێك و پێکە و جوانیشە، پێم وانەبوو عەیبێکی هەبێ.

سوهەیل ڕووی لە خوشکەکانی کرد و گوتی: ئێوە چی دەڵێن ئافرەتینە، پێتان چۆن بوو؟

خوشکێکی گوتی: زۆرم دواند و لە ئاتەکی ڕوونیشتم، نەمتوانی عەیبێکی لێ بدۆزمەوە. ناڵێم زۆر زۆر جوانە، وەلێ جوانیشە و کەم و کوڕیت پێ لێ نادۆزرێتەوە. با بچین لەماڵی چەند دراوسێیەکیان پرسیاریان بکەین داخوا خێزانێکی چۆن چۆنین.

هەر ئەو دەمە لەدەرگای ماڵی یەك دوو دراوسێیان دا و ئەوانیش پەسنێکی[1] زۆریان کردن و بە خێزانێکی پڕ لە ڕەوشتیان ناوبردن.

سوهەیلی حەکیم نەیدەتوانی جارێ هیچ بڕیارێك بدا، پێویستی بە بیرکردنەوەیەکی زۆر هەبوو، لەلایەکی دیش هزری لای حیکمەتخانە بوو کە ئیمڕۆ لە بەیانیەوە نەچوومەتە ئەوێ و ئێستا دەبێ چی بگوزەرێ و سەریاڵ و ئاڕتین چیان ئامادە کردبێ و خواردبێ.

هەر زوو دوای نیوەڕۆ خۆی گەیاندەوە حیکمەتخانەکەی و ڕووی لە سەریاڵ کرد:

ئەو نیوەڕۆیە لێرە نەبووم هیچتان خواردووە؟

- بەڵێ مامۆستا هێندێ ساواری دوێنێ مابوو گەرمم کردەوە، لەو ماڵی دراوسێیەش تۆزێ شیرمان هێنا بە نانەکە خواردمان.

دەی زۆر چاکە نۆشی گیانتان بێ، من ئەگەر جار جار دیار نەبووم دیارە کارێکی گرنگم هەیە و تۆ لەبری من ئاگات لێرەبێ

---

(١) پەسن: مەدح و ستایش



سەریاڵ گیان، هەرکات پارەشت پێنەما یاخود کەمی کرد ئاگادارم بکەوە و چیتان پێویست بوو بیکڕن.

ئەو ڕۆژە کە سوهەیل بیری لە بابەتەکە دەکردەوە لەنکاودا حەکیم ڕەزوان لێی وەژووریێ کەوت و دوای چاك و چۆنی گوتی: پێم بێژە بەدڵت بوو یان نا؟

+ نازانم چی بڵێم حەکیم ڕەزوان، وەکو گوتت ماڵێکی زۆر باش دیاربوون، وەلێ من پێویستم بە بیرکردنەوەیە و دەبێ پتر بۆی دابنیشم.

- من پێم وابێ ئەوان ڕازین و دڵیان بەمە خۆشە، وەلێ لەتۆ دەترسم سوهەیل، دەترسم تۆ ڕازی نەبی. پێویستە لە ماوەی سێ ڕۆژدا وەڵامم بدەیەوە، چون جوان نییە لەمە درەنگتر بکەوێ.

لەدوای ڕۆیشتنی حەکیم ڕەزوان خێرا قیدار هات و گوتی: چییەوە حەکیم سوهەیل ژن دێنی؟

+ بەڵێ قەرارە، وەلێ زۆریش دوو دڵم.

قیدار بە شۆخیەوە: باشە تۆ ئاوا سەریاڵت خۆشدەوێ بۆچی بەو ناڵێی خزم و کەسێکی خۆیت بۆ بدۆزێتەوە، پێم وابێ ئەو لەم بابەتانە شارەزایە.

+ تۆش فێری ڕابواردن بووی قیدار ها، کاتی ئەم بابەتانەیە؟

- ئێ وەڵا شۆخی لێ ببە دەرێ، هەر بەڕاستی بەڕاستی شتێکی وا بۆ سەریاڵ پێشنیارکە و منیش گوێ ڕادەدێرم داخوا چ دەڵێ.

سوهەیل خێرا بە دەنگێکی بەرز گوتی: ئادەی سەریاڵ گیان تا ئێرە وەرە.

قیدار: کورە وەڵا خۆ کردیە ڕاستی.

سەریاڵ هات و گوتی: بفەرموو مامۆستا.

سوهەیل بە شۆخیەوە: باشە تۆ بۆچی کەسێکمان بۆ نادۆزیەوە کاکە، من قەرارم داوە ژن بێنم.

سەریاڵ بە سەرسامیەوە: هەر بەڕاستی یان شۆخی دەکەی قوربان؟!

+ بەڕاستی سەریاڵ گیان، ئایا کەسێك ناناسی بۆ من بشێ؟

سەریاڵ دوای تۆزێ تێڕامان: لەڕاستیدا مامۆستا خزمێکمان هەیە ڕەنگە بۆ تۆ زۆر بگونجێ، کچێکی کابان و لێزانە و چێشتی دەستیشی هەر مەپرسە چەند بەلەزەتە، وەلێ ئەوەندەیە لە شارەکەی ئێمەوە دوورن، یانی بۆ تۆ هەر زۆر دوور دەکا.

+ جوانیشە؟

- وەڵاهی کەم و کوڕی نییە، یانی کابان و ئەم چشتانەیە.



قیدار بە دەنگی نزمەوە: کورە لەمە بگەڕێ سوهەیل بەخوا ئەم کوڕە لە جوانی و شت نازانێ، با تووش نەبی لەگەڵیدا. پێی بێژە کەسێکی نزیکی خۆت نزیك.

سوهەیل: دەنا هیچ، مادام ئاوا دووربێ زەحمەتە، کەسێکی دی نییە؟

سەریاڵ: بیری لێ دەکەمەوە مامۆستا بزانم کێ هەیە، لە ئێستادا هزرم بۆ کەس ناچێ.

+ باشە سەریاڵ گیان بڕۆ خەریکی کاری خۆت بە، گەر کەسێکت هاتەوە خەیاڵ پێمی بێژە.

سوهەیل هەر لە دوو دڵیەکەی خۆیدا مایەوە و ناوە ناوەش خاتوو پریاسکە دەهاتە خەیاڵی و یەخەی لێ دەگرت. زۆری نزا دەکرد تاوەکو حەکیمی مەزن یارمەتی بدا و لەم دوو دڵی و ڕاڕاییە دەری بێنێ. سێ ڕۆژەکە تەواو بوون و هێشتا هیچ بڕیارێکی پێ نەدرابوو. دووبارە حەکیم ڕەزوان هاتەوە و پێی گوت: بۆ ئەوە هاتووم هەواڵی کۆتاییم پێ بدەی، ئەوە سێ ڕۆژەکە تەواو بوون و ئەوانیش چاوەڕێی تۆن و جوان نییە ڕایان بگری.

+ ئەوە سێ ڕۆژە بیر دەکەمەوە و نازانم چی بڵێم، زۆر لە بڕیاردان دەترسم حەکیم ڕەزوان زۆر.

- بەخوا جا دەبێ ئیمڕۆ هەر چۆنێ بێ هەواڵ بدەیەوە و شەرمەزارم نەکەی حەکیم سوهەیل.

ئەوان لەنێو گفتوگۆکە دابوون و قیدار هاتە ژووریٚ، هەر لە دەرگاکەدا سەری بۆ سوهەیل لەقاند و وا دیاربوو کە پێی دەگوت ڕازی ببیٚ. لەو دەمەدا سوهەیل خێرا دوو دڵیەکەی خۆی وەلانا وگوتی: زۆر چاکە حەکیم ڕەزوان، پێیان بێژە ڕازیمە و با ڕۆژێك دابنێین مارەی بکەین.

ئەو دەمەی ڕەزوانی حەکیم هەواڵەکەی وەرگرت ڕۆیشت و هەر لەگەڵ ڕۆیشتنی ئەودا خێرا سوهەیل بە قیداری گوت: ئەوە چی یە ئاوا دێیتە ژووریٚ و سەر دەلەقێنی، کورە من لەگەڵ سەر لەقاندنی تۆ گوتم ڕازیمە، دوایی شتێك بیٚ یەخەت دەگرم ها.

- خەمت نەبیٚ حەکیم گیان، دەربارەی ئەوان لە چەند جنۆکەیەکی هاوڕێم پرسیوە و چوونەتە ماڵیان و چاودێریان کردوون، کەسانی باش و دیندارن و لێیان بێخەم بە.

چەند ڕۆژێك دواتر شەوی مارەییەکە هاتە پێشیٚ و قەراربوو بۆ بەیانی خاتوو مەنسا مارە ببڕن، لیٚ دوو دڵیەکەی سوهەیل هەر درێژەی دەکێشا. ئەو شەوە هەواڵەکەی بە سەریاڵ و ئاڕتین دا و ئەوانیش زۆر کەیف سازبوون بە ژن هێنانی مامۆستاکەیان، لەو دەمەدا سەریاڵ ڕووی لە ئاڕتین کرد و بە شۆخیەوە گوتی: ئەها ئاڕتین مامۆستاش ژن دێنیٚ، ئیدی لەمەودوا ئاگای لە ئێمە نامێنیٚ و وەکو جاران شتمان بۆ ناکڕیٚ و پشت گویٚ دەخرێین.

سوهەیل خێرا هاتە دەنگ: هیچ کەسێ نییە بتوانێ وابکا ئاگام لە ئێوە نەمێنێ، ئەو چەند ڕۆژە لەگەڵ ئەو هەموو دوو دڵی و مژومۆرەییەدا[1] بۆ خولەکێکیش ئاگام لێتان نەبڕاوە براکانم. هیچ مرۆڤێ ناتوانێ برای بچووکی خۆی فەرامۆش بکا. بەڵێ سوهەیل تەنانەت لە مژووڵترین و خراپترین ساتیشدا نەیدەتوانی بۆ تاوێك ئەم دووانە پشتگوێ بخا و هەر دەبوایە زانیبای کە چیان خواردووە و لە چ بارودۆخێك دان.

ئەو شەوە بۆ تاوێك خۆی لە گەنجەکان تەنها کرد و لە حەوشەکە ڕوونیشت. لەپڕدا کاك جەمشید بەرامبەری هات و سڵاوی لێکرد. سوهەیل سەراسیمە بوو بەم دیمەنە، چون هیچ کاتێ کاك جەمشیدی بەم شەوە نەدیوە لە حیکمەتخانەکەی، بۆیە خێرا گوتی:

+ خێرە کاك جەمشید، چۆنە بەم شەوە هاتووی؟

- هەواڵێکم بیستووە حەکیم سوهەیل، ئایا ڕاستە قەرارە بەیانی ژن مارەکەی؟

+ بەڵێ، وەلێ کێ ئەم هەواڵەی پێدای، خۆ جارێ بە کەسم نەگوتووە؟!

- واز لەوە بێنە، پێم بڵێ ئەوە کێ یە نیشانت کردووە؟ گلەیی بە ئێمە نەگوتنیش لەملا دابنێ.

---

(١) مژومۆرە: مەشغوڵبوون، پەشۆکاوی

+ خێزانێکی زۆر باشن، حەکیمێکی هاوڕێم بۆی دۆزیومەتەوە.

- باشە تۆ پێشووتر هیچ کەست لەدڵ نەبوو؟

+ سەردەمێك با، وەلێ ئەو چشتانە ڕۆیشتن ئیدی کاك جەمشید.

- عیشق ناڕوا سوهەیل عیشق ناڕوا، تۆ حەکیمی حەکیم، تۆزێ لۆژیکیانە بدوێ.

سوهەیل ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی: ئیدی ئەمە دونیایە و هەمیشە بە دڵی ئێمە نییە، چی بکەین کاك جەمشید.

- لە ژیان ماوە؟

+ بەڵێ ماوە، وەلێ ئێستا ئەو لەنێو ژینی خۆی دایە و پیرۆزی هاوسەرەکەی بێ.

- چۆن ئاوا بە ئاسانی دەست لە کەسێك بەردەدەی کە پێشووتر خۆشت ویستووە؟! بەڕاستی من سەیرم پێت دێ حەکیم سوهەیل! چەشنی کەسێ ڕەفتار دەکەی کە هیچ خوێنەواری نەبێ. پێم بێژە ئەو کەسە کێ بوو؟ ئایا من دەمناسی؟

+ تکایە کاك جەمشید، ئەمە چ قسەیەکە دەیکەن! بۆ گەر قەرار نەبێ واز بێنم ئەی دەتەوێ چی بکەم لەگەڵ ئافرەتێکی خێزاندارداِ؟!

- پێم بێژە ئەوەیانت بە خۆشەویستی هێنا؟ پێشووتر بینیبووت و خۆشت دەویست؟



+ نەخێر هەرگیز نەمبینی بوو، وەکو گوتم حەکیمێکی هاوڕێم بۆی پێشنیار کردم.

- هەڵەی برا هەڵەی، کوڕە تۆ چۆن دەتوانی ژیان لەگەڵ کەسێ بکەی کە پێشووتر خۆشت نەویستبێ، من ئەو هەڵەیەم کرد تۆ نەیکەیەوە برا نەیکەیەوە. من کاتی خۆی کەسێکم دەویست و لەبەر ماڵێ ترسام و دەستم لێی هەڵگرت، ئێستا هەموو ژینم پەشیمانیە و ڕۆژ نییە لەگەڵ خێزانم شەڕ و هەرامان نەبێ. نا نا هەرگیز نەکەی بەبێ خۆشەویستی ژن بێنی، ژیانت لێ دەبێ بە ژەقنەمووت حەکیم بەخوا دەبێ بە ژەقنەمووت.

+ باشە ئەی بەڕای تۆ دەبێ من چی بکەم؟ دە ڕێگایەکم بۆ دابنێ، من بەیانی مارەی دەکەم مارە.

- جارێ تۆ پێم بڵێ ئەوەی پێشووتر کێ بوو، دەمناسی یان نا؟

+ زەحمەت بیناسی، ناوی پریاسکە بوو، دانیشتووی شاهێن نەبوون.

- پریاسکەی کچی مالیکت مەبەستە؟ ئەوەی باوکی چاوێکی نابینایە؟

+ بەڵێ بەڵێ ئەوە چۆنت زانی! بەڕاستی سەیرە کاك جەمشید! باشە چۆنت باوکی ناسی؟!

- هاهاها، تۆ هێشتا منت نەناسیوە حەکیم سوهەیل نەتناسیوم، پێم بڵێ کەس هەیە من نەیناسم؟ ئەگەر ئەو بێ کارەکەمان سەری گرت.

+ چۆن سەری گرت! تێناگەم کاك جەمشید؟!

- هەفتەیەك لەمەوبەر کێشەیەکیان بۆ دروست بوو، لە ئاکامدا ئەو کچە تەڵاق درا. ئێستا مالیکی باوکی هێندە غەمبارە بە هەموو چەشنێ پێمان ڕازیە. تۆ هەر ئەمشەو ئەم هاوسەرگیریە ڕەت کەرەوە، من خاتوو پریاسکەت بۆ دێنم و کارەکە لە ئەستۆی من.

+ بەڵام ئەوە زۆر قورسە کاك جەمشید، من هەموو شتێکم لەگەڵیاندا بڕاندۆتەوە و خشڵ و جل و شتیشمان بۆ کڕیوە و هەر هێندەی ماوە کە بەیانی مارەی بکەین. گەر من ئێستا پێیان بێژم نامەوێ دەزانی چەندە شەرمەزار دەبم، هەر ئابڕووم دەچێ.

- نەخێر حەکیم گیان نەخێر، کارەکە هێندە سەختیش نییە، دوو قسەیە و تەواو، چی دەڵێن با بیڵێن، زێڕەکەش بۆ خۆی و من پارەکەیت دەدەمەوە، گرنگ ئەوەیە تۆ بە خۆشەویستەکەت دەگەی حەکیم سوهەیل، لەوە گرنگتر چ شتێك هەیە؟

+ ئاخر بەڕاستی ئەوە سەختە، من قەرارم بەوان داوە.

- هێندە ترسنۆك و کەنەفت[١] مەبە، لە ژیانمدا حەکیمی وەك تۆ ترسنۆکم نەدیوە. دەتهەوێ وەك من تا ماوی بە پەشیمانی ژیان بەڕێ بکەی؟ گەر کەسێکت خۆشنەویست مەیهێنە حەکیم مەیهێنە. هەر ئەمشەو یاخود بەیانی هەواڵیان بۆ بنێرە کە ئەم کچەم ناوێ و ڕێك نەکەوت، یاخود گەر پێت خۆشە بەیانی مارەی بکە و ماوەیەکی دی بەر لە گواستنەوە بڵێ نەگونجاین و تەڵاقی بدە. من هەرگیز ڕازی نییم تۆ ئەم کچە بێنی لەکاتێکدا خۆشت ناوێ. بڕۆ بیرێکی لێ بکەرەوە و بەزوویی کارەکە ئەنجام بدە و گوێ بە لۆمەی کەسیش مەدە، ژیان ژیانی خۆتە نەك ئەوانی دی. لەگەڵ ئەم قسەیەدا کاك جەمشید ڕۆیشت و سوهەیلیش دوو دڵیەکەی هێندە زۆر بوو بوو خەریك بوو دڵی لە سینەی دەهاتە دەرێ و هەنجن بە هەنجن دەبوو. بە پەشۆکاویەوە ڕۆیشتەوە ژوورێ و تەواو ڕەنگی ڕوخساری گۆڕابوو. ئەو دەمەی سەریاڵ مامۆستای بینی خێرا گوتی:

چی بووە مامۆستا زۆر غەمبار و پەشۆکاو دیاری؟

سوهەیل باسەکەی بە تەواوی بۆ سەریاڵ و ئاڕتین وەگێڕا و ئەوانیش دڵگران بوون و نەیان دەزانی چ شتێ بێژنە مامۆستاکەیان. لەنکاودا ئاڕتین گوتی:

---

(١) کەنەفت: زەبوونی و بێ دەسەڵاتی.

دەزانی مامۆستا قسەکانی کاك جەمشیدیش نالۆژیکی نیین، مرۆڤ پێویستە بە خۆشەویستیەوە هاوسەرگیری بکا.

خێرا سەریاڵ لێی وەدەنگ هات: بێدەنگ بە ئارتین، ئەمە کاری ئێمە نییە و مامۆستا خۆی دەیزانێ.

سوهەیلی حەکیم هەرچەندی دەیهێنا و دەیبرد نەیدەزانی چی بکا و سەر و کەللەی تەواو ئێشی گرتبوو. هێندەی لەنێو هزری خۆیدا هێنا و برد کە خەریك بوو مێشکی سەری بپرژێ و بێتە دەرێ. دوو لاوەکەش هەردوو لە بەرامبەر مامۆستادا بە غەمباری ڕوونیشتبوون. لەبەر خۆیەوە دەیگوت ئاخر چۆن ڕووی ئەوەم هەیە کە بڵێم نامەوێ چۆن؟ من قەرارم پێیان داوە، زێڕ و کەلوپەلمان کڕیوە، خەڵکمان تێگەیاندووە، هەمووان چاوەڕێی بەیانین، دەزانی گەر بڵێم نامهەوێ چی ڕوودەدا، وەکو ئەوە وایە گاڵتەم پێ کردبن. نا نا ئەوە هەرگیز لەگەڵ حەکیمایەتی مندا ناگونجێ هەرگیز.

ئەی ئەگەر ویستم و دڵیشم لەسەر پریاسکە مایەوە چی؟ ئاخ کاك جەمشید تخوا کاتی ئەم قسانە بوو، تۆ لەو دەمەدا بۆچی ئەو کچەت هێنامەوە یاد لەکاتێکدا لە یادم چووبوویەوە و وام دەزانی لەنێو ماڵ و حاڵی خۆیەتی، ئاخر بۆچی وادەکەی بۆ!

سوهەیل زۆری بیر کردەوە و سەری تەواو وەژان هاتبوو، بە چەشنێ کە توانای بیرکردنەوەی نەما و خێرا لە حیکمەتخانەکە

چووە دەرێ، بەم شەوە لە دەرگای ماڵی حەکیم خالیدی دا و ئەویش بە پەشۆکاویەوە هاتە دەرێ و گوتی:

چی بووە حەکیم سوهەیل بەم شەوە، هیچ ڕوویداوە؟!

سوهەیل بەسەرهاتەکەی بۆ وەگێڕا و داوای ڕێگا چارەیەکی لێکرد، چون حەکیم خالید مرۆیەکی تەواو شارەزاو ڕۆحی بوو. زیاتر لە کاژێرێك لەماڵی حەکیم خالید ڕوونیشتن تاکو بە تەواوی سوهەیلی ساردکردەوە لەوەی لەم هاوسەرگیریەی ئێستای پەشیمان بێتەوە، ئەم کابرایەی حەکیم سوهەیلی خستۆتە نێو ئەم ڕاڕاییەوە بە خراپەکاری ناو برد و گوتی: هەر کێ بێ کارێکی وای کردبێ مرۆڤێکی خراپەکار بووە و ویستوویەتی هاوسەرگیریەکەت لێ تێك بدا. مادام تۆ دڵنیای لە باشی و چاکی کچە و خێزانەکەی ئەوا هیچ دوو دڵیەکت نەمێنێ و دڵنیابە حەکیمی مەزن یارمەتی دەرت دەبێ. حەکیم سوهەیل گیان... ئەسڵ لە هەموو شتێك مەبەستەکەیەتی. ئێمە وازمان لە مەبەستە سەرەکیەکە هێناوە و بەدوای هۆکارەکانەوەین. دەزانی ئەسڵ لە جل و بەرگ ئەوەیە جەستە و لاشەت داپۆشێ و ئەوە مەبەستە سەرەکیەکەیە، وەلێ ئێمە وازمان لەو مەبەستە سەرەکیە هێناوە و بەدوای جوانی جلەکانەوەین و دەڵێین فلانە جل نەبێ لەبەری ناکەین، ئێمە نەخۆشین نەخۆش. لە خواردندا ئەسڵ وایە خواردنێك بێ تێرت بکا و بتوانی ئەرکەکانی ژیانت جێبەجێ بکەی و برسی و بێتاقەت نەبی، وەلێ ئێمە وازمان لەو ئەسڵ و مەبەستە سەرەکیە



هێناوە و دەڵێین فڵانە خواردن نەبێ نایخۆین و هەمیشە پێویستە خواردنەکانمان بەتام و ڕازاوە بن. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئێمە نەخۆشین و پێویستمان بە چارەسەرە. ئەی لە ژن هێنان دەزانی ئەسڵ و مەبەستی سەرەکی چی یە سوهەیل گیان؟ مەبەستی سەرەکی ئەوەیە من بەهۆی ئەم خێزانەمەوە پارێزراوبم لە گوناهـ و هەردووکمان یەکتری تەواو بکەین و وەچە و نەوەی پاك و سوود بەخش پێشکەشی کۆمەڵگا بکەین. دیسانەوە ئێمە وازمان لەم مەبەستە سەرەکیە هێنا و گوتمان فڵانە ئافرەت نەبێ نامانەوێ. کەواتە پێویستە چارەسەری ئەم نەخۆشیەمان بکەین سوهەیل گیان، پێویستە چارەسەری بکەین.

سوهەیلی حەکیم لەگەڵ ئەم قسانەی حەکیم خالید دا تەواو هاتەوە هۆش خۆی و درەنگی شەو بەرەو حیکمەتخانەکەی گەڕایەوە. هەر لەبەر دەرگادا قیداری بینی بە پەشۆکاویەوە بەرەو ڕووی دەهات و سوهەیل گوتی: چی بووە قیدار، بەم شەوە ئەمستەچاوە[1] دەڵێی شتێکی نوێت لەلایە؟

+ سەواد... سەواد، حەکیم سوهەیل سەواد، ئەم هەتیوە بۆ کوێ ڕۆیی؟

- ئەی هاوار چیت لێ قەوماوە، سەواد کێ یە و هەتیو کێ یە کوڕە خۆ شێت نەبووی!

---

(١) ئەمستەچاو: زۆر تاریك



+ شوکر بۆ حەکیمی مەزن کە تۆ سەلامەتی سوهەیل گیان، خۆ هیچیان لێ نەکردووی برا، پێم بڵێ سەلامەتی؟

- ئەرێ ئەرێ بابە من سەلامەتم، ئەوەی سەلامەت نییە ئەتۆی، دە بێژە چی بووە دڵمت تەقاند؟

+ سەواد، ئەم هەتیوە خۆی خستبوویە سەر شێوەی کاك جەمشید و بەرەو حیکمەتخانەکەی تۆ دەهات، لەبەر دەرگا لەگەڵ چەند هاوڕێیەك ڕێیان لێ گرت، وەلێ شەڕێکی خراپ چێبوو، لە ئاکامدا یەکێ لە هاوڕێکانم بوویە قوربانی و لەبەر ئەم شەڕە ئاگام لەتۆ نەما. پێم بێژە ئەمشەو کاك جەمشید هاتە لات وانییە؟

- بەڵێ هاتە لام، وەلێ لەتۆ ناگەم، سەواد کێ یە کە خۆی خستۆتە سەر شێوەی کاك جەمشید؟ هەر نازانم چی دەڵێی!

+ ئەو جنێکی زۆر ترسناکە حەکیم سوهەیل، هەزاران شوێنکەوتەی هەیە کە کاری بۆ دەکەن و دوژمنی ئێمەن. ئێمە بە هۆکاری دەقە ئاینیەکانەوە کە ئەوان زۆر لێی دەترسن دەتوانین ڕووبەڕوویان ببینەوە، وەلێ ئەوان ژمارەیان زۆر لە ئێمە زیاترە و زۆر جاران شەڕ و کوشتنیش لەنێوانمان ڕوودەدا. تا ئێستا چەند کەس لە خێزان و هاوڕێکانم بە دەستی ئەم سەوادە نەفرەتیە ڕۆیشتوون. ئەوان هەموویان بۆ قیترە کار دەکەن.

- ئەم قیترە نەفرەتیە چۆن مرۆڤایەتی تووشی کێشە کردووە.

+ هەر دەبێ وابکا سوهەیل گیان، چون ئەوان مێملّی[١] مرۆڤن، کاتی خۆی بەر لە دروستکردنی مرۆڤ جنە خراپەکارەکان لەسەر زەویدا خوێنیان دەڕشت و شەڕیان دەکرد، فریشتەکانی خودا هاتن و لەگەڵیاندا جەنگان و پەرتەوازەیان کردن و سنووریان بۆ دانان. قیترە لەکاتی شەڕەکەدا زۆر مناڵ بوو، فریشتەکان لە یەکێك لە شاخەکاندا دەیدۆزنەوە و دەیبەنە ئاسمان و لەوێدا گەورە دەبێ و لەگەڵ فریشتەکان ژیان بەسەر دەبا و بەندایەتی بۆ حەکیمی مەزن دەکا، وەلێ بەداخەوە دواتر کڕنۆش بۆ باوکی مرۆڤایەتی نابا و فەرمانی حەکیمی مەزن دەشکێنێ و دەبێ بەم خراپەکارەی کە ئێستا هەیە. خۆت ئەمە لەمن چاکتر دەزانی سوهەیل گیان، چون حەکیمی، وەلێ ئەمە تەنێ بیرهێنانەوەیە.

- کەواتە ئەو کەسەی ئەم قسە خراپانەی پێ گوتم کاك جەمشید نەبوو، بەڵکو سەواد بوو خۆی خستبوویە سەر وێنەی ئەو؟

+ بەڵێ حەکیم سوهەیل سەواد بوو، من زۆر ترسام شتێکی نەخوازراو ڕووبدا بۆیە وا بە پەشۆکاوی هاتم، پێم بێژە هات چی کرد و چی پێ گوتی؟

- دەیهەویست هاوسەرگیریەکەم لێ تێك بدا و شوکر پێی تێك نەچوو.

---

(١) مێملّ: دوژمن

ئەو شەوە سوهەیلی حەکیم تەواو دەروونی ئارام بوویەوە و زانی ئەمە فێڵێکە لێی کراوە تاوەکو هاوسەرگیریەکەی لێ تێك بدەن. بەیانی لەگەڵ ماڵێ و خزم و کەسەکانی بەرەو ماڵی بووکێ وەڕێ کەوتن و حەکیم خالید خاتوو مەنسای لە سوهەیلی حەکیم مارە بڕی و ئەمە یەکێ بوو لە ڕۆژە خۆشەکانی سوهەیل.

سەریاڵ و ئاڕتینیش بۆ مارەبڕینەکە هاتبوون و لە حەوشەکە ڕاوەستابوون، ئەو دەمەی مارەبڕینەکە کۆتایی هات سەریاڵ سەری بردە ژێر گوێچکەی ئاڕتین و گوتی:

ئیدی زۆر بەکەمی نەبێ مامۆستا نابینینەوە و وەکو جاران ئێمەی لەیاد نامێنێ. هێشتا گوتەکەی تەواو نەکردبوو حەکیم سوهەیل هاتە حەوشەکە و هەردووکی لە باوەش گرتن و ماچی کردن و گوتی: پێم بێژن ئیمڕۆ من هەندێ مژووڵ بووم چیتان خواردووە؟ خۆ برسیتان نییە؟ بچم خواردنتان بۆ بێنم؟

لەگەڵ ئەم قسەیەدا هەردوو زەردەکەنیان هاتێ و زانیان مامۆستاکەیان لەهیچ بارودۆخێکدا ئەوانی بیر ناچێتەوە و هەمیشە لە دڵی دان.

ئەو دەمەی ویستیان بڕۆن و ماڵی بووکێ جێ بێڵن خێرا کاك سەلامی باوکی خاتوو مەنسا بانگی سوهەیلی کرد بۆ ژووری و پێی گوت کە دەمهەوێ چەند شتێکت پێ بێژم.

سوهەیل: بفەرموو مامە گیان.



+ حەکیم سوهەیل گیان، من ئیمڕۆ کچەکەی خۆم پێشکەشی جەنابت کرد و دەزانم لەخۆم چاتر ئاگاداری دەبی، دەمهەوێ خەوێکت بۆ بگێڕمەوە کە مایەی دڵخۆشی هەموومانە. لەڕاستیدا واچاکە کچەکەم بیگێڕێتەوە چونکە ئەو بینیویەتی.

کاك سەلام چوویە دەر و هێندەی پێنەچوو خاتوو مەنسای لەگەڵ خۆیدا هێنا ژووری و گوتی ئادەی کچم بیگێڕەوە.

خاتوو مەنسا دەستی پێکرد: ماوەیەکی کەم بەر لە ئێستا دڵتەنگیەکم بەسەردا هات کە نارەحەت و کەلەلای[1] کردبووم و زۆر بیرم لە نێردراوی مەزن کردەوە. هەر ئەو شەوە کە خەوم لێکەوت بینیم نێردراوی مەزن خۆی و کۆمەڵێك لە هاوەڵەکانی هاتبوونە ماڵمان. من زۆر تامەزرۆ بووم بۆ بینینی و لە پەنجەرەکە بەردەوام دەمڕوانی و دەمبینی کە وەکو چرایەکی زیاد لە ئەندازە بەهێز تەواوی حەوشە و ژووری میوانانی ڕووناك کردبوویەوە. ئەو دەمەی هاتنە دەرێ بۆ ئەوەی بڕۆن، بەرگەم نەگرت و لە ژوورەکەم هاتمە دەرێ و لێی نزیك بوومەوە و بانگی کردم.

لە ژیانمدا نوور و ڕووناکیەکی پڕشنگداری لەم چەشنەم نەدیبوو، جوانی لەم چەشنە هەرگیز لەسەر ڕووی زەویدا بوونی نەبوو. ئێستاش کە دەیگێڕمەوە وا هەست ناکەم ئەمە خەون بووبێ بەڵکو ئەمە ڕاستەقینە بوو. ئای خودایە لەم جوانی و لەم

---

(١) کەلەلا: کەسێکە برینێکی گەورە بەسەر جەستەیەوە بێ.

چرا گەشە! من وەکو کەسێکی سەراسیمە بەرامبەری وەستابووم و هیچم بۆ نەدەگوترا و ئەو بانگی کردم و گوتی: دڵتەنگ مەبە، ماوەیەکی تر کەسێکی ئاواو ئاوا دێتە داوات، هەر ڕێك باسی تۆ و شێوە و ئاکارەکانی تۆی بۆ دەکردم و وەك ئەوەی لەبەرچاوم بێ.

دواتر گوتی ئەو کەسێکە کە پلەی یەکێك لە هاوەڵەکانی منی هەیە.

ئیدی دوای ئەم خەوە چەند ڕۆژان چەشنی مەستێکم لێهاتبوو و بەردەوام دەگریام.

لەگەڵ بیستنی ئەم خەوەدا ئەسرینەکانی سوهەیلی حەکیم خۆیان نەگرت و بەسەر کوڵمەکانیدا جۆگەلەیان بەست و لەبەر خۆیەوە دەیگوت: نا نا من هەرگیز شایەنی ئەوە نییم، وەلێ تۆ گەورەییت نواندووە قوربان، ئەگەرنا بەندەیەکی لاوازی وەکو من چییە تا هاوەڵی جەنابتان بکا. ئەم خەوە هێندە شیرین بوو لە دڵی سوهەیل کە هەموو دوو دڵی و ڕاڕاییەکەی ڕەواندەوە، ئەو شەوە تا توانی سوپاسی حەکیمی مەزنی کرد لەسەر ئەو بەخششەی پێی دراوە و زانی کە خێر و بێر و چاکەی ئەو لە هێنانی خاتوو مەنسادا بووە نەك پریاسکە.

سوهەیلی حەکیم وردە وردە ماڵ و حاڵی دادەنا و بە یارمەتی خزم و کەس و کارەکەی کەلوپەلی بۆ خانووەکەی دەکڕی تاکو بەزوویی خاتوو مەنسا بگوازێتەوە. بەڵێنەکانی کاك جەمشیدیش



هەمووی ناڕاست دەرچوون و هیچ کۆمەکیەکی نەکرد لە پێکهێنانی ماڵ و خێزاندا، هەر هێندەی بە سوهەیل دەگوت کە پەلە نەکا لە گواستنەوە. ئەمەش خێزانەکەی سوهەیلی حەکیمی تووشی بارگرانیەکی زۆر کردبوو، چون ئەوان چاوەنووڕی ئەوەبوون کاك جەمشید یارمەتیەکی باش پێشکەش بکا، وەلێ ئەو بە چەشنێ خۆی لە بابەتەکە لادابوو دەتگوت هەر ئاگاداریش نییە. تاکە شت کە سوهەیلی زۆر غەمبار کردبوو جیابوونەوە بوو لە سەریاڵ و ئارتین، دڵی یەکجار زۆر پێیانەوە بوو. دەیگوت ئەگەر خاتوو مەنسا بگوازمەوە ئیدی لە سەریاڵ و ئارتین دادەبڕێم و وەکو جاران کاتم بۆیان نامێنێ. سەرەڕای ئەوەش چیدی ناتوانین بەیەکەوە لە ناندینەکە خواردن ئامادە بکەین. ناتوانم ئیدی ڕۆژ و شەو لەلایان بم و ئاگاداریان بم.

باشە کێ پێش نیوەڕۆ بە سەریاڵ بڵێ هەڵسە خواردن چێکە؟ خۆ ئەو وا ڕاهاتبوو تا پێم نەگوتبا هەڵنەدەستا. ئەی شەوان کێ پێی بێژێ بخەوە کاتی خەوتنتە، بەیانیان کێ خەبەری بکاتەوە؟ خۆ هەموو ڕۆژ من خەبەرم کردۆتەوە. ئیدی چۆن وەکو یەك خێزان لەگەڵ یەکدی بین و شەوان هەتا دەمی خەو شۆخی و گفتوگۆ بکەین؟ باشە کێ درەنگانی شەو هۆنراوەکانی نالی و مەحویم بۆ بخوێنێتەوە؟ ئەو دەمانەی لێفەکە لەسەریان لادەچێ کێ پێیان دا بداتەوە؟ ئێمە ڕاهاتووین هەر لەگەڵ یەکدی بین و لە یەك شوێندا بخەوین و بمێنینەوە. یانی لەمەودوا تەنها بۆ وانە



وتنەوە دەتوانم بێم بۆ لایان و کاتەکانی دی دەبێ بچمەوە ماڵی خۆم؟ زۆر سەختە، ئەمە بۆ ئەوان و بۆ منیش سەختە.

دەترسم مژووڵ بم و نەتوانم ئەو گرنگیەی جارانیان پێ بدەم. ئاخر چۆن بتوانم شەوان جێیان بێڵم و ئاگاداریان نەبم؟ چۆن دەکرێ نەزانم چیان خواردووە و کەی نوستوون؟

سەریاڵ و ئاڕتینیش غەمبار ببوون کە مامۆستا ئیدی دەچێتە ماڵی خۆی و ناتوانێ وەکو جاران لەگەڵیان بێ، وەلێ غەمباری مامۆستا زۆر لە هی وان پتر بوو. هەر دەتگوت بە تەواوی وا دوو لاوەکە جێ دێڵێ و ئیدی نایان بینێتەوە و پەڕەوازە[1] دەبێ، لەکاتێکدا ماڵەکەی ئەو و حیکمەتخانەکە تەنێ دیوارێکیان بەین بوو. هەر لەبەر ئەم بابەتە بوو حەکیم سوهەیل هێندێ جار پەلەی لە دانانی ماڵ نەدەکرد و نەیدەویست هێندە زوو لەوان جودابێتەوە.

هێندێ جار بیری لەوە دەکردەوە کە ئەم دوو لاوە چەند ڕۆژێك دەڕۆنەوە ئاوا بێتاقەت دەبم بۆیان و خۆ ناگرم، ئەی گەر ڕۆژێ بەتەواوی ئۆغریان کرد دەبێ ئەو دەم لە چ حاڵێکدابم؟

خێرا ئەمەی لە هزری خۆی لادەبرد و نەیدەتوانی پتر خەیاڵی لەسەر چڕ بکاتەوە.

---

(١) پەڕەوازە: گیاندارێکە لە شوێنی خۆی دوورکەوتبێتەوە، ئاوارە.



سەریاڵیش بە ئەنقەست جار و بار پێی دەگوت: مامۆستا ڕۆژێك دێ ئێمە دەڕۆین و بەسەردان دێینەوە لای جەنابت و ئیدی تۆ تەنیا دەمێنیەوە. بەم قسانە خێرا سوهەیل دڵی پڕ دەبوو، یەکسەر بابەتەکەی پێ دەگۆڕی و نەیدەتوانی وێنای ئەو ڕۆژە بکا.

سوهەیلی حەکیم لە ماڵ دانان لێ بوویەوە و خاتوو مەنسای گواستەوە. ئیدی نەیدەتوانی وەکو جاران لەلای گەنجەکان بمێنێتەوە و چێشتیان لەگەڵ ساز بکا و پێکەوە بیخۆن، وەلێ ئەو دەمانەی خواردنێکی خۆشیان چێ کردبا ئەوانی بانگ دەکردە ماڵێ و بەیەکەوە چەشنی جاران دادەنیشتنەوە. هەموو درەنگانی شەویش دەچوویە حیکمەتخانەکە و لەگەڵ خۆیدا سەریاڵی دێنا ماڵێ و شیعرەکانی نالی و مەحوی پێ دەخوێندەوە تاوەکو خەوی دەهات، ئینجا دەیناردەوە حیکمەتخانە و دەیگوت زوو بخەوە.

زۆربەی شەوان کە ئەم دوو لاوەی دێنا ماڵێ کێك و حەلوای بۆ ساز دەکردن و وای نیشان دەدا کە هێشتا لەگەڵ ئەوان دەژی و هەنگاوێ لێیان دوور نەکەوتۆتەوە.

ئەو دەمانەی سوهەیلی حەکیم لەماڵ نەبوو سەریاڵ ئاگای لەماڵی مامۆستا دەبوو، ئەگەر خێزانەکەی کارێکی هەبوایە بۆی ئەنجام دەدا و هەمیشە بە مامۆستای دەگوت من نیگابانی ماڵەکەتم و ئەگەر لێرەش نەبووی بێخەم بە.

هێندێ جاریش وا ڕێدەکەوت قوتابیەکان هەموو دەچوونەوە، سەریاڵ یاخود ئاڕتین بە تەنیا لە حیکمەتخانە دەمایەوە. ئەمەش وای لە سوهەیل دەکرد ئەو شەوە بیهێنێتە ماڵێ و نەهێڵێ بە تەنیا لە حیکمەتخانە بخەوێ، چون دەیزانی ئەوان لە تەنیایی دەترسن.

ئیدی ئەم لاوانە هەرکاتێ ویستبایان دەیانتوانی بڕۆنە ماڵی مامۆستا و شەویش لەوێدا بمێننەوە، بە تایبەتی سەریاڵ کە هێندە ئازیز بوو لەلای سوهەیل هەمیشە پێی دەگوت تۆ کوڕێکی ئەو ماڵەی و یەکێکی لە ئەندامانی خێزانەکەمان.

باخچەیەك هەبوو زۆر لە حیکمەتخانەکە دوور نەبوو، سوهەیل بەر لە هاوسەرگیری گەلێ جار دوو لاوەکەی بۆ ئەوێ دەبرد، وەلێ دوای پێك هێنانی خێزان نەیدەتوانی بەم چەشنەی جاران لەگەڵیان بچێ. هێندێ جار لاوەکان دەهاتنە لای حەکیم سوهەیل و داوای مۆڵەتیان لێ دەکرد تاکو بچن بۆ ئەوێ، ئەویش مۆڵەتی دەدان و بەبێ زانینی ئەوان قیداری لەگەڵ دەناردن تاکو ئاگاداریان بێ و لە گەیشتن و هاتنەوەیان سوهەیل هۆشیار بکاتەوە. بازێ جاریش دەیگوتە قیدار بزانە بە کام ڕێدا دەڕۆن، سوهەیل بە ڕێگاکەی دیکە دا دەڕۆیشت و بەر لەوان لە جێگاکە ئامادەبوو، ئەمەش دوو لاوەکەی سەراسیمە دەکرد. تەنانەت ئەو دەمانەی دەگەڕانەوە شارەکەیان قیداری ڕادەسپارد تاکو هەواڵی پێ بدا لە گەیشتنی ئەوان و ئاگای لێیان بێ. هەندێ کاتیش خۆی بە دڵ بازێ شتی دەربارەیان دەزانی و ئەگەر حاڵیان خراپ



بوایە دڵی بە توندی لێی دەدا و هەستی پێ دەکردن. سوهەیل لە دووری سەدان و هەزاران میلەوە دەیتوانی بۆنی سەریاڵی برا بچووکی خۆی بکا، تەنانەت کاتێ لە ماڵێش نەخۆش و نارەحەت بوایە پێی دەزانی. جارێکیان ئەو دەمەی خەریك بوو بەردێکی زل بەسەری سەریاڵدا بکەوێتە خوارێ لە دووری چەندین کیلۆمەترەوە بۆنی کرد و پێی ئاگادار بوو. ئەمەش دەگەڕایەوە بۆ هێزی ئەو عیشقەی کە بە کۆششێکی زۆرەوە لەنێو دڵیدا بنیاتی نابوو.

ماوەیەك بوو سوهەیل چەند قوتابیەکی نوێی وەرگرتبوو، یەکێ لەوان ناوی کەریم بوو، تەمەنی لە سەریاڵ و ئاڕتین گەورەتر بوو، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر زیاتری لەوان خوێندبوو. چونکە خزمی کاك جەمشید بوو سوهەیل نەیتوانی وەری نەگرێ و ڕەتی بکاتەوە.

لەبەر ئەوەی لە وانەکاندا لە سەرەوەی هەموو قوتابیەکان بوو دەبوایە ئەو ببێتە برا گەورەیان و هیچیان لە قسەی دەرنەچن. ئەمەش وایکرد برا گەورایەتی لە سەریاڵ وەربگیرێتەوە. کەریم هەمیشە کێشەی لەگەڵ ئەم دوو گەنجە هەبوو، بەردەوام لەلای حەکیم سوهەیل شکاتی لێ دەکردن کە ئەوان لەکاتی موتاڵا کردن باش ناخوێنن و خۆیان بە گفتوگۆی بێ بەهاوە خەریك دەکەن و شەوانیش زۆر درەنگ دەخەون.

حەکیم سوهەیلیش هەمیشە بە نەرمی کەریمی سارد دەکردەوە و دەیگوت ئەوان برای منن و مادام کاتێ دێنە لای من وانەکانیان ئەزبەر کردووە ئیدی تۆش چاوپۆشیان لێ بکە لە هێندێ کەم و کوڕیدا. ئەوان زۆریان ناز هەڵگیراوە و وەکو قوتابیەکانی تر نیین، وەلێ کەریم ڕۆژ بە ڕۆژ پتر گلەیی لێ دەکردن و زۆری لە دڵ گران بوو کە حەکیم سوهەیل هێندە بایەخی پێ دەدان و شەوان سەریاڵی دەبردە ماڵێ. ئەو لای وابوو کە ئەوان شەو و ڕۆژ دەبێ بخوێنن و مۆڵەتی هیچ کارێکیان پێ نەدرێ.

دوو لاوەکە چون نازێکی زۆریان لەلایەن حەکیمەوە پێ درابوو بەرگەی گلەیی و گازاندەی کەریمیان نەدەگرت و زۆر جاران لێیان دەبوویە کێشە و لێکیان دەقرماند[١] و سوهەیلی حەکیم ساردی دەکردنەوە. کەریم هەموو توانای خۆی خستبوویە گەڕ تاکو بەتەواوی دڵی مامۆستا بەدەست بێنێ و وابکا یاساکان لەسەر سەریاڵ و ئاڕتین توند بین و نەتوانن چەشنی جاران بە دڵی خۆیان بێن و بچن، وەلێ خۆشەویستی مامۆستا بۆ دوو لاوەکە هەمیشە ڕیسەکەی کەریمی دەکردەوە خوری.

قوتابیەکان زۆر ببوون و کۆنتڕۆڵ کردنیان لە جاران زەحمەت تر بوو، جگە لەمەش چەند دانەیەکیان باشیان نەدەخوێند و وانەکانیان بە تەواوی ئەزبەر نەدەکرد. کەریمیش بەردەوام

---

(١) قرماندن: خوڕین لە یەکێك بە دەنگی بەرز.



سەری دەخستە سەر حەکیم کە ئاوا بڕوا هەموو چاو لە یەکدی دەکەن و ناخوێنن، پێویستە بە چەشنێ لەسەریان گران بکرێ کە ماوەی شۆخی و گاڵتە و گەپیان نەمێنێ. هەموو ئەم هۆکارانە وای لە سوهەیل کرد بە ناچاری یاساکان لەسەر قوتابیەکانی قورس بکا و ماوەی پشوویان کەمتر بێتەوە، لەکاتی پێداچوونەوە و ئەزبەر کردنی وانەکانیش کەریم لەلایان بێ و ماوەی ئەوەیان نەبێ خۆ بە چشتی دی مژووڵ بکەن. سەریاڵ و ئارتین بەرگەی ئەم زەحمەتیەیان نەدەگرت و هەمیشە دەچوونە ماڵی مامۆستا و شکاتیان لە کەریم دەکرد کە کاریان زۆر پێ دەکا و ماوەی پشوودانیان لە جاران زۆر کەمتر بۆتەوە. حەکیم سوهەیل هەمیشە بە قسەی نەرم دوو لاوەکەی دەناردەوە و پێی دەگوتن ئەم توندیە لە بەرژەوەندی ئێوەیە و دەمەوێ بەیانی حەکیمی باشتان لێ دەربچێ و ئومێدێکی زۆرم پێتانە. ئەگەر مرۆڤ زەحمەتی نەکێشێ هەرگیز نابێ بە کەسێکی گەورە. کاتێك زانیتان زۆر بێزاربوون مۆڵەت لە کەریم وەرگرن و وەرنە ماڵی من تاوەکو بێزاریەکەتان دەڕەوێتەوە، چون ماڵی من ماڵی ئێوەشە.

هێندێ جاریش لەبەر خاتری ئەوان یاساکانی تۆزێ سووك دەکردنەوە.

ئارتین هەمیشە بە قسەکانی مامۆستا سارد دەبوویەوە، وەلێ سەریاڵ چون پتر نازی پێ درابوو بەرگەی نەدەگرت و زۆر جاران لەگەڵ مامۆستادا دەیکردە دەمە دەمێ و پێدا دەچوو،

ئەمەش هێندێ جار حەکیم سوهەیلی تووڕە و نارەحەت دەکرد. وای لێهاتبوو دەبوایە دوو ڕۆژ جارێك مامۆستا و سەریاڵ لەگەڵ یەکدیدا پێدا بچن و یەکتری نیگەران بکەن. بازێ جار مامۆستا هێندە تووڕە و بێتاقەت دەبوو کە ڕۆژێکی تەواو جگە لە پێگوتنی وانەکان سەریاڵی نەدەدواند. ئەمە لە کاتێکدا هێندە خەمی دەخوارد سینەی بەم بابەتە دەکوڵا و پڕی خوێن دەبوو، وەلێ بۆ بەرژەوەندی ئەو وای دەکرد و دەیگوت پێویستە بزانێ کارێکی هەڵەی کردووە و من لە بەرژەوەندی ئەوان یاساکانم گۆڕیوە نەك لە بەرژەوەندی خۆم.

هەردووکیان لە ڕۆژێك پتر نەیان دەتوانی خۆ بگرن، خێرا بۆ بەیانی سەریاڵ دەهات و داوای لێبوردنی لە مامۆستا دەکرد و سوهەیلیش نێوچاوانی ماچ دەکرد و تێی دەگەیاند کە هەر شتێکی کردبێ بە چاکەی ئەوان کۆتایی دێ.

هەموو جارێ کە دەمە دەمێ لە نێوان مامۆستا و سەریاڵ دا چێ دەبوو قیدار شێت و هار دەبوو، خێرا دەهاتە لای مامۆستا و یەك دونیا گلەیی دەکرد کە بۆچی دێڵێ قوتابیەك ئاوا قسەی لەگەڵ بکا و لێی تووڕە نابێ و هێندە نەرم و ملکەچە بۆی، وەلێ سوهەیل زوو ساردی دەکردەوە. ڕۆژێك ئەو دەمەی سوهەیل بە تەنیا لە ماڵێ ڕوونیشتبوو قیدار بە پەشۆکاوی لێی وەژووری کەوت و گوتی: حەکیم گیان دەزانی دووبارە ئەم سەوادە فیتنەیەکی لەژێر سەردایە.



+ فیتنەی چی قیدار، چی بووە؟

- ماوەیەکە کۆمەڵێك جنی بێ باوەڕی ڕاسپاردووە بۆ ئەوەی لەگەڵ سەریاڵدا ناتەبایی و ڕق بکەوێتە نێوانتان.

کەمێك بەر لە ئێستا بیستم بە سەربازێکی خۆی دەگوت بە چەشنێ ئەو دووانە بکە دوژمنی یەك تا ڕۆژی پەسڵان ئاشت نەبنەوە. ئاگاداری خۆتان بن حەکیم سوهەیل گیان، ئەم سەوادە هەزاران فیتنە و ئاژاوەی وای لەژێر سەردایە کە تۆ بە خەیاڵیشت دا گوزەر ناکا. بە سەریاڵیش بڵێ ئاگاداری خۆی بێ و هێندە دەمە دەمێ نەکا لەسەر شتی بێ بەها، دڵنیابە من ئەویشم خۆشدەوێ و ڕقم لێی نییە، وەلێ کە تۆ ئازار دەدا ئاوەها دەشڵەژێم.

+ خەمت نەبێ قیدار گیان، دڵنیابە زۆرترین زویر بوونی من و سەریاڵ تەنێ شەو و ڕۆژێکە، لەوە بترازێ نە من بەرگە دەگرم و نە ئەویش، بۆیە ئەم قڕاکانە[1] چی دەکەن با بیکەن.

- من ئەوەی لەسەرم بوو پێم گوتی، جا کەیفی خۆتە برا، ئەگەر زانیم شتێکی نوێیان لەژێر سەردایە ئاگادارت دەکەمەوە.

سوهەیلی حەکیم قسەکانی قیداری بەهەند وەرنەگرت و زۆری پێنەچوو پەیدا بوویەوە.

+ چی بوو قیدار، چۆنە ئاوا زوو هاتیەوە؟!

---

(١) قڕاك: قەلەڕەش

- لە پلان دان سوهەیل لە پلان دان، پێویستە ئەم ماوەیە خۆت تۆکمەتر بکەی لە پەرستشەکانت، سەریاڵیش هەروەها.

+ ئێ چی بووە برا، بە ڕوونی قسە بکە؟

- ئەوان لە هەوڵی ئەوەدان بچنە جەستەی سەریاڵ و لەم ڕێگایەوە ئازاری پێ بگەیەنن و بەم چەشنەش کۆتایی بە نێوانتان بێنن.

سوهەیل بە پەشۆکاویەوە: جا دەتوانن ئەوە بکەن قیدار؟

- بەڵێ ئەگەری هەیە بتوانن ئازاری بدەن، ئەوان دوای هەوڵدانێکی زۆر نەیانتوانی بچنە جەستەی تۆوە، وەلێ لە سەریاڵ زۆر دەترسم، چون ئەو وەکو تۆ بەهێز نییە و ئەگەری ڕوودانی ئەم کارە هەیە.

سوهەیل بەم هەواڵە تۆزێ ڕەنگی گۆڕا و خێرا گوتی: چارەسەر چی یە قیدار گیان؟ چی بکەین لەم حاڵەتە؟

- پێویستە ئەم ماوەیە سەریاڵ پەرستشەکانی بکاتە دوو هێندە.

+ وەلێ چۆن ڕازی بکەم کە پەرستشەکانی بکاتە دوو هێندە؟ بێگومان هۆکارەکەیم لێ دەپرسێ، منیش ناتوانم پێی بڵێم و بیترسێنم.



- باشە من مامۆستایەکم هەیە زۆر شارەزایە لەم بابەتانە، دەچم پرسی پێ دەکەم و دێمەوە.

قیدار نزیکەی نیو کاژێر ون بوو، سوهەیل لەم ماوەیەدا چرکە چرکەی دەژمارد تاوەکو گەڕایەوە. ئەو دەمەی هاتەوە خێرا گوتی: چیت کرد قیدار گیان پێم بێژە؟ ئاخر ئەم هەتیوانە بۆچی دەیانهەوێ ئێمە لێك بکەن؟ خراپەی کێمان هەیە!

- های هوو سوهەیل، ئەو دەمەی خراپەت نییە جا ئەوان دوژمنتن، ئەوان بە ملیۆنان هاوسەر و هاوڕێیان لێك کردوون، دەڵێی تازە شارەزایان دەبی. ئەوان نایانەوێ ئەو لاوانە لەلای تۆ بن و پێ بگەن، جارێ هەر تۆ دوژمنی سەرسەختی ئەوانی.

+ باشە بەهەر حاڵ چی ڕوویدا؟ بە مامۆستاکەت گوت؟

- بەڵێ، گوتی ئەو ماوەیە تا دەتوانێ ڕێگری بکا لە دەرچوونی سەریاڵ و باش چاودێری بکا، نەهێڵێ بچێتە هیچ جێگایەك و با هەر لە حیکمەتخانە بێ، چون حیکمەتخانە شوێنێکی پیرۆزە و ئەوان کەمتر دەتوانن لەوێدا کاری خۆیان بکەن و ئەو کوڕەش وەك تۆ بەهێز نییە. جگە لەمەش هێندێ ویردی پێدام کە پێویستە دوو یان سێ شەوان تا بەیانی لەسەر سەریاڵی بخوێنی و ئەمە دەبێتە مەتاڵێکی[١] پتەو بۆی.

---

(١) مەتاڵ: قەڵغان

+ بەڵام چۆن تا بەیانی بیخوێنم، مەگەر بیهێنمە ماڵی خۆم!

- نازانم پێکی بێنە بۆخۆت، چەند ڕۆژێك خێزانت بنێرەوە ماڵی باوکی.

سوهەیلی حەکیم تا ئێستا بۆخۆی لە جنەکان نەترسابوو، وەلێ ئەو دەمەی باسی سەریاڵ هاتە گۆڕێ ترسێکی زۆری لێ نیشت کە ئازاری پێ بگەیەنن. سەریاڵیش ئەو ماوەیە زوو زوو لە حیکمەتخانە دڵی توند دەبوو، ماوەیەك بوو چەند ماڵە خزمێکی هاتبوونە شاهێن و ناوە ناوە داوای لە حەکیم سوهەیل دەکرد کە مۆڵەتی بدا بچێتە ماڵە خزمانی و شەویش لەوێ بمێنێتەوە. حەکیم سوهەیل بە هەموو پێداگریەکەوە ڕێگری لە چوونە دەرەوەی سەریاڵ دەکرد و زۆر ناچار نەبایە مۆڵەتی نەدەدا، ئەگەر مۆڵەتیشی دابایە خێرا قیداری لەگەڵ ڕەوانە دەکرد. ئەم مۆڵەت نەدانە بەشێوەیەك سەریاڵی بێزار کردبوو کە هەمیشە لەگەڵ مامۆستادا دەبوویە دەمەقاڵەی و هەندێك جار بە لەیەك زویربوون کۆتایی دەهات و بگرە شەوانیش نەدەچوویە ماڵی مامۆستا بۆ شیعر گوتن. تەنانەت وای لێهاتبوو کە سەریاڵ بیر لە ڕۆیشتن بکاتەوە. هەمیشە دەیگوت مامۆستا تەنێ بۆ من ئاوایە و مۆڵەتی هەموو قوتابیەکانی تر دەدا. ئەم زویر بوونانە بە چەشنێ دڵی سوهەیلیان پارچە پارچە دەکرد کە هێندێ جار خۆشی نەیدەزانی چۆن وانەکان دەڵێتەوە. زۆر جاران بە نەخۆشی و بێهێزی لەماڵێدا دەکەوت و دڵی سەریاڵی پێ ڕاگیر نەدەکرا،

تەنانەت بازێ جار خێزانەکەشی کە ئاوا سوهەیلی بە ڕەنگ زەردی و بێتاقەتی دەبینی بەرگەی نەدەگرت و ئەسرین لە چاوانی دەتکا. گلەییەکانی کاك جەمشیدیش لەملاوە بوەستێ، ماوەیەك بوو ڕۆژ نەبوو نێتە حیکمەتخانە و دەیان گلەیی و گازاندە نەکا، هەر بە ئەنقەست بەسەر حیکمەتخانەکەدا دەگەڕا و بیانووی پێ دەگرتن تەنێ بۆ ئەوەی سوهەیل ناڕەحەت بکا، وەکو کۆیلەیەك لەوی دەڕوانی و پێی وابوو دەبێ هەمیشە لە حیکمەتخانە و نێو میوانەکانی ئەوبێ و بۆ ساتێ دوورنەکەوێتەوە، تەنانەت بۆ چوونە ماڵە خزمانیشی دەبوایە بەبێ مۆڵەتی کاك جەمشید نەچێتە دەر و ژیانی لێ کردبوویە ژەقنەمووت، لێ سوهەیل لەبەر خاتری قوتابییەکانی بەرگەی هەموو ئەوانەی دەگرت و دەیخواردەوە. دەزانی تا منداڵ لە خەمخۆری و دڵسۆزی باوکی تێدەگا زەمەنێکی دەوێ. سوهەیل خۆی لە شوێنی باوك و برای سەریاڵ دانابوو، زۆر جاران ڕێگری باوك لە منداڵەکەی بە قازانجی ئەو منداڵە دەشکێتەوە، وەلێ تا منداڵ لەوە دەگا سەری باوك مووی سپی لێ دەڕوێ. ئاخر ئەو دەمەی باوك دەڵێتە منداڵەکەی لەسەر لێواری ئەم شاخە مەوەستە بەردەبیەوە، منداڵەکە هەمیشە خەریکی ئەوەیە بۆی بسەلمێنێ کە بەرنابێتەوە. بەڵێ ڕۆڵە ڕاستە هێزت هەیە و بە ئەگەرێکی زۆر بەرنابیەوە، وەلێ دڵی دایك و باوك ئەمە ناڵێ، تۆ واز لە سەلماندن و بەڵگەکانت بێنە و دڵی ئەوان ڕاگرە، چون ئەوان مرۆڤانێکن دووبارە بوونەوەیان نییە. ڕۆژێك

کە منداڵت هەبوو دەزانی، دڵنیام ئەو ڕۆژە دەزانی. هەمیشە ئاڕتین کە دەیبینی ئەم دووانە ئاوا سارد بوونە لەگەڵ یەکدی و جگە لە وانەکە نەبێ چ قسەی دی لەگەڵ یەکتری ناکەن غەم دایدەگرت و خێرا دەچوویە لای مامۆستا و تکای لێ دەکرد وەکو جارانیان لێ بێتەوە. ئەو ڕۆژە سوهەیل کە لە سەریاڵ زۆر زویر بوو بە غەمباری ڕووی لە دەرێ کرد و خۆشی نەیدەزانی بۆ کوێ دەڕوا، هەتا ماندوو بوو ڕۆیی و ناوە ناوەش فرمێسکی تەڕی دەڕژاندن و لەگەڵ خەمی سەریاڵدا خەمە سەختەکانی ڕابردووشی زیندوو دەبوونەوە. ئەو دەمەی ماندوو بوو لەبەردەم باغێکدا لە شوێنی خۆیدا ڕاکشا و هێندەی زانی پیرە پیاوێك هات لە ئاتەکیدا ڕوونیشت و سوهەیل لەبەر ڕێزی پیرەکە هەڵسایەوە.

+ سەلامت لێبێ بەندەی حەکیمی مەزن، چۆنە ئاوا بە دڵگرانی لێرە پاڵت داوەتەوە؟

- سەلام لەتۆش بێ مامە گیان، لە ڕاستیدا تۆزێ دڵگران بووم و لێرە پشوویەکم دا.

+ ئای هەی، ئەمە دونیایە کاکە، دەنا حەیفە لاوێکی وەکو تۆ دڵگران بکرێ و لێرە لەسەر ئەم خۆڵە بکەوێ. ئەوە حەتمەن ئەو کەسەی دڵگرانیشی کردووی هەر نزیك و ئازیزێکی خۆتە. من دەزانم کاکە دەزانم، چون منیش لەلایەن ئازیزانمەوە ئازار دراوم بۆیە چاکت لێ تێدەگەم.

- هەر دەڵێی لەنێو دڵی منداى مامە گیان، وێدەچێ ئەزموونێكی باشت هەبێ.

+ بێگومان ڕۆڵە، ئەم مووانەم لەخۆڕا سپی نەكردوون. ئێستا لە جێگای پەرستش گەڕامەوە و لێرە تۆم بینی و گوتم با سڵاوێكی لێ بكەم، ئاخر نارەحەت دەبم كە دەبینم گەنجێكی جوانی وەك تۆ غەمبارە. دەتوانی هەندێكیم بۆ باسكەی؟ پێم خۆشە گوێت بۆ ڕادێرم.

- هیچ نییە مامە گیان هیچ نییە، برایەكی خۆمە و كەمێك خەمم لێی خواردووە، ئینشاڵا چارەسەر دەبێ.

پیرە پیاوەكە ئاهێكی هەڵكێشا و گوتی: كاكە زەمانەكە خراپە زەمان، بڕوات هەبێ وای لێهاتووە مرۆڤ ڕێزی دایك و باوكی خۆی لەلا نەماوە، نازانێ ڕێز لە مامۆستاكەی بگرێ. چەندین جار بیستوومە قوتابی جنێو و قسەی نەشیاوی بە مامۆستاكەی خۆی گوتوە.

- ڕاست دەفەرمووی، لەم سەردەمە هەموو شتێ ئەگەری ڕوودانی هەیە.

+ سوێندت بۆ دەخۆم قوتابییەك هەیە قوتابی، تۆزێك سوورەیە، وابزانم چاوی شینە و لەو حیكمەتخانەیەی ئەولاتر دەخوێنێ، نازانم ناوی چی یە و ناوی مامۆستاكەشی چی یە، وەلێ چەند جارێك بەو گوێچكانەی خۆم بیستوومە بە هاوڕێكەی دەگوت

من لەبەر بەرژەوەندی خۆم لەلای مامۆستام دەنا یەك ڕۆژیشی لەلا دانانیشم. هەر هێندەی كارم لێرە تەواوبوو هەر ناشی ناسم، بابە مرۆڤی وا چییە هەر ڕووشی پێ بدەی. جارێكی دیش بیستم دەیگوت مامۆستاكەمان بۆ ئەوە باشە هەر شوانی بكا، ئەو و حیكمەتخانەیان نەگوتوە. ئێ برا تا قوتابی وا هەبێ چۆن دونیامان بەسەردا ناڕووخێ تخوا!

لەگەڵ ئەم قسانەی پیرە پیاوەكەدا سوهەیل ڕەنگی گۆڕا و دڵی بە چەشنێ وەژان كەوت خەریك بوو لە جێگاكەی خۆیدا بترازێ و پارە پارە بێ و بەنێو جەستەیدا پرژ و بڵاو بێتەوە. فرمێسك لە چاوانیدا قەتاری[1] بەست و بەسەر ڕیشە تەنكە ڕەشەكەیدا دڵۆپ دڵۆپ دەهاتە خوارێ. بە غەمبارییەوە ڕووی لە پیرە پیاوەكە كرد و گوتی:

تـــۆ دڵنیای یەكێكی ســـوورەی چاوشـــین بوو؟ ڕێك لەم حیكمەتخانەیەش دەخوێنێ؟ دەترسم لێت تێك چووبێ، چون ئەوەندەی من بزانم ئەو كوڕە مامۆستاكەی خۆی زۆر خۆشدەوێ.

+ قابیلە بەم تەمەنەوە بوختان بۆ خەڵك هەڵبەستم ڕۆڵە! بەڵێ ڕێك ئەو كەسەی گوتم ئاوای گوت. لەم سەردەمەدا بەهیچ كەسێ مەخەڵەتێ كوڕم مەخەڵەتێ، كە لەلاتە ستایشت دەكا و ئەو دەمەی ون بووی بە خراپە لێت دەدوێ.

---

(١) قەتاربەستن: ڕیزبەستن

سوهەیلی حەكیم لەگەڵ پیرە پیاوەكەدا لەم گفتوگۆیە دابوون و نزیك بوو لەوەی دڵی بتەقێ و بەتەواوی شێوە و ڕەنگی بەرەو تێكچوون دەچوو، لەنكاو قیدار هات و بە هەموو هێزیەوە پاڵێكی بە پیرە پیاوەكە نا و بە زەوی دادا. سوهەیل خێرا هەڵسایەوە پێ و ویستی ڕێگری لە قیدار بكا و گوتی: ئەوە چی دەكەی هەتیو، ئەم پیاوە پیرەت بۆ وا خستە زەوی! هەر ئەوەندەی سوهەیل ئاوڕی دایەوە پیرە لە شوێنەكە نەمابوو، هەر دەتگوت زەویەكە لێك بوویەوە و قووتی دا.

قیدار گوتی: تۆ دەزانی لەگەڵ كێ دانیشتووی كاك سوهەیل؟ ئەم نەگریسە دەیەوێ فێڵت لێ بكا و تۆش دەردە دڵی بۆ دەكەی.

سوهەیل بە پەشۆكاویەوە: تێناگەم قیدار! ئەمە چ جۆرە مەخلووقێك بوو ئاوا دیار نەما!

+ ئەمە یەكێكە لە دەستە و بەستەكانی سەواد، ناوی جاڕیلە، خەریك بوو هەڵت خەڵەتێنێ كاكە ئاگاداربە.

- بۆ من چووزانم جاڕیل كێ یە كاكە، پیرە پیاوێك بوو هات لەلام دانیشت، قابیلە دەستی خۆم بۆن كردبێ.

+ خێرا بڕۆوە لای سەریاڵ تا كەسێك نەچۆتە لای ئەویش، هەرچەندە زەحمەت خۆیان بە ئەو نیشان بدەن، وەلێ لەوانەیە وەسوەسەی خراپی بۆ بكەن بڕۆوە باشترە.



قیدار قسەكانی تەواو نەكردبوون خێرا سوهەیل چوویەوە ماڵێ و كەسێكی بەدوای سەریاڵ دا نارد كە پێی بێژێ بچێتە ماڵی مامۆستا. هێندەی نەبرد سەریاڵ بەشەرمەوە هات و سوهەیل لەگەڵ خۆیدا بردیە ژووریٚ و ویستی قسە بكا خێرا سەریاڵ گوتی:

داوای لێبوردن دەكەم مامۆستا، هەموو شتێكم وەلا نایە و هاتووم بڵێم زۆر بمبوورە.

سوهەیل سەیرێكی چاوەكانی كرد و گوتی: بۆ وادەزانی لێت تووڕەم سەریاڵ گیان؟ دەزانی ئارتین هاتبوو دەیگوت مامۆستا تكایە چاك ببنەوە، زۆر لەبەر دەرگاكە قسەی لەگەڵ كردم. گوتم ئارتین گیان تۆ وادەزانی من لێی تووڕەم! سوێند بە حەكیمی مەزن ئێستا هەموو دونیام بدەنێ ڕازی نابم ئەو كوڕە دڕكێك بچێتە پێی. ئەتۆ چی دەڵێی برام، من بەم چەشنە خۆشم دەوێی.

- قوربانت بم مامۆستا، نامەوێ ئازار بچەژی، یان دڵتەنگ بی لەبەر هەر هۆكارێك.

+ خوا نەكا كاكە، من قوربانی تۆ بم، هەمیشە برای گەورە قوربانی دەدا لەپێناو برای بچووكیدا. سەریاڵ گیان... ئازاری ئەوانی دیم لێ دوور مەخەرەوە، بەڵكو هەوڵدە خۆت ئازارم نەدەی. ئەو دەمەی خەمێكم هەیە، یاخود ئازارێك لە دڵم دایە بە بوونی تۆ ئارام دەبمەوە، ئەی ئەگەر تۆ مایەی ئازارەكەم بی چی؟!

- مامۆستا ئەتۆ زۆر خۆشەویستی لەلای من، وەلێ پێم ناخۆشە تۆ هێندە منت خۆشبوێ و بەهۆی منەوە ئازار بچەژی. دەمەوێ بەڕوونی لەگەڵت بدوێم قوربان، هێندێك لەو شەوانەی بانگم دەکەیە ماڵێ تاوەکو شیعرت بۆ بڵێم ماندووم و ڕەنگە نەمەوێ بێم، وەلێ تۆ کارەکە وەکو فەرمانێك لێدەکەی و من ناتوانم کە نێم. تۆ هەمیشە دەڵێی ئێمە هاوڕێین و با وەکو هاوڕێیەك ڕەفتار بکەین، وەلێ هاوڕێیەتی چۆن دەبێ ئاوا بە فەرمان بێ و تۆ لێرەدا من بەند بکەی و نەتوانم بڕۆمە جێیان، شەوانیش دیسان بە فەرمان بمهێنیە ماڵێ و نەتوانم بڵێم نایەم؟

سوهەیل زەردەکەنی هاتێ و گوتی: تۆ بە هەڵە لێم حاڵی بووی برا جوانەکەم، دەربارەی ئەم مۆڵەت نەدانە هیچ نادرکێنم، وەلێ دڵنیابە لە بەرژەوەندی تۆیە نەوەك من. ئەوەی کە شەوانیش دێی و گۆیندەیی[1] دەکەی تەنێ چارەگە کاژێرێکە و تەواو، ئەی بۆ ناڵێی مامۆستا هەموو ڕۆژ کاژێرێك یاخود دووان بە دیارمەوە ڕوودەنیشێ و وانەم پێ دەڵێ و خەمی منیەتی. ئەمەت بۆ نایەتە خەیاڵ و ئەم چەند خولەکەت دێتە خەیاڵ. هەر شەرمە لەگەڵ مامۆستاکەت دا باسی ئەو چەند خولەکە بکەی. ئەگەر ڕاست دەکەی و منت خۆشدەوێ ئەو دەمەی من دەڵێم وەرە ئەوا دێی تەنانەت ئەگەر باڵیشت لە باڵندەکان قەرز کردبێ، وەلێ ئەو دەمەی خۆشەویستی نییە مرۆڤ هەزار بیانوو دەگرێ بۆ نەهاتن.

---

(١) گۆیندە: ئاوازەخوان، بویژ



سەریاڵ لەگەڵ ئەم قسانەدا خەندەی هاتێ و هەردوو باوەشیان بەیەکدا کرد و برایەتیان بۆ یەکتری دووپات کردەوە. بۆ بەیانی سوهەیلی حەکیم خێزانەکەی خۆی ناردەوە ماڵی باوکی بۆ ئەوەی سەریاڵ بهێنێتە ماڵێ و دەقە ئاینیەکانی لەسەر بخوێنێ.

سەریاڵ پێداگریەکی زۆری کرد کە نایەم و لە حیکمەتخانەکە دەخەوم، وەلێ سوهەیل دووبارە بە ناچاری کارەکەی لەسەر کردە فەرمان و بەزۆر هێنایە ماڵەکەی. ئاڕتینیش لەگەڵی هات و ئەو شەوە هەردوو لە ماڵی مامۆستادا خەوتن.

هەر ئەو دەمەی خەوی لێکەوت خێرا سوهەیل چوویە ژێر سەری و ئەو ویردانەی قیدار لەلای مامۆستاکەی هێنابووی تا بەیانی لەسەری خوێندی و نەخەوت.

سوهەیل لە ماندوویەتیان هێندێ جار لەسەر سەری سەریاڵدا سەری بەملا و لادا دەکەوت و خێرا خۆی دەهێنایەوە و دەچوو ڕوخساری تەڕ دەکرد و دەهاتەوە. لەنکاودا بەم نیوەی شەوە قیدار وەژووریێ کەوت و سوهەیل خەریك بوو بە دەنگی بەرز شتێك بڵێ و لاوەکان هۆشیار بکاتەوە، لێ بە خێرایی دەستی لەسەر دەمی خۆی دانا.

+ حەکیم گیان عەڕشمان سووتاندوون عەڕش، بەخوا ئەم ویردانە هێندە کاریگەریان هەیە بوون بە قەڵغانێك نەك تەنها لە دەوری سەریاڵدا بگرە لە دەورەی خانووەکەش.



بڕوا دەکەی سەواد و نزیکەی سەد جنۆکەی دیکە لەبەر دەرگان و ناتوانن پێ بخەنە ژووری.

سوهەیل بە نزمیەوە: ئەی هاوار ئەم هەمووە بۆ هاتوون برا، چییان دەوێ؟!

+ کوڕە وەهامان لێ نەکردوون کەس بزانێ، ئێمەی جنۆکە بڕوادارەکان لەلایەك و تۆش لەلایەکی دی. هەر خوا دەزانێ چ خەمێکمان پێ داون. من دەڕۆم و تۆ بەردەوام بە و نەخەوی، ئەوەش بزانە کە دوو شەوی دیشت ماون. ئەگەر ئەم دوو لاوە دەیانزانی چەندە پێیانەوە ماندووی و چت بۆ کردوون مامۆستا، دڵنیام لە شوێنی خۆیاندا شەرمەزار دەبوون دڵنیام، وەلێ داخەکەم ئەوان ئاگادار نین کە چۆن تۆ شەونخونیان بۆ دەکێشی. ئەگەر هەموو جیهان بگەڕێن تا ڕۆژی پەسڵانیش دڵسۆزێکی لە وێنەی تۆ بە خەیاڵیش نادۆزنەوە.

ئێمەی جنۆکە تەمەنمان زۆر درێژە، ئەو ماوە زۆرەی ژیاوم تا ئێستا هیچ مامۆستایەکم نەدیوە ئاوا بۆ فێرخوازەکانی بکا و لە داهاتووش دا دڵنیام بوونی نابێ تاوەکو جیهان دەپێچرێتەوە.

بۆ بەیانی لاوەکان بە دڵخۆشی هەڵسان و مامۆستاش چاوەکانی نەدەبوونەوە لە خەواندا، نەیدەویست وانەکەیان لێ بچوێنێ و خێرا دوای خواردنی بەیانی وانەکەشی پێ گوتن و لەدوای نیوەڕۆ تۆزێك چاوەکانی چوونە خەو. شەوی دواتر بە

هەمان جۆر لاوەکانی هێنانە ماڵ و دووبارە تا بەیانی بەدیار سەری سەریاڵەوە ڕوونیشت. شەوی سێیەم خێزانی مامۆستا گەڕابوویەوە ماڵ و سەریاڵیش چیدی ئامادەیی دەرنەبڕی لەماڵی مامۆستا بخەوێ. دەیزانی ئەگەر دووبارە بە فەرمان بیهێنێتە ماڵێ دەمەقاڵێ چێ دەبێ و کارەکەی لێ خرا دەبێتەوە. بە ناچاری لێی گەڕا لە حیکمەتخانەکە بخەوێ و خۆشی ئەو شەوە تا خێزانەکەی خەوی لێکەوت نەخەوت. ئەو دەمەی زانی هاوسەرەکەی چاوەکانی چوونە خەو بە ئەسپایی لەژێر جێگا نەرمەکە هاتە دەرێ و بەم نیوەی شەوە بەرەو حیکمەتخانەکە وەڕێ کەوت و بە پەنجەرەکەدا چوویە ئەو ژوورەی کە سەریاڵ و ئارتینی لێیە، ڕوانی هەردووکیان لە خەوێکی شیرین و قووڵدان. هەتا دونیا ڕووناك بوویەوە دووبارە لە بان سەری سەریاڵ نەجووڵا و هەموو ویردەکانی بە کۆتا هێنا. سەرنجی دایێ هەردوو لێفەکەیان لەسەر لاچووبوو، خێرا پێیدا دانەوە و بە هێمنی بە پەنجەرەکەدا چوویەوە دەرێ.

بەیانی قیدار لەگەڵ قوتابیەکاندا گوێی لە وانەکان ڕاگرتبوو، دوای تەواو بوونی وانەکان لەنکاو سەریاڵ بە پەشۆکاوی هاتە لای حەکیم سوهەیل و گوتی دوو سێ پارچە لە جلەکانم دیار نەماون، لە کاتێکدا لەنێو دۆڵابی جلەکاندا دامنابوون! هیچ شوێنێکی حیکمەتخانەکە نەماوە نەگەڕێم و نایاندۆزمەوە!

سوهەیل لەدڵی خۆیدا ترسا کە ئەمەش فیتنەیەکی سەواد و دار و دەستەکەی بێ،

لەنکاودا ڕوانی وا قیدار لەلای دەرگاکە پێدەکەنێ و زانی کاری ئەوە، بە ئاماژە بانگی کرد و قیدار گوتی:

بەخوا حەکیم گیان هیچم نەکردووە، هەر لەنێو دۆلابەکە دان، وەلێ پێم خۆشبوو شۆخیەکی لەگەڵ بکەم و بە شێوازێك وام کرد چاوی نەکەوێتە سەر جلەکان.

سوهەیلی حەکیم ویستی بەردەوامی بە شۆخیەکە بدا و سەیرێکی سەریاڵی کرد و گوتی: چیم پێ دەدەی ئەگەر دۆزیمەوە؟

سەریاڵ پێکەنی و گوتی: چیت دەوێ بێژە؟

+ باشە زۆرت لێ وەرناگرین و شتێکی کەممان بدێ لە پارەکەت، ڕازی؟

سەریاڵ هەرچەندە دڵنیابوو لەوەی کە هەموو شوێنەکان گەڕاوە و مامۆستا نایدۆزێتەوە، وەلێ ڕەزامەندی دەربڕی بەوەی بڕە پارەیەکی کەم بە مامۆستا بدا لە بەرامبەر دۆزینەوەیدا.

سوهەیلی حەکیم خێرا هەڵسا و دۆلابی جلەکانی والا کرد و ئەو پارچانەی سەریاڵ بەدوایدا دەگەڕا هێنانیە دەرێ و خستیە نێو دەستەکانی. سەریاڵ بە بینینی ئەم دیمەنە واقی وڕما و سوێندی دەخوارد کە تازە هەموو دۆلابەکە گەڕاوە و نەیدۆزیوەتەوە.

لەملاوەش قیدار و سوهەیل لە یەکدیان دەڕوانی و پێدەکەنین و سەریاڵیش دەیگوت بەخوا ئەم ماستە موویەکی تێدایە و من سەری لێ دەرناکەم! دواتر حەکیم سوهەیل پێی گوت کە جلەکان هەر لەوێدا بوون و تۆ ئەوکاتە چاوەکانت باش نەیدیون.

ئێوارە دوای عەسرێکی درەنگ مامۆستا لەنێو باغەکەی حیکمەتخانەدا ڕوونیشتبوو، لەنکاو سەریاڵ هاتە ئاتەکی و دوای کەمێ لە بێدەنگی دەستی پێکرد:

-مامۆستا گیان، دەڵێن لە شاهێندا خوولێکی وەرزشی کراوەتەوە تێیدا فێری هونەرەکانی جەنگ دەبی و هەمیش جەستە و لاشەت پتەو دەبێ و دەبیتە خاوەنی گەدێکی[1] ڕێك، منیش زۆر لاوازم و پێویستم بەوەیە بچم قوربان، بەڵێن بێ وانەکانیش ناچوێنم و هەردوولا بە ڕێکی ئەنجام دەدەم.

+ بەڵێ بیستوومە شتێکی وایان کردۆتەوە، وەلێ جارێ نابێ قوتابی بۆ ئەوێ بچێ و وانەکە لە هەموو شتێ گرنگترە. تۆ ئەو دەمەی وانەکانت پێ دەڵێم هێندە شەکەت دەبی خێرا دەکەویت و چەشنی مردوویەکت لێدێ، جا ڕۆژانە لە وەرزش بگەڕێیتەوە هەر پێت ناخوێندرێ. جگە لەمەش ئەگەر تۆ بنێرم قوتابییەکانی تریش داوای دەکەن و دەبێ بە کێشە، بۆیە جارێ لەم بابەتانە بگەڕێ برا.

---

(١) گەد: قەد و باڵا

سەریاڵ هەر پێداگربوو کە جەستە و لاشەی من شل و بێ هێزە و پێویستە بچم، وەلێ مامۆستا مۆڵەتی ئەم کارەی پێ نەدا و دووبارە دەمەقاڵێ دروست بوویەوە، بە چەشنێ یەکتریان نیگەران کرد ئەوانەی ڕابردووشیان هێنایەوە ناوێ، خێرا سوهەیل لە ژوورەکە هەڵسا و چوویە دەرێ و قیدار بەرامبەری هات کە ئاگری لەچاوی دەباری و دووبارە دەستی پێکرد: دەبینی ئەنجامی ڕووپێدانی زیاد چییە دەبینی، ئاخر دەترسم لەوەش دەربچێ و ڕۆژێك قسەیەکی وات بەرامبەر بکا بێ شەرمی بێ لە ڕووت و بەزۆر لەسەری ڕابوەستێ، چون من دەزانم تۆ کەسێکی گەورەی و لە چ پایەیەك دای، وەلێ ئەم گەنجە چووزانێ، ئەو چووزانێ تۆ موریدی کێی و لە چ پلەیەکی عیرفان دای؟

+ هێور بەوە قیدار هێور بەوە، خۆم دڵم هێندە خۆش نییە.

- خۆزگە جارێك، بەس جارێك کە شتێکت پێی دەگوت دەمەقاڵەی نەدەکرد، تەواو چیتر لێی قەبووڵ ناکەم حەکیم سوهەیل، زۆر زۆری پێ قەڵسم و ناتوانم ببینم کە ئازارت دەدا. ئاخر چۆن دەبێ ئاوا بکا چۆن! تۆ مامۆستای ئەوی! من چاوەڕێمە کە تۆ بەس فرمانێکم پێ بکەی و جێبەجێی بکەم.

+ ئەو بەتەواوی نامناسێ قیدار، خۆ هەموو کەسێك وەك تۆ ئاشنای من نییە تێبگە.

- ئەمە سێ شەوە خەوی شیرینت لە چاوان زڕاندوە لەبەر ئەو کەچی ئەوە کاردانەوەیەتی، کورە کەسانێکی تر هەن ئاواتە خوازن بتبینن و شێت دەبن بۆ دیدارێکت، تۆ چیت لەم دووانە داوە ئاخر چی؟! ئەوە تا ئازارێك نەچەژێ ئاقڵ نابێ، بزانە ئێستا دەچم و چی لێ دەکەم و چۆن پاساری[1] دەدەم.

سوهەیل لەگەڵ ئەم قسەیەدا بەتەواوی ڕەنگی گۆڕا و بە دەنگێکی بەرز گوتی:

بوەستە قیدار، دەڵێم بوەستە.

- ڕاناوەستم هەرگیز، نامەوێ ببینم دڵت پارچە پارچە بێ و هیچ نەکەم، چون ئێستا دەزانم چەندە دڵت ئازار دراوە. دکتۆرەکە چی گوت ها؟ نەیگوت نابێ خەم بخۆی، ئاخر ناترسی لە حاڵێکی ئاوادا جەڵتەیەك لێت بدا و کۆتاییت پێ بێنێ.

+ سوێند بە حەکیمی مەزن قیدار لەم کوڕە نزیك بیتەوە بە مەبەستی ئازاردانی هەتا ماوم ناتناسم، ئینجا خەمی دڵم قووڵتر مەکە و بڕۆ.

- باشە دەرم بکە، لەسەر کەسێك کە تازە ناسیوتە منی هاوڕێی مناڵیت دەرکە، ئەوە ڕۆیشتم و بزانە کامان زیاتر سوودت پێ دەگەیەنین.

---

(١) پاساردان: داخی دڵ ڕشتن بە کەسێك

# سەریاڵ و ڕووداوە دڵ تەزێنەکە

ماوەیەك بوو سەریاڵ بەتەواوی لەگەڵ مامۆستادا گۆڕابوو و وێنەی جاران دەمەقاڵەی نەدەکرد، چون لەوە گەیی بوو دەمەقاڵێ جگە لە توند کردنی دڵی مامۆستا و جێبەجێ نەکردنی کارەکەی خۆی شتێکی تری لێ نەدەهاتە ئەنجام. ئەو دەیهەویست ژیانی هاوسەری پێك بێنێ، وەلێ بیری لەوە دەکردەوە ئەگەر هاوسەرگیری بکەم بە چ شێوازێك بەردەوامی بە حیکمەتخانە بدەم، چون ئەمە زۆر گوپچڕ بوو قوتابی خێزانی هەبێ و بتوانێ لە حیکمەتخانەدا بمێنێتەوە. سوهەیلی حەکیم بە هەموو چەشنێك دژی هاوسەرگیری سەریاڵ دەوەستایەوە، چون بە ڕوونی لێی دیاربوو ئەگەر ئەم کوڕە لە ئێستادا ئەم پڕۆسەیە ئەنجام بدا هەرگیز ناتوانێ بەردەوامی بە حیکمەتخانە بدا. خۆ ئەگەر بشبێتە حەکیم ئەوا قەت نابێتە ئەو حەکیمەی کە ئەو دەیهەویست. هەر بۆیە هەمیشە ئامۆژگاری سەریاڵی دەکرد کە تاوەکو وانەکانی حیکمەتخانە تەواو نەکا بیر لە کارێکی وەها نەکاتەوە.

لە ڕۆژێکی ساردی زستاندا کە باران نم نم دەباری، وەها ڕێك کەوتبوو هەموو قوتابیەکان چووبوونەوە ماڵێ و تەنێ سەریاڵ لە حیکمەتخانەدا مابوویەوە. زۆر بێزار و بێتاقەت بوو بوو، هەستی بە تەنهاییەکی لە ڕادە بەدەر دەکرد و پڕ بە دڵ حەزی

لێبوو بچێتەوە، لێ جارێ کاتی چوونەوەی ئەو نەهاتبوو. بۆ نانی ئێوارە حەکیم سوهەیل هێنایە ماڵی خۆی و ڕێگەی نەدا بەتەنیا لە حیکمەتخانەدا بمێنێتەوە، چون دەیزانی هەم بێزار دەبێ و هەمیش لە تەنهاییدا ترس ڕووی لێ دەکا. ئەو شەوە یەکێك لە هاوڕێکانی حەکیم سوهەیل هات کە دەمێ بوو یەکتریان نەدیبوو، داوای لێکرد بەیەکەوە بچنە دەر و پیاسەیەکی ناو شاهێن بکەن. سوهەیلی حەکیم ئەگەرچی وازی لێنەبوو، وەلێ لەبەر دڵی سەریاڵ و سەدیقی هاوڕێی هەڵسا خۆی گۆڕی و جلێکی شینی گەنجانەی لەبەر کرد و سێ قۆڵی بۆی دەرچوون. هەرسێ لەنێو شاهێندا بەم شەوە تاریکە پیاسەیان دەکرد و بەنۆرە شۆخی و حەکایەت و گوتەی خەندە ئامێزیان بۆ یەکتری دەگێڕایەوە و قاقایان دەهاتێ. سەدیق زۆری حەکیم سوهەیل خۆشدەویست، چون زۆر جاران هەندێ کاری سەیر و سەمەرەی لێ دەبینی کە لە خەڵکانی دیکەی نەدەدیت و بەهۆی ئەم کارانەوە سەراسیمە دەبوو. ئەو پێی وابوو کە سوهەیل بە پلەیەکی زۆر بەرزی عیرفان گەییوە و هەموو کەسێ ناگا بەم پایەیە. ئەمەش وای کردبوو بەردەوام ستایشی بکا. هەرچەندە سوهەیلی حەکیم ئەم ستایشانەی لەدڵ گران بوو و پێی خۆش نەبوو چ کەس پێیدا هەڵبڵێ، بەتایبەت ئەگەر ڕووبەڕوو بووایە. ئەو شەوە سەدیق زیادلە ئەندازە پەسنی[1] سوهەیلی کرد و لەملاوەش سەریاڵ

---

(١) پەسن: مەدح و ستایش

پشت ڕاستی قسەکانی دەکردەوە و دەیگوت هەرچی دەربارە بڵێی لام سەیر نابێ، چون منیش بینیومە کە چۆن لە شارەکەی خۆمدا بۆنی کردووم و ئەو دەمەی خەریك بووە ڕووداوێکم بەسەر بێ پێی ئاگادار بووە. خۆ ئەو چشتانەی کە تۆ لێت بینیون لەچاو هی من هەر زۆر کەمن.

+ پێم وابێ پێدەچێ حەکیم سوهەیل جن و چشتی هەبن کاری بۆ بکەن و ئێمەش پێی ئاگادار نەبین.

سەریاڵ: هەموو شتێك دەربارەی مامۆستا ڕێی تێدەچێ و من ئەو بە کەسێکی ئاسایی نابینم.

ئەو شەوە تا درەنگان هەرسێ پێکەوە بوون و گەلێ کەیف سازبوون، لەمەڕ زۆر بابەتەوە دوان. ئەو دەمەی سەدیق ڕۆیشت حەکیم سوهەیل سەریاڵی لەگەڵ خۆیدا بردەوە ماڵێ و ئەویش بەبێ دەنگی ڕەگەڵی کەوت، چون دەیزانی لە تەنهاییدا ترس ڕووبەڕووی دەبێتەوە، بە تایبەت کە ئیمشەو لە بابەتی جن و چشت دواون. ئەو شەوە ئەم مامۆستا و قوتابیە لەگەڵ یەکدیدا کاتێکی لێوانلێو لە چێژ و شادیان بردە سەرێ و تا درەنگانی شەو خەویان لێنەکەوت و خەریکی قسەی خەندە ئامێز و شیعر گوتن بوون. مامۆستا دووبارە حەلوایەکی بەتامی بۆ سەریاڵ چێکرد و بەدەم شیعر گوتنەوە حەلوایان دەخوارد و جارو باریش دەست و خەتی خۆیان تاقی دەکردەوە و لەسەر ڕووپەڕەکان شیعرەکانی

نالیان دەنەخشاند. ئەمە خۆشترین شەوی ئەم دوو برایە بوو کە ئاوەها ڕووبەڕووی یەكتری ڕوونیشتبوون و خۆشەویستی لە كۆڕەكەیان دەچۆڕاوە. ئەو دەمەی شەو زۆر درەنگی كرد حەكیم سوهەیل نوێنەكانی بۆ سەریاڵ لە ژووری میوان دانان و چوویەوە ژوورەكەی خۆی كە تێیدا دەخەوت.

بەیانی وەكو هەموو ڕۆژانی دی سەریاڵ بە دەنگی مامۆستا خەبەری بوویەوە. ئەو دەمەی ویستی لەسەر جێگاكەی هەڵسێ مامۆستا گوتی: منیش تازە هەڵساوم سەریاڵ گیان، نازانم بۆچی ئیمڕۆ درەنگتر لە ڕۆژان خەبەرم بوویەوە. تۆ بڕۆ سەر و چاوت بشۆ تا كەمێكی دیكە خواردن و چشت دێنم، چون تۆ ئیمڕۆ میوانی منی.

+ قوربان گیان خۆت ماندوو مەكە ئەمەی ناوێ، من وا هەڵدەستم خۆم دەگۆڕم و لەوانەیە دواتر بچمەوە حیكمەتخانە.

- نەخێر قەبووڵم نییە لەوێ بە تەنها بی، من وا دەچمە دەرێ خۆت بگۆڕە و چاوەڕێت دەكەم.

ئەو دەمەی مامۆستا چوویە دەرێ سەریاڵ فانێلەكەی داكەند و دەستی بۆ قەمیسە تازەكەی برد تاوەكو لەبەری بكا، وەلێ هەستی كرد لەپشتی دەرگاكەوە كەسێك لێی دەڕوانێ و خێرا وازی لە خۆگۆڕینەكە هێنا.

دەرگاكە لەبەر شكاوی كونێكی تێ كەوتبوو، سەریاڵ هەستی دەكرد چاوێك لەنێو كونەكەدا وا تێی ڕاماوە و ناشزانێ كێ یە! خێرا سەرنجی خۆی لەسەر دەرگاكە لادا و تۆزێك خۆی بە هاتووچۆوە مژووڵ كرد و ئەو دەمەی چاوی سووڕاند و بینی چاوەكە هەر ماوە پتر ترسی لێ نیشت. هەزاران خەیاڵی سەیری بۆ دەهات و دڵی بە توندی لێی دەدا و لەناخی خۆیەوە دەیگوت: ئەی خودایە تۆ بڵێی ئەمە كێ بێ ئەم كارە خراپ و ناشایستەیە ئەنجام دەدا! قابیلە خۆ مامۆستا نییە؟ نا بابە ئەوە چی دەڵێم، مامۆستا چۆن كاری وا دەكا، ئەم كارە هەرگیز لە كەسێكی وا گەورە ناوەشێتەوە.

ئێ باشە بڵێی خێزانەكەی نەبێت! نا ئەمەش قەت ڕێی تێناچێ، دەڵێن خێزانی مامۆستا ئافرەتێكی تەواو خاوێن و دیندارە. هەرگیز كاری لەم چەشنە لە ئەویش ناوەشێتەوە.

ئێ باشە ئەی هاوار جگە لەم دووانە خۆ كەسی تر لەم ماڵەدا نییە، ئەی حەكیمی مەزن خەریكە شێت بم ئەوە من چی دەبینم!

چەند جارێك ویستی بەرەو دەرگاكە بڕوا و بیكاتەوە تا بزانێ كێ یە، وەلێ ترس و دڵەڕاوكێیەكی وەها دایگرتبوو كە لە شوێنی خۆیدا ڕەق بوو بوو. سەریاڵ نەیدەوێرا بە تەواوی سەیری چاوەكە بكا و دەترسا لەوەی مرۆی پشتی دەرگاكە پێی بزانێ كە ئەو ئاگاداریەتی، ئەمەش تا دەهات دڵی توندتر دەكرد و تووشی دڵە كوتەی كردبوو.

لەم حاڵەتە گوپچڕەدا كە خەریك بوو دڵی لە لێدان بوەستێ ویستی بانگی مامۆستا بكا، لەنكاو تەقەیەك هات و دەرگاكە بە ئەندازەی چەند پەنجەیەك بوویەوە و خێرا مرۆیەكەی پشتی دەرگاكە دووركەوتەوە. دیاربوو كە بەبێ ویستی خۆی شانی بەر دەرگاكە كەوتبوو، ئەو دەمەی دەرگاكە تۆزێك كرایەوە سەریاڵ توانی كەمێك لە دامێنی جلی مرۆڤەكە ببینێ و ئەمەش بە تەواوی دەری دەخست كە خاوەنی چاوەكە كێ یە. سەریاڵ بە بینینی ئەم دیمەنە خەریك بوو لەهۆش خۆی بچێ و بڕوای بە چاوەكانی خۆی نەدەكرد. بۆ تاوێك لە شوێنەكەی خۆیدا ڕەق ڕاوەستا و چەشنی مرۆیەكی بێ گیان جانی لێ بڕا، دەتگوت هەموو ئەندامەكانی جەستەی لە جووڵە كەوتوون و ڕۆح لە هەموو لایەكانی لاشەی چۆتە دەرێ. دوای بێدەنگیەكە هەردوو دەستی خۆی بەرز كردن و بە هەموو هێزیەوە چاوەكانی هەڵدەگلۆفی[١] بۆ ئەوەی دڵنیابێتەوە كە خەون نابینێ و ئەمە ڕاستیە. جارێك چووە ئەملا و جارێكی دیكە بۆ ئەملا بۆ ئەوەی دەست لە دار و دیوارەكە بدات و لەم خەوە ناخۆشە بەئاگا بێتەوە، وەلێ وا دیاربوو كە ئەمە خەون نەبوو. هێندەی پێنەچوو مامۆستا لە دەرگای دا و هاتە ژوورێ.

+ ئیمشەو بەباشی خەوتی برام، خۆ لە هیچ شتێكت كەم نەبوو؟

---

(١) هەڵگلۆفتن: سوونەوە و دەست هێنانی زۆر بە شتێكدا.



سەریاڵ کە هێشتا نەهاتبوویەوە سەرخۆ: بەڵێ ماموستا، بەباشی خەوتم.

+ زۆر چاکە، زۆر دڵخۆش بووم ئەمشەو کە لە ماڵی ئێمە بووی، ئەوە دەچم نانی بەیانی دێنم و دێمەوە لات.

- نا ماموستا لەوانەیە بڕۆم.

+ بۆ هیچ شوێنێك ناچی، ئەوە دەچم و بەزوویی دەگەڕێمەوە.

هەر لەدوای ڕۆیشتنی ماموستا خێرا سەریاڵ پێڵاوەکانی لەپێ کردن و بە خێرایی و چاوی پڕ فرمێسکەوە گەڕایەوە حیکمەتخانە و دەرگاکەی لەسەر خۆی قوفڵ دا. لەژووریدا هێندەی توانی فرمێسکی تەڕی بەسەر کوڵمەکانیدا باراند و وەکو مناڵێك دەلەرزی لە خەماندا. هێندەی نەبرد دەرگای ژوورەکە تەقەی لێوە هات و ماموستا لە پشتی دەرگاکەوە بە دەنگێکی بەرز بانگی سەریاڵی دەکرد و دەیگوت:

ئەی نەمگوت نەڕۆی سوورە، باشە بۆچی تۆ ئاوا ڕقت لە ماڵی ئێمەیە؟ زۆر شەرمە بۆت ماموستات بچێ نان بێنێ تا دێتەوە لەوێ نەمابی. بەڕاستی ئەو کارەت هی ئەوەیە سزای لەسەر بخۆی. هەرچەندی ماموستا لە پشتی دەرگاکەوە بە دەنگی بەرز و تووڕەییەوە قسەی دەکرد سەریاڵ دەنگی لێوە دەرنەدەهات و بە هێمنی لە سووچێکی ژوورەکەدا ڕوونیشتبوو و ئەسرینی خەفەتبارانەی دەڕشت. دەنگ نەکردنی سەریاڵ ماموستای پتر

تووڕە دەکرد و وای دەکرد زیاتر لە دەرگاکە بدات و دەنگی بەرزتر بکاتەوە، لێ سەریاڵ بە چەشنێ تاسابوو نقەی لێوە نەدەهات.

مامۆستا کەوتە دوو دڵیەوە کە ئاخۆ دەبێ ئەم کوڕە لە ژووری بێ یاخود نا، ئێ باشە ئەوەتا پێڵاوەکانی لەبەر دەرگای ژوورەکەن و دەرگاکەش قوفڵ دراوە! حەتمەن دەبێ سەریاڵ لە ژووری دابێ، وەلێ بۆچی دەنگی نییە و دەرگاکە ناکاتەوە!

دوای خۆ تووڕەکردن و لە دەرگادانێکی زۆر مامۆستا ترسی لێ نیشت سەریاڵ لەژوورێدا چشتێکی لێ هاتبێ. ئاخر ئەگەر بە هۆش بێ چۆن وەڵامێك چشتێك ناداتەوە!

ئەم هەموو لە دەرگادانە خەریکە دراوسێکانی حیکمەتخانەش واگا بێنێ.

مامۆستا بە پەشۆکاویەوە خێرا بەرەو پەنجەرەکە ڕۆیی، وەلێ ئەویش داخرابوو، جگە لەمەش لە دیوەکەی تر پەردەیەکی زەردی پێدا درابوو کە نەدەتوانرا ناوەوەی ژوورەکە ببینرێ. مامۆستا ترسەکەی زۆر پتر بوو، بۆیە یان دەبوایە دەرگاکەی شکاندبا یاخود پەنجەرەکە. خێرا بەرەو دەرگاکە ڕۆیی و بە هەموو هێزیەوە خۆی پێدا کێشا، وەلێ وادیاربوو کە زۆر پتەو بوو، ئەمجارەیان چوویەوە دواوە تاوەکو بۆ جاری دووەم خۆی پێدا بکێشێتەوە خێرا سەریاڵ دەنگێکی نزمی لێوە هات و گوتی: لە ژوورێم مامۆستا.

مامۆستا کە زانی هۆشی هەیە لە شوێنی خۆیدا سوور بوویەوە و زێدەتر تووڕەیی نیشان دا و گوتی: ئەرێ تۆ مرۆڤی؟! یەك کاژێرە لە دەرگا دەدەم و هاوار دەکەم حیسابێکمان بۆ ناکەی، پێم بێژە خەریکی چی لە ژووریێ؟! سوێند بە حەکیمی مەزن هێندە لێت پڕم کە نایەڵم ئەمەت بێ سزا لەسەر تێپەڕێ. خێرا دەرگاکە بکەرەوە تا نەمشکاندووە.

سەریاڵ بە غەمباریەوە: ببوورە مامۆستا، هێندە بێتاقەتم کە نامەوێ هیچ مرۆڤێك ببینم. تکات لێ دەکەم جاریێ برۆ، دووبارە تکات لێ دەکەمەوە جاریێ جێم بهێڵە و دواتر باسی غەمباریەکەی خۆمت بۆ دەکەم.

مامۆستا بە پەشۆکاویەوە: ئێ باشە نابێ بزانم چی ڕوویداوە، مەگەر من برات نییم؟ مامۆستات نییم؟ مافی ئەوەم هەیە بزانم بۆ دڵت تەنگە و چیت لێ بەسەر هاتووە. ئاخر گەر بەم چەشنە جێت بهێڵم خەوم لێ ناکەوێ و شێت دەبم لە خەمان سەریاڵ.

سەریاڵ کەمێك دەنگی بەرزتر کرد: قوربانت بم لەئێستادا جێم بهێڵە مامۆستا، ئەگەر تۆزێك منت خۆشدەوێ بەس تۆزێك ئێستا لێرە برۆ، بەڵێن بێ هۆکارەکەت پێ دەڵێم، بۆ خاتری حەکیمی مەزن جاریێ برۆ.

سوهەیل لە پشتی دەرگاوە کە خەریك بوو شێت دەبوو لە خەماندا گوتی:

باشە ئەوە جارێ ڕۆیشتم، کاژێرێکی تر دەگەڕێمەوە و هەموو شتێکم پێ دەڵێی، ئەم پێگوتنەش سزاکەت لەسەر لانادا و ئەوەش لەبیر ناکەم کە چۆن مامۆستا و براکەی خۆت ئاوا لەبەر دەرگا ڕاگرتووە و جارێ خودا حافیز.

ئەو دەمەی مامۆستا ڕۆیشت سەریاڵ خەریك بوو مێشکی دەتەقی هێندە ناڕەحەت و کەلەلابوو[١]، بیرکردنەوە لەم بابەتە بە چەشنێ ئازاری پێ دەگەیاند کە نەیدەتوانی بە تەواوی بە هزری خۆیدا بیهێنێ. ناوە ناوە ڕادەوەستا و سەری دەلەقاند و دەیگوت:

ئەمە نابێ، ئەمە هەرگیز نابێ، دڵنیام خەونە، بەڵێ دڵنیام خەونە. ئەی هاوار کەسێك هەبێ وەئاگام بێنێتەوە نامەوێ چیدی لەنێو ئەم خەونە ناخۆشە دابم.

بە دەستەکانی بە دیوارەکەدا دەیکێشا تاوەکو هۆشی بۆ بگەڕێتەوە و بە ئاگا بێتەوە، وەلێ بە تەواوی بۆی دەرکەوت ئەمە خەون نییە، بەڵکو ڕاستیەکە و دەبێ قەبووڵی بکا.

دووبارە لەبەر خۆیەوە کەوتەوە قسە: بەڵام چۆن؟! ئەی هاوار چۆن ئەم کارە ڕوویدا؟! ئاخر مامۆستا تۆ چۆن کاری وات کرد! بۆچی تۆ بۆچی! هاوار خودایە چیم لێ قەوماوە و چیم بینیوە! سوێند بە گەورەیی تۆ ناتوانم بڕوا بکەم، ئاخر چۆن بڕوا بەخۆم

---

(١) کەلەلا: کەسێکە برینێکی گەورە بەسەر جەستەیەوە بێ.



بێنم کە مامۆستا کارێکی وای کردووە؟! دڵنیام، بەڵێ دڵنیام و سەدا هەزار دڵنیام جلەکە جلی مامۆستا بوو، شەویش هەر ئەم جلە شینەی لەبەردا بوو. ئاخر ئەم کارە خراپە هیچ لێکدانەوەیەکی باش هەڵناگرێ هیچ، دەمێکە لە هزرمدا دەیهێنم و دەیبەم ناتوانم لایەنێکی باشەی تێدا ببینم. ئاخر تۆ مامۆستا و ڕابەرم بووی، برای گەورە و کەس و کارم بووی و لەجێی هەموو کەسی خۆمم دانابووی و ئێستا چۆن کارێکی وەهام بەرامبەر دەکەی! ئای خودایە سەرم دەتەقێ، سوێند بە زاتی تۆ سەرم دەتەقێ. ئەو کەسەی خۆشم دەویست و پشتم پێی بەستبوو کە بمکا بە حەکیم و لە کاروباری ژیانمدا یارمەتی دەرم بێ چی بەرامبەر کردم! ئێستا چی بکەم، یارەبی چارەسەرێکم لێ بکە ئێستا چی بکەم! بڕۆمەوە چی بە ماڵەوە بێژم و بڵێم لەسەر چی حیکمەتخانەم جێهێشت؟ چی بە ئارتین بڵێم خودایە؟ ئاخر ئارتین مامۆستای زۆر زۆر خۆشدەوێ و چۆن بڕوا بە من دێنێ کە پێی بێژم با لێرە بڕۆین مامۆستا کارێکی وای کردووە؟ باشە چی وەڵامی خودی مامۆستا بدەمەوە و بڵێم لەسەر چی جێت دەهێڵم؟! پێویستە هەر ئێستا لێرە بڕۆم، بەڵێ هەر ئێستا دەبێ ئێرە جێ بێڵم و تا هەتایە ئەم جێگا شوومە نەبینمەوە.

سەریاڵ خێرا هەندێ لە شتومەکەکانی خۆی ئاخنیە نێو جانتاکە و بەر لەوەی مامۆستا بێتەوە حیکمەتخانەکەی بەجێ هێشت و بەرەو شارەکەی خۆی وەڕێ کەوتەوە. ئەو ئامادە نەبوو

هیچ شتێ لەم بارەیەوە بە مامۆستا بێژێ، دەیگوت لە دڵی خۆمدا دەیهێڵمەوە و ئەگەر پرسیاری کرد بۆچی بەم چەشنە ڕۆیشتووی ئەوا دەڵێم بەیانی کە تۆ ڕۆیشتی هەستم کرد جەستەم بەرەو تێکچوون دەچوو، خێرا خۆم گەیاندە حیکمەتخانە نەبادا لە ماڵەکەی تۆدا بڕشێمەوە، دواتر بەم بەیانیە هاوڕێیەك هەواڵی پێدام کە دایکت زۆر حاڵی خراپە و لە نەخۆشخانە کەوتووە. ئیدی ئاگام لەخۆم نەما و قسەم پێ نەدەکرا و خێرا گەڕامەوە ماڵێ.

سەریاڵ گەیشتەوە ماڵێ و هەموو بە بینینی سەراسیمە بوون، چون لەمێژ نەبوو هاتبوویەوە، وەلێ هیچی بۆ ماڵێ نەدرکاند و هەر هێندەی گوت کە تۆزێ نەساغە و پشووی گەرەکە. ئەو ڕۆژە هەستی دەکرد حاڵی زۆر زۆر خراپە و دەم نا دەمێ کە ڕووداوەکەی دەهاتەوە یاد بەرگەی نەدەگرت و فرمێسك لەچاوانی دەتکا و وێنەی منداڵ دەگریا. هەرچەندی دایکی بانگی کرد تەنانەت بۆ نان خواردنیش نەهاتە دەرێ.

شەوێ بە حاڵێکی تەواو شێواو و خراپەوە خۆی گەیاندە لای ماڵی ئارتین و لە دەرگاکەی دا و خێرا ئارتین هاتە دەرێ و واق بوو پێیدا.

+ئەوە چی یە سەریاڵ کەی هاتوویتەوە برا؟ خۆ سەرەی هاتنەوەی تۆ نەبوو جارێ!

- تۆزێ نەساغ و کفت[١] بووم بۆیە گەڕامەوە، واز لەوە بێنە تۆ، کاتت هەیە پیاسەیەك بکەین؟

+ ئەرێ وەڵا برا چۆن بۆ تۆ نییمە، ئەوە دەچم چاکەتەکەم دێنم و دێمەوە.

دوو لاوەکە هەردوو بەیەکەوە چوونە دەر و دەستیان بە قسان کرد. هەر لە سەرەتاوە ئاڕتین زانی کە حاڵی سەریاڵ تەواو نییە، بۆیە خێرا پرسی: ئەرێ خێرە کاکە وەها شێواو دەتبینم، دەڵێی شتێك ڕوویداوە؟

سەریاڵ هەناسەیەکی غەمبارانەی هەڵکێشا و گوتی: بەڵێ ڕوویداوە ئاڕتین گیان، وەلێ نازانم چی بڵێم و چیت پێ بێژم، خۆشم سەرم سوڕماوە.

+ ئێ چی بووە ئاخر! خۆ دووبارە لەگەڵ مامۆستادا دەمەقاڵێت نەکردووە سەریاڵ، تۆ فێری زوو زوو مامۆستا بێتاقەت دەکەی ها.

- خۆزگە ئەمە بووایە خۆزگە، بریا هەموو ڕۆژێ دەمەقاڵێمان کردبا و بەس ئەم کارە ڕووینەدابا.

+ ئێ دە پێم بێژە برا، وەڵا دڵمت تەقاند، خۆ مامۆستا لێی نەداوی؟

---

(١) کفت: ماندوو

- خۆزگە هێندەی لێدەدام و نیوە مەرگی دەکردم بەس ئەمەم نەدیبا. گوێم لێ ڕاگرە ئاڕتین، چەند ڕۆژێکی دی هەردووکمان دەچینە حیکمەتخانە و کەلوپەلەکانی خۆمان دێنینەوە.

ئاڕتین بە سەرسوڕمانەوە: کورە تۆ تەواوی! ئەوە دەزانی چی دەڵێی!

- بەڵێ باش دەزانم، بەداخەوە ئیدی ناتوانین لەمە زیاتر لەوێدا بمێنینەوە.

ئاڕتین بە تووڕەییەوە: واز لە قسەی قۆڕ بێنە سەریاڵ، من ناتوانم هەرگیز ئەوێ بەجێ بێڵم، هەموو دونیاش بکەین جێگایەکی ئاوامان بەدەست ناکەوێ، ئیدی بۆ لەقە لە بەختی خۆمان بدەین کاکە.

- بۆچی وادەزانی من پێم خۆشە کە ئەم قسەیە دەکەم، سوێند بە حەکیمی مەزن دڵم دەکوڵێ لەگەڵیدا، وەلێ ناچارین ئەوە بکەین ناچار، بۆیە تکایە لەسەری مەڕۆ و دوو سێ ڕۆژی دی کەلوپەلەکانمان دێنینەوە.

ئاڕتین بە تووڕەییەکی زێدەوە: کورە شێتم مەکە سەریاڵ، نابێ بزانم چی ڕوویداوە، کاکە ئێوە ئاوا لێك تووڕە دەبن بۆ بەیانی دەچنەوە لای یەکتر و تەواو، ئیدی شتەکە بۆ وا قوڕس دەکەی. بەخوا من لای مامۆستا نەبێ لە یەك شوێنی تر بۆم ناخوێندرێ.

سەریاڵ بە غەمباریەوە: ئیدی ژیانی من لەگەڵ حیکمەتخانەدا کۆتایی هات، هەتا ماوم پێم ناخەمەوە هیچ حیکمەتخانەیەك و لای کەسیش ناخوێنم. هەموو شتێك کۆتایی هات ئارتین گیان، خەونی بوون بە حەکیمیش چوویە گۆڕەوە بەداخەوە.

لەگەڵ ئەم قسەیەدا سەریاڵ خۆی نەگرت و ئەسرینەکانی دابەزینە خوارێ و خێرا دەستی لەسەر چاوەکانی خۆی دانا تاوەکو گریانەکەی لە ئارتین بشارێتەوە.

ئارتین بە پەشۆکاویەوە: یانی شتێکی هێندە گەورە ڕوویداوە شایەنی ئەوەیە کە تا هەتایی واز لە حیکمەتخانە بێنی؟!

- بەڵێ ئارتین گیان بەڵێ، بەداخەوەم کە ئەمە ڕوویدا.

+ ئێ باشە کاکە با بزانم چی یە، بەڵکو کارەکە هێندە گەورە نەبێ و تۆ هەڵە تێی گەیشتبی؟

- بە چاوەکانی خۆم بینیم ئارتین ڕێك بە چاوەکانم، سوێند بە حەکیمی مەزن دەخۆم ئەگەر بەم چاوانەم نەمبینیبا هەموو جیهان گوتبایان مامۆستا کارێکی وای کردووە بڕوام نەدەکرد، ئێستاش نازانم چۆن بڕوا بە چاوەکانم بکەم!

+ یانی مامۆستا شتێکی هێندە خراپی کردووە؟! بەڵام ئەو کەسێکی زۆر ڕۆحی بوو سەریاڵ!



- واز لە هەموو ئەم شتانە بێنە، وا پێت دەڵێم من بە چاوی خۆم بینیم کە چی کرد. من چەند ڕۆژی دی دەچم کەلوپەلەکانم دێنمەوە، ئەگەر لەگەڵم دێی باشە، دەنا بە تەنیا دەڕۆم.

ئاڕتین لەشوێنی خۆیدا هەستی بە دڵ توندیەکی زۆر کرد و خێرا ڕوونیشت و گوتی:

ئەی هاوار خودایە لەم بەڵایە، تازە هاتبوومە نێو جیهانی حیکمەت و دەمهەویست شتێك فێرببم، لەگەڵ مامۆستادا خۆشەویستیەکی زۆرمان بنیات نابوو و ببووینە یەك خێزان، ئێستا چۆن ئاوا ئاسان بچم کەلوپەلەکانم بێنمەوە، ئەوە تاقی کردنەوەیەکی زۆر سەختە زۆر.

سەریاڵ بە گریانەوە: بۆ من چەندین هێندەی تۆ سەختە، من ئەوم بە برا گەورەی خۆم دانابوو، ئەو حیکمەتخانەیەم بە هەموو جیهان نەدەگۆڕیەوە، ئێستا هەرچی خەونم لە ڕابردوو هەبوو سەرپاکی چوویە ژێر گڵ.

+ باشە چۆن بە باوکم بڵێم کە ئەوێ جێ دێڵم؟ دڵنیام زۆر زۆر لێم تووڕە دەبێ. من هەموو جارێ باسی مامۆستام بۆ دەکرد و ئەویش دەیگوت هەرگیز نابێ ئەوێ جێ بهێڵی. بەخوا ئێستا بزانێ دەڕۆم هەر شێت دەبێ و هەزار قسەمان پێ دەڵێ.

دوو لاوەکە بە تەواوی بڕیاری ڕۆیشتنیان دا و هەرچەندە ماڵەوەیان پێداگر بوون کە نەڕۆن، بە تایبەتی باوکی ئاڕتین

ئەوانی ڕووبەڕووی چەندین جنێو و قسەی ناخۆش کردەوە، وەلێ ئەوان ئامادە نەبوون دەست لە بڕیارەکەیان هەڵگرن.



## ڕۆژە سەختەکەی حەکیم سوهەیل

ئەو شەوە حەکیم سوهەیل لەگەڵ سەریاڵ و سەدیقی هاوڕێیدا زۆر بە خۆشی گوزەراندی، وەلێ ئەو هەموو ستایشەی سەدیق و سەریاڵ بۆ سوهەیلی حەکیمیان کرد و دەیانگوت کە ئەو کەسێکی ئاسایی نییە تۆزێك خۆ بە گەورە زانینی لە دڵی سوهەیلدا چێکرد.

حەکیم سوهەیل هەمیشە خۆی بە کەم دەگرت و ڕقی لە خۆ بە شت زانین بوو، وەلێ ئەو شەوە لەبەر شۆخی و مژووڵی لەگەڵ سەریاڵ و سەدیقدا نەیتوانی هەندێك لە ویردەکانی بخوێنێ و کەوتە نێو گاڵتە و گەپی دونیاوە. لەگەڵ ئەم باس و ستایشەی ئەم دووانەش بەبێ ئاگاداری خۆی بازێك لە گەورەیی چوویە دڵیەوە و ئەمەش ڕێگای خۆشکرد کە جنۆکە بێ باوەڕەکان لێی نزیك بکەونەوە و فریشتە نوورانیەکانیش خۆیان بەدوور بگرن. قیداریش ئەو شەوە لە هیچ لایەکەوە دەنگی نەبوو کە سوهەیل لەم حاڵەتە ئاگادار بکاتەوە.

ئەو شەوە سوهەیلی حەکیم بە قاقا و خەندەوە سەریاڵی جێهێشت و هاتەوە ژوورەکەی، وەلێ هەستی دەکرد قەسوەت و دڵ توندیەکی زۆر ڕووی لێ کردووە و وێنەی کەسێکی دژوێن[1]

---

(١) دژوێن: چڵکن



لەشی تەواو گران بووە. ئەو نەیزانی بە تەواوی هۆکارەکە چی یە و ویستی بڕوا هەندێ لەم ویرد و نزایانەی ماویەتی ئەنجامی بدا، وەلێ ئەوەندە بێتاقەت بوو کە خێرا لە شوێنی خۆی پاڵی دایەوە و نەیتوانی پەرستشەکانی ئەو شەوەی بەجێ بێنێ و بە زوویی کەوتە خەوێکی قووڵەوە. بەرە بەری بەیانی بەر لەوەی لە خەو هەڵسێ حەکیم دانیالی لە خەودا بینی، وەلێ ئەمجارە کەمێك لە جاران جیاوازتر بوو. حەکیم دانیال لە دووری سوهەیلەوە ڕاوەستابوو، جگە لەمەش دەم و چاوی هێندێ ئاڵۆز بوو بوو کە دەتگوت بریندار کراوە یاخود شێوێندراوە. بە دەنگێکی کەمێك لە جاران جوداتر بانگی سوهەیلی حەکیمی کرد و گوتی: کوڕم سوهەیل، زۆر ئاگات لە سەریاڵ بێ و پێم خۆشە کە هێندە خۆشت دەوێ. هەمیشە نزاتان بۆ دەکەم پەیوەندی و برایەتیتان پتەوتر بێ و سەریاڵیش ببێ بە حەکیمێکی مەزن. ئیمڕۆ شتێکت پێ دەڵێم دەبێ بەبێ بیرکردنەوە ئەنجامی بدەیت و لە سەرەنجامەکەشی نەکۆڵیتەوە. ئێستا تاقیکردنەوەی تۆ لێرەدا دەست پێدەکا تاوەکو بزانین چەندە توانات هەیە بۆ هەڵگرتنی شتی زیاتر کوڕم. ئەو دەمەی هەڵسای و ئەم لاوە پێی گوتی خۆم دەگۆڕم، تۆ لە کەلێنی دەرگاکەدا سەیر بکە و بزانە ئەم کوڕە چی دەکا، ئەوکات شتێکی وا دەبینی کە سەرت تێیدا سوڕ دەمێنێ. خۆشت باوەڕ ناکەی چی دەبینی سوهەیل، دڵنیابە خۆشت باوەڕ ناکەی.

سوهەیلی حەکیم لەگەڵ ئەم خەوەدا ڕاپەڕی و سەیری کرد کات درەنگی کردووە. خێرا بەرەو ژووری میوانان ڕۆیشت و چوویە ژێر سەری سەریاڵ و بانگی کرد و چەند جارێك دەستی بە قژیدا هێنا تاوەکو واگا هات. ئەو دەمەی سەریاڵ گوتی خۆم دەگۆڕم سوهەیلی حەکیم خێرا خەوەکەی کەوتەوە یاد و سەیرێکی دەرگاکەی کرد. لەو کاتەدا دەنگێك کەوتە بەر گوێی و پێی گوت: دوو دڵ مەبە و ئەنجامی بدە.

حەکیم سوهەیل لەگەڵ هاتنی ئەم دەنگەدا پتر دڵنیا بوویەوە و خێرا چاوی بە کەلێنی دەرگاکەوە نا، چون ئەو لای وابوو سەریاڵ خۆی ناگۆڕێ و شتێکی سەیر ئەنجام دەدا.

ئەو لەو دەمـــەدا سەـــری هـێندە گـــێـژ بوو بوو کە بیری لە سەرەنجامی کارەکە نەدەکردەوە و تەنێ ئەوەی لە خەوەکە پێی گوترابوو ئەنجامی دەدا. سوهەیل لای وابوو کە حەکیم دانیال هیچ شتێ بەبێ هۆ نالێ و حەتمەن دەبێ هۆکارێکی گەورە لەئارا دابێ.

دوای ئەوەی ماوەیەك لە دەرگاکەوە ڕوانی هیچی بەدی نەکرد و لەنکاو هاتەوە هۆش خۆی و شەرمی لێ نیشت و کشایەوە، لێ ئەو دەمەی ویستی بکشێتەوە دواوە شانی ڕاستی بەر دەرگاکە کەوت و تۆزێ کرایەوە و خێرا لە ژوورەکە دوورکەوتەوە. ئەو کاتەی حەکیم سوهەیل چوویەوە ژوورەکەی بەتەواوی هاتەوە هۆش و هەستی بە دڵ توندیەکی زۆر کرد و زانی کارێکی هەڵەی



ئەنجام داوە، لێ لەوەدا سەراسیمە بوو بوو کە حەکیم دانیال چۆن فەرمانێکی وا دەکا! بێگومان لێرەدا شتێکی نائاسایی هەیە و پێویستە یەکلایی ببێتەوە.

حەکیم سوهەیل تا دەهات دڵ توندی و ڕاڕاییەکەی زیاتر دەبوو، زۆر دەترسا سەریاڵ بە کارەکەی زانیبێ و شەرمەزار ببێ. خێرا لە ژوورەکەی خۆی هەڵسا و بەرەو ژووری میوانان چوویەوە و لە دەرگای دا و لە سەریاڵ نزیك کەوتەوە. ئەو دەمەی سەریاڵی دواند و زانی هیچ کێشەیەك لە ئارادا نییە خێرا دڵی هاتەوە سەر خۆی و ئارام بوویەوە.

سوهەیلی حەکیم خێزانەکەی لە خەو هەڵساند تاوەکو نانی بەیانیان بۆ ئامادە بکا و لە ژوورەوە لەگەڵ سەریاڵدا بیخۆن، لێ کاتێك چوویەوە ژووری ڕوانی سەریاڵ لەوێدا نەماوە، دووبارە دڕدۆنگیەکی زۆر لە دڵی مامۆستادا چێ بوویەوە.

حەکیم سوهەیل خێرا بەرەو سەر ئاوەکە ڕۆیی بە گومانی ئەوەی سەریاڵ بۆ ئەوێ چووبێ، وەلێ لەوێش نەبوو. ئەمجارەیان بەنێو ماڵەکەدا چەرخا و بەدەنگی بەرزەوە بانگی سەریاڵی کرد، لێ ئەمەش بێسوود بوو. حەکیم بە خێرایی و دڵە کوتێوە بەرەو حیکمەتخانەکە ڕۆیی و ڕوانی پێڵاوەکانی لاوەکە لەبەر دەرگای ژوورەکەن و بە توندی لە دەرگای دا و هیچ دەنگێکی بەدی نەکرد. سەرەتا وایزانی خەوی لێ کەوتووە یان شتێکی بەسەر



هاتووە، لێ ئەو دەمەی سەریاڵ وەدەنگ هات ئەو گومانەی نەما، بەهۆی قسەکانی ئەو لاوەوە حیکمەتخانەی بەجێ هێشت و گوتی کاژێرێکی تر دێمەوە لات و سزاشت بەسەردا دەسەپێنم. سوهەیلی حەکیم خولەك بە خولەك دەیژمارد تا کاژێرەکە تەواو ببێ و بچێتەوە لای سەریاڵ، چون دەترسا لاوەکە بە کارەکەی زانیبێ بۆیە هێندە غەمبارە، دەشیزانی شتێکی نەخوازراو لە ئارا دایە و هەرگیز حەکیم دانیال فەرمانی بە کارێکی خراپ پێ نەکردووە. ناوە ناوە دەستی بەرز دەکردەوە و لە حەکیمی مەزن دەپاڕایەوە کە هیچی خراپ ڕوونەدا و جار نا جاریش سەیرێکی ئەملا و لای خۆی دەکرد بەڵکو قیدار بێت و هەواڵێك بێنێ و دڵی ئارام بکاتەوە، لێ ئەویش هیچ دەنگێکی نەبوو.

تا دەهات ترس و دڵەڕاوکێی حەکیم لە زیادبوون دابوو، بە چەشنێ دڕدۆنگ بوو بوو خەریك بوو دڵی لەنێو سینەیدا بێتە دەرێ. هێندەی نەمابوو کاژێرەکە تەواو بێ بەرگەی نەگرت و بە کرژی[1] بەرەو حیکمەتخانەکە وەڕێ کەوتەوە، لێ ئەو دەمەی ڕوانی ژوورەکە بە کراوەیی بەجێ هێڵراوە و سەریاڵیش لەوێ نییە هێندەی دی ترس و ناڕەحەتی هێرشیان بۆ مامۆستا هێنا. بە پەشۆکاویەوە حەوشە و بان و ژوورەکانی حیکمەتخانە یەك یەك دەگەڕا و لە هەموو لایەکەوە بانگی سەریاڵی دەکرد، لێ لە هیچ

---

(١) کرژ: خێرا و چەسپان

لادا دەنگی ئەم لاوە نەدەهات. لە کۆتاییدا زانی سەریاڵ لەوێ نەماوە و لە شوێنی خۆیدا بە شەکەتی ڕوونیشت و تا دەهاتیش خەم و دڵەڕاوکێی پتر دەبوو. هەستی بە پرزە تەنگیەکی زۆر دەکرد، لەپڕدا سووکە لەرزێکی هاتێ و لەشوێنی خۆیدا پاڵی دایەوە و لەبەر خۆیدا بە ئازارەوە دەیگوت: وای لێهات سەریاڵ، وای لێهات بە دڵی خۆت بڕۆی و پرس بە من نەکەی، ئاخر خەتای منە، خەتای منە کە هێندە ناز و خۆشەویستیت دەدەمێ، دەنا چ قوتابیەك دەتوانێ بەبێ پرس بڕوات و ئاوا خەم و خەفەت بداتە مامۆستاکەی. سوێند بێ ئەمجارە بێیەوە سزات بدەم، بە دڵنیاییەوە سزات دەدەم. ئەگەر لەسەر ئەم کارە سزات نەدەم کەواتە هەموو قوتابیان بەم چەشنە فێر دەبن بەبێ پرس بڕۆن و کەس حیساب بۆ مامۆستا و گەورەیەك ناکا. مامۆستا تا دڵی خۆی خاڵی کردەوە ئەم قسانەی کرد و زۆریش لە ناخەوە دەترسا سەریاڵ بە کارەکەی ئەوی زانیبێ و لێی تۆرابێ. ناوە ناوە دڵی خۆی دەدایەوە و دەیگوت دڵنیام کە چۆتەوە حیکمەتخانە کەسێك هاتووە و هەواڵێکی خراپی بۆ هێناوە، چون من بەیانی کە چوومە لای بێ کەم و کوڕی بوو و گوتیشی کە بەباشی خەوتووم.

ئەگەر ئەو شتەی بینیبا هەر ئەو دەم هێرشی دەکردە سەرم و پێی دەگوتم، بەڵێ دڵنیام ئەو دەم پێی دەگوتم.

ئەو ڕۆژە مامۆستا هێندە بێتاقەت بوو خێرا خێزانەکەی ناردەوە ماڵی باوکی و نەیدەویست خەمباریەکانی ببینێ. تەواوی

ڕۆژەکەی بە تەنیایی و دڵەڕاوکێوە گوزەراند و شەویش هەستی دەکرد خەوی لێ ناکەوێ. ئەو تەنانەت لەو دەمانەی دڵخۆشیش بوو نەدەبوو تەنیابێ، چون دکتۆرەکان گوتبوویان لە هەر کاتێکدا ئەگەری هەیە تووشی نەخۆشی دەروونی ببێتەوە، چ جای ئەوەی ئەو خەم و ئازارە لە ماڵێکی ئاوا چۆڵدا بە تەنیا بەڕێ بکا. ئەو شەوە نەیزانی هیچ خەوی لێکەوتووە یان نا، ناوە ناوە لەسەر جێگاکەی هەڵدەستا و دەستی بە نزا و پاڕانەوە دەکرد و دواتر دەگەڕایەوە سەر جێگا. بەردەوامیش چاوی لە قیدار دەگێڕا و هیچی بەدی نەدەکرد. بە زۆر دەیهەویست خەو بەسەر خۆیدا زاڵ بکا بەڵکو دانیالی پیر ببینێتەوە و ڕوون کردنەوەیەکی لەسەر ئەم ڕووداوە پێ بدا، وەلێ ئەمەش بێ سوود بوو. هەر کە بەیانی داهات خێرا هەڵسا و نامەیەکی بۆ سەریاڵ نووسی تاوەکو بە پۆستە چییەکەدا ڕەوانەی بکا. لە نامەکەدا بە توندی هێرشی کردە سەر سەریاڵ و گلەیی ئەوەی لێکرد کە چۆن بەم شێوازە مامۆستاکەی لەنێو خەم و ئازاردا جێ هێشتووە و پرسی پێی نەکردووە، هەروەها بۆشی نووسی بوو کە سزای دەدا و وەکو جاران لەگەڵیدا میهرەبان نابێ. تووڕەبوونی مامۆستا بۆ سەریاڵ تەنێ سەر زارەکی بوو، چون سەریاڵ لەلای ئەو وێنەی کەسێکی خێزانەکەی بوو، هەرگیز دڵی نەدەهات ئازاری پێ بگەیەنێ.

چەند ڕۆژێك دوای ئەوە نامەیەك لە سەریاڵەوە گەیشتە دەستی مامۆستا و چەند دێڕە نووسینێکی سارد و سڕی تێدابوو

کە ئاماژەی بۆ نەخۆشی دایکی دەکرد، گوایە بەیانیەکەی زوو کەسێك هەواڵی نەخۆشیەکەی بۆ هێناوە بۆیە ئاوا حاڵی شێواوە. سوهەیلی حەکیم بە بینینی نامەکە تۆزێك حاڵی هاتەوە سەر خۆی و سوپاسی خودای کرد کە سەریاڵ بە کارەکەی نەزانیوە، لێ لەگەڵ ئەوەشدا بە تەواوی لە سەریاڵ تووڕە و بێتاقەت بوو، چون بەبێ پرس ڕۆییوە و بەهایەکی بۆ مامۆستا دانەناوە. ئینجا لە بری ئەوەی داوای لێبوردن بکا نامەیەکی دوو سێ دێڕی سارد و سڕی ناردووە و دەڵێ دایکم نەخۆشە. جگە لەمەش ئەم هەموو کاتە مامۆستای لە بەرر دەرگا و لە ژوورێ ڕاگرت و دواتریش بەم شێوازە نەشیاوە ڕۆیی! حەکیم سوهەیل خێرا قەڵەم و کاغەزەکەی دەرێنا و دووبارە نامەیەکی گلەیی بۆ سەریاڵ نووسیەوە و هیواشی خواست دایکی باشتر بووبێ، گوتیشی کە هەر لەگەڵ چاتر بوونی ئەودا پێویستە بە زوویی بگەڕێیتەوە حیکمەتخانە.

لەبەر تێکچوونی دۆخی دڵی هەواڵی بۆ قوتابیەکانی نارد کە جارێ نەگەڕێنەوە و خێزانەکەشی نەهێنایەوە لە ماڵی باوکی.

دوای چەند ڕۆژێ دووبارە نامەیەك لە سەریاڵەوە گەیشتە دەستی و بە پەرۆشیەوە کردیەوە، لێ ئەو دەمەی نووسینەکەی ناوی بینی خێرا لە شوێنی خۆیدا بەوێنەی کەسێکی سەراسیمە ڕەق ڕاوەستا. سەریاڵ لەو نامەیەدا نووسیبووی: ببوورە مامۆستا، ئێمە ناگەڕێینەوە حیکمەتخانە و لەگەڵ ئاڕتیندا بڕیارمان داوە

چیدی نەخوێنین. هیچ هۆکارێك لە پشتی ئەم کارەوە نییە، تەنێ حەزمان لە خوێندن نەماوە و ناتوانین چیدی لە حیکمەتخانە بین. تکایە زۆریمان لێ مەکە و بە ئاسایی وەری بگرە، چون دڵنیابە هەرچی بکەی پەژیوان نابینەوە و ماڵەوەشمان لەم کارە گەیاندووە و شتەکە بڕاوەتەوە.

هەوڵ دەدەین لێرە کارێك بدۆزینەوە و ئینشاڵڵا جاروباریش سەر لە یەکدی دەدەین..... خودات لەگەڵ.

سوهەیلی حەکیم لەگەڵ بینینی ئەم نامەیەدا بە تەواوی سامگرتی بوو، خێرا سەری سووڕا و تاوەکو بەر نەبێتەوە لە شوێنی خۆیدا ڕوونیشت و خەمەکان بەربینیان[1] گرت. دوای کەمێ لە ڕوونیشتن و تێڕامان لە نامەکە ژانێکی توند هاتە سەری و بە پشتێدا پاڵکەوت و دڵۆپ دڵۆپ ئەسرینی چاوانی وێنەی جۆگەلە دەهاتنە خوارێ و کوڵمەکانی تەڕ دەکرد. دەمێکی تەواو هیچی بۆ نەگوترا، دووبارە چاوی لە قیدار دەگێڕا و بوونی نەبوو. لەپڕدا بە دەنگێکی تۆزێ بەرز لە پڕمەی گریانی دا و هەتا توانای هەبوو گریا.

حەکیم سوهەیل لە تەنیایی و لەنێو خەمە قووڵەکانیدا پڕ بە دەنگ و دڵی دەگریا.

---

(١) بەربین: قورقوڕاگە لە دیوی دەرەوە.

لەلایەك هەستی بە تاوانێکی گەورە دەکرد کە کارێکی وای لەگەڵ سەریاڵ ئەنجام داوە و لەلایەکیش خەیاڵی لەدەست دانی لاوەکان هێندەی چیایەکی مەزن لەسەر شانی قورس بوو. جگە لەمەش تەنیایی و نەهاتنی هەواڵێك لە حەکیم دانیال یاوەخۆ قیدارەوە ئازارەکەی چەند هێندە دەکردەوە. ناوە ناوە لەبەر خۆیەوە دەهاتە قسە و دەیگوت:

ئاخر بۆچی؟ بۆچی کاکە بەم چەشنە لە تەنهاییدا جێم دەهێڵن بۆ؟ ئەم هەموو خۆشەویستی و برایەتیە بەرەو کێ ڕۆیی و چی لێهات؟! مەگەر نەتان دەگوت مامۆستا ئێمە یەك خێزانین و ئاوا ئاسان بەجێت ناهێڵین! بۆچی بەڵێنەکەتان نەبردە سەر بۆ؟ ئاخر بۆچی بێوەفاییم لەگەڵ دەکەن و هاوڕێ لەگەڵ ئەم هەموو خەمەدا جێم دێڵن؟ لەبەر ئێوە حیکمەتخانەم دانا، بەرگەی ئەم هەموو گوتە ناخۆشانەی کاك جەمشیدم گرت. گەر لەبەر خاتری خوێندنی ئێوە نەبا ڕۆژێك لە خانوو و جێگای ئەم مرۆڤە قرچۆکەدا نەمدەسووڕاند. هەرچی خۆشەویستی و ئەوین مابوو لە دڵمدا بە ئێوەم بەخشی تا ببنە حەکیم، ئێستا ئێوە ئاواتەکانی من لەگۆڕ دەنێن، ئاخر بۆ وادەکەن بۆ؟!

هەرگیز ڕێگە نادەم بڕۆن و پەشیمانتان دەکەمەوە، بەڵێ دڵنیام دەتوانم پەشیمانیان بکەمەوە دڵنیام. دڵنیام لەوەی سەریاڵ جێم ناهێڵێ، بەڵێ ئەو برای خۆی زۆر خۆشدەوێ.

قابیلە لە کاتێکا دەزانێ من هەر ئەو برا بچووکەم هەیە ئاوا لەنێو خەماندا نغرۆم بکا و بڕوا، نا نا ئەو هەرگیز ئاوا بێوەفا نییە هەرگیز. قابیلە ئەو هەموو خۆشەویستی و سۆز و وەفا وجوانیە لەیاد بکا؟ هەرگیز واناکا، بەڵێ هەرگیز واناکا. ئەی باشە ئاڕتین، ئەو کوڕە دەزانی منی چەند خۆشدەوێ، چۆن هێندە بە ئاسانی دەستم لێ هەڵدەگرێ، خۆ ئێمە دەیان یادگاریمان بەیەکەوە هەیە. نا نا دڵنیام ئەوە قسەیەکی کاتیە کردوویانە و پەژیوان دەبنەوە. هەر ئەوەندەی بیان بینم پەژیوانیان دەکەمەوە. ئەوان دەبن بە حەکیم، بەڵێ دەبێ ببن بە حەکیم و بە دەستەکانی خۆم جلی حیکمەتیان لەبەر بکەم.

مامۆستا تا شەوی لێداهات لەماڵێدا نەچوویە دەر و بە تەنیایی لەنێو ئەو ئازارە قووڵەدا مایەوە. هێندە بێهێز بوو بوو کە توانای هیچ شتێکی نەمابوو، تەنانەت نەیدەتوانی هەڵسێ گۆڵمێ ئاو بە چاوەکانیدا بکا و فرمێسکەکانی بسڕێ. ئەی ئەو شەوە دوور و درێژەی زستان بەم ئازارەوە چۆن بەڕێ دەکرێ! نە چاوانی دەچوویە خەو و نە لە بێداریشدا خۆشیەك بەدی دەکرا. خۆزگە دەتوانرا هەندێ کات خەو بە پارە بکڕدرێ، ئاخر ئەو دەمەی ئازار لەنێو دڵەکاندا هەیە هیچ شتێك لە بێداری ناخۆشتر نییە. بەڵێ ئەو دەمانەی بەهۆشبوون ئازارت دەدا خەوتن چاکترین کارێکە بیکەی.

سوهەیل دەترسا دووبارە نەخۆشی دەروونی ڕووی لێ بکاتەوە یاوەخۆ جەڵتەیەك لێی بدا و لە تەنیاییدا بمرێ. هەستی

دەکرد ئازارەکەی لەنێو دڵیدا هێندە زۆرە کە بەرگەی ناگرێ و لەوانەیە لە هەر کاتێکدا دڵی بتەقێنێ. زوو زوو پەنای بۆ پەرستش و نزاکان دەبرد و تاکە هۆکار بوو کە لەم شەوە خەماوی و تەماویەدا کەمێ ئارامی پێ ببەخشن.

جار نا جارێ هاواری دەکرد: قیداااااار.... کوڕە لەکوێی قیدااار. هەتیو لە هەموو خۆشیەکاندا دێی و لەکاتی ناخۆشیدا ون دەبی. وەرە و داوای لێبوردنت لێ دەکەم، بمبوورە برا کە لەسەر سەریاڵ تووڕەم کردی. وەرە ببینە کە چۆن بە تەنیایی جێم دەهێڵن، وەرە سەیرکە چیان بەسەر هاوڕێ و براکەتدا هێنا. کورە ئاخر بۆ دیارنی بۆ؟ دە وەرە ببینە چۆن قسەکەت وەڕاست گەڕا کە گوتت جێت دەهێڵن. ئاخر برا چۆن برای خۆی لەناخۆشیدا جێ دەهێڵێ چۆن؟!

ئەو شەوە سوهەیلی حەکیم خۆشی نەیزانی چۆن چۆنی بەیانی کردەوە، ئەو هۆشی نەبوو، لە هەمان کاتدا بۆ تاوێکیش چاوی نەچووبوویە خەو. بەیانی زوو بەرەو حیکمەتخانەکە ڕۆیی و چوویە ژوورەکەی خۆی کە سەریاڵ و ئارتین تێیدا دەمانەوە. ئەو دەمەی ڕوانی هەندێ لە کەلوپەل و جلەکانی سەریاڵ لەوێدا مابوون بەرگەی نەگرت و خێرا چوویەوە دەرێ. لەو دەمەدا کەریم لەنێو حەوشەی حیکمەتخانەکەدا پەیدابوو. دیاربوو تازە هاتبوویەوە و دەیهەویست تەندروستی مامۆستا بزانێ، وەلێ مامۆستا لەبەر کەم توانایی نەیتوانی هێندە بیدوێنێ و خێرا وەڕێ



کەوتەوە ماڵێ. دوای کەمێك تەقەی دەرگاکە هات و بەحاڵ چوو کردیەوە و ڕوانی کەریمە.

+ چیت دەوێ کەریم گیان، شتێکت پێویستە؟

- هیچم پێویست نییە مامۆستا، وەلێ سەریاڵ و ئاڕتین بە بارکێش[1] و گالیسکەیەکەوە هاتوون تاوەکو کەلوپەلەکانی خۆیان بەرنەوە. هەرچەندی داوایان لێدەکەم کە نەڕۆن گوێم پێ نادەن و نازانم چی بکەم، هاتم جەنابت ئاگادارکەمەوە نەکا ئاگادار نەبی.

حەکیم سوهەیل لەگەڵ ئەم قسەیەدا بەرچاوەکانی تاریك بوون و خەریك بوو بکەوێ بەزەویدا، لێ کەریم زوو قۆڵی مامۆستای گرت و داینیشاند. خێرا چوویە ژووری و بادیەك ئاوی بۆ هێنا و هێنایەوە سەر خۆی.

ئەو دەمەی مامۆستا هاتەوە خۆ بەحاڵ گوتی: جێم بهێڵە کەریم گیان ئیدی من باشم.

- وەلێ مامۆستا تەندروستیت هیچ لەباش ناچێ و ڕەنگت زۆر سپی بووە، چۆن ئاوات جێ بێڵم؟

+ جێم بێڵە و بڕۆ، تەواو هەواڵەکەت گەیاند و خودا خێرت بنووسێ.

---

(١) بارکێش: وڵاخ

- ئەوان چاوەڕێتن ماڵئاواییت لێ بکەن، پێت دەکرێ بێیتە حیکمەتخانە یان بەوان بڵێم بێنە ئێرە قوربان؟

مامۆستا بە دڵێکی کوڵاو و پڕ لە ژانەوە کە بە زۆر قسەی بۆ دەکرا گوتی:

پێیان بڵێ پێویستیم بە ماڵئاوایی ئەوان نییە و نامەوێ بیان بینم.

لەو دەمەدا کەریم حەکیم سوهەیلی جێهێشت و چوویەوە لای لاوەکان و پێی گوتن کە مامۆستا نایەوێ بیان بینێ، ئەوانیش بەبێ دەنگی کەلوپەلەکانیان تێك نا و دەستیان بە ڕۆیشتن کرد و هیچ هەوڵێکیان نەدا بۆ ئەوەی ماڵئاوایی دواجار لە مامۆستا بکەن. لەڕاستیدا مامۆستا هێندەی خۆشدەویستن دەترسا ئەگەر گوێبیستی دواین ماڵئاوایی بێ بەرگە نەگرێ و دڵی لە لێدان بکەوێ. بەڵێ ئەو دەیزانی توانای بینینی تراژیدیایەکی تری ماڵئاوایی نەماوە و نابێ هەرگیز لەم دیمەنە بڕوانێ. ئەو هێندە خەمی مەرگی خۆی لەدڵدا نەبوو، وەلێ بیری لەوە دەکردەوە ئەگەر من نەمێنم خێزانەکەم کە تازە بووکە تەنیا دەمێنێتەوە و ئەو منداڵەی سکیشی بێ باوك و بێ ناز دەکەوێ.

مامۆستا لەبەر خاتری خێزان و منداڵەکەی دەیهەویست بژی، دەنا هیوایەکی وەهای بۆ ژیان نەمابوو. دوای کەمێك وایزانی لاوەکان ڕۆیشتوون و لەتاو ئازارەکەی ویستی بێتە بەر دەرگا،



وەلێ ئەو دەمەی دەرگاکەی واڵاکرد چی بینی! ئەسپ و گالیسکەی دوو لاوەکە بە بەردەمیدا تێپەڕی و ئەو کاتەی مامۆستایان دیت خێرا ئاڕتین لەبەردەم ماڵەکەیاندا وەستا و بەبێ ئەوەی بێنە خوارەوە گوتی: خودات لەگەڵ مامۆستا.....

مامۆستا دڵی وەکو مەنجەڵ لەسەر ئاگر دەکوڵا و هەموو هەناوی سووتابوو، بە دەنگێکی کزۆڵ و غەمبارەوە کە دەتگوت نێڵەیە[1] و لەنێو سینەی دێتە دەرێ گوتی:

منتان کوشت، سوێند بە حەکیمی مەزن منتان کوشت. ئەو بێوەفاییە قەت لەبیر ناکەم قەت. تا هەتایی ئەم برینە لەسەر دڵم دەمێنێتەوە. ئەوە وەفاکەتان بوو کە بەم چەشنە مامۆستاکەتان لەنێو ئێش و ئازاری مەرگدا جێ بهێڵن و بیکوژن!

مامۆستا ئەو چەند دێڕەی گوت و لەوە پتر قسەی بۆ نەگوترا و سەریاڵ گوتی:

لێی بخورە ئاڕتین با درەنگ نەکەوین. ئاڕتین کە جڵەوی ئەسپەکەی لەدەست دابوو هەر سەیری مامۆستای دەکرد و دەتگوت شتێکی لەنێو دڵ دایە و بەزەیی بە مامۆستادا دێتەوە، لێ لەبەر سەریاڵ چی نەدەگوت. لەو دەمەدا سەریاڵ پێنووسەکەی دەرێنا و شتێکی بۆ مامۆستا نووسی و لەسەر زەویەکە داینا

---

(١) نێڵە: کڵپەی ئاگر

و بەخێرایی ئاڕتین جڵەوی ئەسپەکەی ڕاکێشا و لەوێدا دوور کەوتنەوە.

تا لەبەر چاوان ون بوون مامۆستا تێی ڕوانین و جەرگی بەم دیمەنە بە چەشنێ وەئێش هاتبوو کە دەتگوت کۆتا ڕۆژی ژیانیەتی. خێرا بەحاڵ دەستی دا کاغەزەکە و چوویەوە ماڵ و لەسەر پشتێ درێژبوو. ئەو دەمەی ڕوانی لەسەر کاغەزەکە نووسرابوو:

نەمدەویست پێت بڵێم، وەلێ بەداخەوە خیانەتێکی زۆر گەورەت لێکردم، ئەوە تۆ بووی منت کوشت نەك من، من تۆم لەجێی کەس و کاری خۆم دانابوو بەڵام بەداخەوە.

ئێستا ئاڕتینیش ئەوە دەزانێ و ئیدی تا هەتایە خودات لەگەڵ...

مامۆستا کە ئەم نووسراوەی بینی هێندەی دی حاڵی شێواو لەتاو ئازاری هەناوی خێرا هەڵسایەوە پێ و بە هەموو هێزیەوە دەستەکانی بە نێوچاوانیدا دەکێشا. ئازارەکە لە سینەیدا هێندە زۆربوو لەگەڵ ئەم هەموو بێتاقەتیەیدا نەیدەتوانی ڕووبنیشێ و لەنێو ماڵەکەدا ئەمسەر و ئەوسەری دەکرد. ئەو لەگەڵ لەدەست دانی دوو لاوەکەدا هەستی بە تاوانباریەکی زۆر دەکرد کە کارێکی لەم چەشنەی بەرامبەر سەریاڵی برا بچووکی ئەنجام داوە. بە هەناسە بڕکێوە هاواری لە حەکیمی مەزن دەکرد بە هانایەوە بێ و لەم مەرگە سەختەدا ڕزگاری بکا و گیانی

بكێشێ و دەیگوت: هاوار بۆ تۆ حەكیمی مەزن، لە سەختترین كاتی ژیانمدا هەر تۆم هەیە بە هانامەوە بێی و كەسی دی شك نابەم. ئەی هاوار لەم كارەساتە گەورەیە، هاوار لەم مردنە سەختە، ئاخر من بەرگەی ڕۆیشتنی ئەوانم لە حاڵەتی خۆشیشدا نەدەگرت و نەمدەتوانی هەر بە خەیاڵیشی دا بێنم، چ جای ئەوەی بەم ناخۆشیەوە بڕۆن. من لە چەند ڕۆژێكی كەمی گەڕانەوە بۆ ماڵیاندا بێتاقەت دەبووم و بیرم دەكردن ئێستا چۆن دەتوانم بەرگەی ئەمە بگرم چۆن؟

ئەوان تا هەتایە بە خراپەكار من دەبینن و نەفرەتم لێدەكەن لە كاتێكدا پێشتر مامۆستای خۆشەویستیان بووم، برایان بووم، باوكیان بووم. ئەی حەكیمی مەزن لەم ئازارە دەرم بێنە، هاوار بۆ تۆ لەم ئازارە دەرم بێنە. ئیدی دەمەوێ بگەڕێمەوە لات و توانای ژیان كردنم نەماوە، سوێند بە گەورەیی تۆ توانام نەماوە و هەموو هەناوم سووتا و پارچەیەكم بە ساغی لێ دەرنەچووە. لەگەڵ ئەم گریان و ئازارەدا بەردەوام یادی حەكیمی مەزنی دەكرد و هانای بۆ دەبرد. ئەمە ناخۆشترین ساتەكانی حەكیم سوهەیل بوو لە هەموو ژیانیدا، چون هەرچی تین و تاقەتی لاشەی بوو نەمابوو. دەتگوت ئاگرێكی لە ئاگرەكەی ئیبراهیم پەیامبەر مەزنتر لەنێو جەستە و دڵیدا كراوەتەوە. ئاگرێك كە تین و كڵپەكەی هێندە بەهێز بوو خەریك بوو تەواوی دار و دیواری ماڵەكەش لەگەڵ خۆیدا بسووتێنێ، نزیك بوو لەوەی هەرچی كەلوپەلی ماڵەكە



هەیە بەهۆی ئەم گڕەوە بە فەتارەت بچێ و بتوێتەوە. ئازاری سەریاڵ لە هەموو ئازارەکانی تر بەئێش تربوو، چون پێشووتر مامۆستا توانای بەرگە گرتنی مابوو، دەیتوانی بە شێوازێك لە شێوازەکان بەسەر ئێشەکەیدا زاڵ ببێ، لێ ئێستا تەواوی وزە و تواناکانی سفڕ ببوونەوە و بەوپەڕی لاوازیەوە چاوەڕێی هاتنی مەرگی دەکرد. چاوەکانی هێندە ئەسرینیان ڕشتبوو لە سووریدا مرۆڤ لێیان هەڵدەهات. هەستی دەکرد فرمێسکی چاوەکانی خەریکە نامێنن و لەوەیە لەبری فرمێسکەکان ئیدی خوێن بێتە خوارێ و تەواوی ژوورەکە خوێناوی بکا.

ئەمە ئازارێك بوو ئەگەر سەد جار لەدوای یەك فریشتەی گیان کێشان هاتبا و گیانی لێ وەرگرتبا و زیندووی کردبایەوە هێشتا بارتەقای ئەم سووتانەی نەدەکرد.

ئازارێك بوو کە دەتگوت هەزاران پاڵەوان لە یەك کاتدا شمشێرەکانیان لەسەر دڵی مامۆستادا دەچەقێنن و دەری دێننەوە. ئەمە ئازارێك بوو کە هەر مامۆستا خۆی دەیزانی و بەس. سوهەیلی حەکیم لەتاو برینەکەی هێندە هاتووچۆی لە ژوورەکەدا کرد وای لێهاتبوو بەردەمی خۆی نەدەبینی و دونیا لەلای چەپ و چێڕ[1] دەبوویەوە، لەنکاودا خۆی بە دیوارەکەدا کێشا و پشتا و پشت کەوتە خوارێ. پشتە سەری بەر زەویەکە کەوت و

---

(١) چەپ و چێڕ: سەراوگێڕ، ئاوەژۆ.



دەنگێکی گەورەی لێوە هات و لەهۆش خۆی چوو. هەر هێندەی زانی کەسێك لەژێر سەریەوە خەریکە بانگی دەکا و بەهۆشی دێنێتەوە، ئەو دەمەی بە جوانی لە کەسەکە ڕاما زانی قیدارە، خێرا بە دەنگێکی کزۆڵەوە کە بە زەحمەت دەبیسترا گوتی:

+ بێوەفا تازە دێی؟ ئاوا زوو لە یادت کردم ها؟

- گلەیی لە من مەکە حەکیم سوهەیل، نەیان دەهێشت بێمە لات.

+ کێ ڕێگری لێ دەکردی؟ دەزانی کۆتاییەکانی ژیانمە بۆیە هاتووی؟

- واز لەم گوتانە بێنە حەکیم گیان، هاتووم داوای لێبوردنت لێ بکەم، چون کارێکی زۆر هەڵەم ئەنجام داوە بەرامبەرت.

حەکیم سوهەیل ناڵەیەکی کرد و بە دەنگێکی تۆزێ بەرزتر لە جاران گوتی:

چیت کردووە قیدار؟

- بەداخەوە فێڵێکی گەورەت لێ کرا حەکیم سوهەیل، لە کۆتاییدا سەواد ئەوەی دەیهەویست ئەنجامی دا و تۆ و سەریاڵی لە یەکتر کرد، منیش لەم ناوەدا تاوانبارم و هاتووم داوای لێبوردن بکەم.



لەگەڵ ئەم قسەیەدا حەکیم لە شوێنی خۆیدا ڕاست بوویەوە و ڕوونیشت، گرژی و تووڕەییەکی زۆر لە نێوچاوانی بەدی دەکرا و خێرا گوتی: بەر لەوەی بمرم قیدار، پێم بڵێ ئەم فێڵە چۆن ئەنجام درا؟ تۆ چیت کردووە؟

- ئەوان نەیانتوانی ڕووبەڕوو لە یەکترتان بکەن، وەلێ سەواد فێڵێکی سەیری دۆزیەوە و ئەویش لە ڕێگای خەون بوو. ئەو کەسەی بینیت حەکیم دانیال نەبوو سوهەیل گیان، بەڵکو یەکێك بوو لە جنۆکە بێ باوەڕەکان و فێڵی لێکردی.

سوهەیل بە سەرسوڕمانەوە: ئەوان چۆن توانیان ئەوە بکەن؟!

- ئەو شەوە تۆ هێندێك غافڵ بووی و تۆزێ لە خۆ بە گەورەزانی کەوتە دڵتەوە، ئەمەش ڕێگای خۆشکرد ئاسانتر لێت نزیك بکەونەوە و بتخەنە تەڵەکەوە. من ئەو کاتە بیستم بەتەمای شتێکی وان، وەلێ هێندە تووڕەبووم لە سەریاڵ ئاگادارم نەکردیەوە و پێم خۆشبوو ئەو کارە ڕوویدا. ئەو دەنگە من بووم کە گوتم بڕۆ ئەنجامی بدە و دوو دڵ مەبە، من ئەم کارەم لە پێناوی تۆدا کرد بۆ ئەوەی سەریاڵ لە ژیانت نەمێنێ و چیدی خەمی پێوە نەخۆی، چون ماوەیەك بوو دەمزانی لە هێندێ کاری سەرەکیش دوور کەوتبوویەوە و غافڵ بوو بووی. ئەو ڕۆژەی ڕۆیشتم لەلات بیرم کردەوە بە چ ڕێگایەك وابکەم سەریاڵ لێرە بڕوا و تۆش بێیتەوە سەرخۆت، دواتر کە بیستم سەواد بەتەمای

شتێکی وایە منیش لە ڕێگای دەنگم هانم دای و پێم وابوو ئەمە تاکە ڕێگایە بۆ ئەوەی سەریاڵ لەتۆ دووركەوێتەوە و بڕوا. ئاخر ئەگەر لێت دابا و جنێویشت پێدابا و هەر چیت کردبا سەرەنجام هەر دەهاتەوە، وەلێ ئەمە تاکە ڕێیەك بوو کە ئیدی نەگەڕێتەوە و ئەمەشم لەبەر خاتری تۆ کرد. ئەو کاتەی تووشی ئەو ئازارە هاتی ویستم بێمە لات، وەلێ مامۆستا جنیەکەم کە بەم کارەی زانی ڕێگری لێ کردم و چەند کارێکی تری پێ سپاردم. ئێستاش بە ئەندازەی هەموو دونیا پەشیمانم و هاتووم داوای لێبووردنت لێ بکەم. لەڕاستیدا من گوتم هەر چەند ڕۆژێکە و لە یادی دەچێتەوە، لێ کە زانیم حاڵت ئاوا خراپە زۆر پەژیوان بوومەوە.

مامۆستا کە ئەم قسانەی بیست وەك ئەوەی مسی تواوەی پێداکەن خێرا لەشوێنی خۆیدا قیت بوویەوە و تووڕەیی لە چاویدا دەباری، دەتگوت بەر لە مردنی جۆرە هێزێکیان پێ بەخشیوە تاوەکو ئەو کارەی ماویەتی ئەنجامی بدا و دواتر ڕۆحەکەی لێ وەرگرنەوە.

بە تووڕەییەکی زۆرەوە ڕووی لە قیدار کرد و گوتی: خیانەتت لێ کردم؟! قیدار لە کۆتاییدا خیانەتت لێ کردم ناکەس.

- تکایە سوهەیل گیان خۆت ئازار مەدە، سوێند بە حەکیمی مەزن ئەمە تاکە ڕێگابوو بۆ ڕۆیشتنی ئەو، ئێستاش هاتووم داوای لێبووردن بکەم کاکە من پەشیمانم، خۆ ئەگەر من ئەو دەنگەشم نەکردبا تۆ بەهۆی خەونەکەوە هەر بۆ دەرگاکە دەچووی.

+ نەخێر درۆ مەکە، ئەوە تۆ بووی هانت دام، تۆ بێباوەڕ بوویت و هەڵگەڕاویتەوە و بوویتە دار و دەستەی سەوادی ناکەس بەچە، بڕۆ لەگەڵ ئەودا چیتان پێدەکرێ بیکەن.

- نەخێر من باوەڕدارم حەکیم سوهەیل، هەرگیز لە باوەڕەکەی خۆم پاشگەز نابمەوە، لێ هەڵەیەکم کردووە و بمبەخشە. وەك چۆن ئێوەی مرۆڤ هەڵە دەکەن ئێمەش دەیکەین و پارێزراو نیین لێی.

+ هەڵەی لەم جۆرە قیدار، هەڵەی لەم جۆرە کە بمکوژی؟ خەریکە بەهۆی هەڵەکەتەوە ڕۆحێك بە فەتارەت دەڕوا، جەرگێك پوواو[1] دەبێ. من لەناوچووم، سوێند بە حەکیمی مەزن لەناوچووم، هەر خوا دەزانێ ئێستا دڵی سەریاڵیش چەند بە ئازارە. بڕۆ ئیتر لەژیانم نەتبینمەوە، بڕۆ لەمەودوا لەگەڵ سەواد کاربکە و یارمەتی ئەو بدە، خوا دەزانێ لە کەیەوە لە پلان دان بۆ لێك کردنی من و سەریاڵ.

قیدار کە ئەم قسانەی بیست زۆر تووڕە بوو و گوتی: دیارە وا باشتر بووە ئێوە لێك بترازێن، بەداخەوە کە بەم چەشنە قسە لەگەڵ من دەکەی حەکیم سوهەیل. ئەو دەمەی من هاوڕێت بووم ئەو لاوانە لەکوێ بوون ها؟

---

(١) پوواو: ڕزیو



سوهەیلی حەکیم لە تووڕەییدا سپیاتیەکەی ڕووی سوور ببوویەوە و دەتگوت خوێناوی لە ڕوخساری هەڵسووە، لەگەڵ بیستنی ئەم قسەیەی قیداردا خێرا بۆی چوو تاوەکو لێی بدا، لێ قیدار خۆی ون کرد و لەدواوەی پەیدا بوویەوە. ئەمجارە دەستی برد بۆ بادیە ئاو و چەند کەلوپەلێکی ماڵ و بە هەموو هێزیەوە ڕایدەوەشاند، لێ هیچیان بەر قیدار نەدەکەوتن.

قیدار هاتە دەنگ: تکایە هێور بەوە قوربان وامەکە، ناتوانی لێم بدەی من مرۆڤ نییم، ئەی هاوار کەلوپەلەکان ئاوا بەیەك دامەدە و بەزەییت بەخۆتدا بێتەوە و لێم تێبگە. ئاخر ویستم خەمی ئەو لاوەت لەکۆڵ بکەمەوە و نەمزانی برینەکەت ئاوا سەختتر دەبێ.

حەکیم سوهەیل کە زانی ناتوانێ لێی بدا و بە تەواوی ماندوو بووە و سەری سووڕا، لە شوێنی خۆیدا ڕوونیشتەوە و گوتی: چەند جارم پێت گوت قیدار دژایەتی ئەم کوڕە مەکە، کوڕە مەیکە کاکە، هەر ڕانەوەستای و کردت تا منت بەم حاڵە گەیاند.

- خەتای خۆت بوو حەکیم سوهەیل خەتای خۆت بوو، هەزار جار گوتم هێندە گرنگیان پێ مەدە، کاکە هێندە خۆشیانت نەوێ، ئاخر قوتابی بێوەفایە و هەر ئەوەندەی ڕۆیی لەلات هەر هەمووی بیر دەچێتەوە. فەرموو ئەوە لەسەر هەڵەیەك جێیان هێشتی و تۆیان کوشت، هەموو خۆشەویستیەکەش بوویە ڕق

و تا هەتایی ڕقیان لێتە. دەتگوت نا نا ئەوان قەت جێم ناهێڵن، ئەوان مامۆستای خۆیان خۆشدەوێ و سەریاڵ برای بچووکی منە و دڵی نایێ ئازارم دا. دەمزانی ئەو ڕۆژە بە چاوی خۆت دەبینی کە جێت دێڵن و هیچ باکیشیان پێت نییە.

سوهەیل لەگەڵ ئەم قسانەدا هێندەی دی هەناوی بەژان هاتبوو، بە چەشنێ کە جەستەی لەگەڵی دەجما و خۆی ڕانەدەگرت. دووبارە ڕووی لە قیدار کردەوە و گوتی:

تۆ بزانی، خیانەتەکەی تۆ بزانێ.

- نەخێر حەکیم سوهەیل، ئەو دەنگەی منیش نەبا سەواد هەر کاری خۆی کردبوو بە خەونەکە، لێ ئەوان ئەگەر هێندەیان خۆشدەویستی وەکو دەتگوت بۆچی لەسەر هەڵەیەك ئاوا جێیان هێشتی و ڕقیان لێت هەڵگرت، لە کاتێکدا یەك دونیا سۆز و وەفا و خۆشەویستی و شتی سەرسوڕهێنەریان لە تۆ دیبوو. چەندین مانگ بە یەکەوە لەیەك ژووردا ژیابوون. دەبوایە بە عەقڵ بڕیاریان دابا کە دەبێ شتێك لە گۆڕێ بێ و ئەم کارە هەرگیز لە مامۆستا ناوەشێتەوە. ئەو چاکانەی تۆ کردووتە لەگەڵیان هەتا دونیا دونیایە هیچ مامۆستایەك لەگەڵ هیچ قوتابییەکدا نایکاتەوە. تەماشاکە تەنیا بە هەڵەیەك هەموو باشییەکانت، هەموو چاکەکانت، هەموو خۆشەویستی و وەفایەکەت، هەموو برایەتی و نەرم و نیانیەکەت بۆیان سفرِ بوویەوە! بیرکەوە چۆن



ئەو هەموو باشی و وەفا و جوانیەیان لەیاد کرد تەنیا بە هەڵەیەك. ئەمە بێ ئەمەکیە حەکیم سوهەیل بێ ئەمەکی. ئەگەر وەفایان هەبا جێیان نەدەهێشتی و هەزاران بیانوویان بۆ دەدۆزیەوە و ئەم هەموو خۆشەویستیەیان نەدەکردە ڕق. دەبینی چۆن لە یەك چاوترووکان ئەوپەڕی خۆشەویستی گۆڕا بۆ ڕق؟ لەمەودوا خەڵك بناسە و چیدی هێندە گرنگی بە کەس مەدە.

سوهەیل بە چاوی پڕ گریانەوە: بڕوا ناکەم، ئێستاش بڕوا ناکەم ئەوان بەم جۆرە جێیان هێشتم! ئەوان لێرەن قیدار، دڵنیابە لێرەن. هێشتا لێرەن و دەبێ ئاگاداریان بم. ڕاستە هەڵەکە زۆر خراپ بوو، وەلێ پێم بڵێ چۆن ئەم هەموو جوانیەی ڕابردوو لەیاد کرا! ئەی هاوار چۆن لەیاد کرا!

- نموونەیەکت بۆ دەگێڕمەوە کە لەوەیە پێشووتریش بیستبت، لێ ئەمە تەنیا بیرخستنەوەیە. جارێکیان شەمسی تەبریزی میوانی مەولانا دەبێ و داوای کوپێك شەڕابی لێ دەکا. مەولانای ڕۆمی مەلایەکی گەورەی ناوچەکە بوو کە هەموو خەڵکی خۆشیان دەویست و بەردەوام لە وتارەکانی ئامادە بوون و بە گەورە و بایەخەوە لێی دەدوان و شەرمیان لێی دەکرد. مەولانا بە شەمس دەڵێ شەڕاب لە ماڵەکەی مندا نییە، چون ئاین حەڕامی کردووە، وەلێ شەمس پێداگر دەبێ کە پێویستە گۆزەیەکی بۆ پەیدا بکا. مەولانا هەرچەندە دەزانێ شەڕاب حەڕامە، وەلێ ئەوەش دەزانێ کە شەمس عاریفێکی گەورەیە و لەخۆوە ئەم قسەیە ناکا و

دەبێ شتێك لە پشتی ئەمەوە هەبێ. بۆیە بەبێ دوو دڵی ڕوو لە دوکانی شەڕاب فرۆش دەکا و گۆزەیەك دەسەنێ. ئەو دەمەی خەڵکەکە دەیبینن یەك یەکە دوای دەکەون و هەزاران قسەی نەشیاو و جنێوی پێ دەدەن کە چەند ساڵە مەولانا ئەم خەڵکەی خەڵەتاندووە و لە کۆتاییشدا شەڕاب خۆر دەرچوو.

تەنانەت دەگاتە ئەوەی مێزەرەکەی لەسەر دەکەنەوە و لێی دەدەن و ئازاری پێ دەگەیەنن. لەو کاتەدا کە شەڕابەکەی لێ دەسەنن و سەیری دەکەن نێوەکەی سرکەی تێدایە، خێرا هەموو پەژیوان دەبنەوە و دەستی ماچ دەکەن و داوای لێبوردنی لێ دەکەن.

ڕێك لەم ساتەدا شەمس بە مەولانا دەڵێ: ویستم پێت نیشان بدەم کە بە زانستەکەت و بەدەست هێنانی خۆشەویستی خەڵکی نەخەڵەتێی. بینیت چۆن لە یەك چرکەدا هەر هەموو خۆشەویستیەکە سفڕ بوویەوە و چۆن دژایەتیان کردی؟!

حەکیم گیان من ناڵێم سەریاڵ و ئاڕتین کەسی خراپن، بگرە مرۆی باشن و زۆریش باوەڕدارن، وەلێ دەبوونە هۆی ئازاردانت لێم تێبگە. تۆ کەسێکی گەورەی تکایە مەڕووخێ و لێم تێبگە.

+ بڕۆ قیدار لەبەر چاوم، نموونەکەت جوانە، وەلێ کارێکی هێندە خراپت ئەنجام داوە بە دەست تێکەڵ کردنت لەگەڵ سەوادی نەفرەتیدا نامەوێ چیدی بتبینمەوە. من هەڵەیەکی گەورەم کرد و دەبێ باجەکەشی بدەم و خەتای ئەم لاوانە نییە، تۆش باجی

هەڵەکەت بدە و چیدی مەیەرەوە بۆ لام و لەوانەیە ئەوە دوا ساتەکانی من بێ.

قیدار بە نیگەرانیەوە: لێم خۆشبە حەکیم گیان لێم خۆشبە، سوێندت بۆ دەخۆم پەشیمانم سوێند، تکایە نامەوێ شتێکت لێ بەسەر بێ و لەمن خۆش نەبووبی.

+ پیوار[1] بە قیدار، ئەمە دوا دیدارمانە و ئەگەر جارێکی تر بتبینم ئەم ڕووداوەم دێتەوە یاد و زیاتر جەرگم پڕی خوێن دەبێ.

- سوهەیل گیان تخوا ئاوا بەڕێم مەکە، سوێند بە حەکیمی مەزن من تۆم خۆشدەوێ.

+ بڕۆ قیدار بڕۆ، هێندە ئازارم هەیە کە نە دەمەوێ بنووم و نە بەخەبەر بم، خۆزگە شتێکی دیکە لەم نێوانەدا هەبا. بڕۆ هەتا لە ژیان ماوم نامەوێ چاوم بە چاوت بکەوێتەوە. ئەگەر خۆشت دەوێم بڕۆ، چونکە هەر جارەی بتبینم دیسانەوە دەسووتێمەوە.

قیدار بە غەمباریەوە: بەر لەوەی بڕۆم، بە ڕێگایەك بە سەریاڵ بڵێ کە ئاگای لەخۆی بێ، دەترسم ئەم نەفرەتیانە بەوەندە وازنەهێنن.

سوهەیل بە تووڕەییەوە: سوێند بێ عەڕشی سەواد و دار و دەستەکەی دەسووتێنم ئەگەر سەریاڵ پەنجەیەکی خوێناوی بێ بەس پەنجەیەك.

---

(١) پیوار: ون، غەیب



قیدار دووبارە بە دەنگێکی تەواو کزۆڵ و غەمبارەوە: یانی هەر دەرم دەکەی سوهەیل گیان؟ ئەی گەر شتێکت لێهات؟

+ تا بمێنیەوە زیاتر ئازار دەچێژم، چەندی زووتر بڕۆی باشترە.

- ئەی ئەو چاکانەی بۆتم کردوون و ئەو یادگاریانەی ڕابردوو لە یاد دەکەی؟!

+ هەموویم لەیادە قیدار، سوپاسی تەواوی چاکەکانت دەکەم و هەمیشە لە هزرمدا دەمێننەوە، وەلێ تا ڕۆژێك ئەم لاوانە نەیەنەوە لام تۆ مەیەرەوە، ئەوە بۆم سووك کردی و ئیدی بڕۆ. هەرچەندە دەشزانم ئەوە کۆتایی منە و ناتوانم کاژێرێکی تر بژیم.

قیدار بە غەمباریەوە سوهەیلی جێهێشت و لەبەر خۆیدا گوتی: جارێ تووڕەیە و دواتر دێم ئاشتی دەکەمەوە.

دوای ڕۆیشتنی قیدار سوهەیل دووبارە سەری سووڕا و ژانە سەرەکەی زۆر لە جاران بەتینتر بوو، لەرزێکی بەهێز سەرپاکی جەستەی داگرت و ویستی زوو بچێ لێفەکە بێنێ، لێ لە ڕێگادا خۆی بە هێندێ کەلوپەل دادا و دووبارە بەربوویەوە. هەستی دەکرد بۆنی سووتانی جەرگ و سینەی تەواوی ژوورەکەی پڕ کردووە و لەوانەیە لە هەر چرکەیەکدا جەڵتەیەك کۆتایی پێ بێنێ. جەستەیەکی سارد و سڕ بە هەناوێکی سووتاوەوە لەسەر



زەویە ساردەکەدا بە تەنیایی و کەنەفتی[١] کەوتبوو کە هەر کەس بیدیبا باوەڕی نەدەکرد گیانی تێدا مابێ. هەستی دەکرد لەگەڵ لەرزینەکەدا هۆشی نامێنێ و وردە وردە دیمەنە ڕەنگاو ڕەنگەکان لەبەر چاوی تەڵخ و ڕەش دەبن. لەبەر خۆیدا بەزۆر توانی چەند وشەیەکی ئیمانی دووپات بکاتەوە، ئینجا بە تەواوی ڕادەستی مەرگ ببێ. مەرگێکی هێندە بە ئازار کە ڕەنگە چەند کەسێك لە جیهان بەر لە مردن لەگەڵ ئەم ئازارەدا دەرگیر بووبن.

لەنکاو هەموو شتێ گۆڕا و سوهەیلی حەکیم ڕوانی وا لە سارایەکی چۆڵ و هۆڵ دایە و دوو مرۆڤی تەواو کامڵ و تەمەن ناوەنجی و باڵا ڕێك و نوورانی کە هەردوو کەوای سپیان لەبەر بوو بەرەو ڕووی دەهاتن. یەکێ لەوان دەتگوت حەکیم دانیالە و گەنج و جوان بۆتەوە، لێ جوانیەکی بێ ئەندازەی هەبوو.

هەر گەیشتن بە سوهەیل خێرا دانەیەکیان ڕووی لێکرد و گوتی: من فریشتەی گیان کێشانم و هاتبووم گیانت بکێشم، لێ چونکە مرۆیەکی باش بوویت و پێشووتر بەردەوام ئێمەت لەیاد بووە حەکیم دانیال هاتووە و تکای بۆ کردووی تەمەنت درێژتر بکەین.

هەرچەندە هیچ وزەیەکت تێدا نەماوە، لێ ئێمە هێندێ وزەت پێ دەبەخشین و دەتوانی هەڵسیتەوە. لەبەر ئەوەی ماوەیەك

---

(١) کەنەفتی: زەبوونی

بوو لێیان بێئاگا بوو بووی زللەیەکی میهرەبانیمان لێدای تاوەکو بەهۆش خۆت بێیتەوە و وریاتر بی لە جاران. هەڵسەوە و تەوبە بکە لە هەڵەکەت و جارێکی تر هێندە بێئاگا مەبە.

سوهەیل لەگەڵ کۆتا قسەی پیاوەکە دووبارە چاوەکانی کردنەوە و هەستی دەکرد دوای مەرگێکی تەواو دووبارە ژیانی بەبەردا کرایەوە، لێ هێشتان لەرزینەکەی کەمێك مابوو. خێرا هەڵسایە پێ و دەستی گەیاندە بادیەکە و چوو پڕی کرد لە ئاو و خواردیەوە، لێ چونکە هەناوی ئێش و سووتانێکی زۆری پێ گەییبوو بە بادیەك ئاو سارد نەبوویەوە و چوو دوو دانەی تریشی خواردەوە. دوای ئەمە خێرا کڕنۆشی سوپاسی بۆ حەکیمی مەزن برد و ئەو شەوە تا بەیانی دەستی بە پەرستش کرد، داوای لە حەکیمی مەزن دەکرد لێی خۆش ببێ و دڵی سەریاڵیش چاك بکاتەوە بەرامبەری. حەکیم سوهەیل ئێش و سووتانەکەی دڵی هەر مابوو، لێ هەستی دەکرد کەمێك لەسەری سووك کراوە و هێندێ لە تینی بۆ گەڕاوەتەوە. بەیانی خێزانەکەی کە هاتەوە و چاوی بە ڕوخساری حەکیم کەوت ئاوا سپی هەڵگەڕاوە و بە چەند شەوێك هێندە لاواز بووە، هێندەی بۆ گریا کە دەترسا بەهۆی ئەم گریان و ئازارەوە منداڵەکەی سکی لەبار بچێ و ئێشی ئەویشی بێتە سەر.

حەکیم سوهەیل ئەم ماوەیە چەندین جار پەیامی بە نامەبەرەکان دەناردە شارەکەی سەریاڵ و هیچ وەڵامێکی ئەو لاوەی پێ

نەدەگەیشتەوە، ئەمەش بە تەواوی بێتاقەتی دەکرد و ژیان و گوزەران لەلای زۆر سەخت بوو بوو، بە جۆرێ کە هێندێ جار ئاواتی دەخواست ئەو ڕۆژە مردبایە و ژیانیان بەبەردا نەکردبایەوە. زۆربەی شەوان وەکو مردوویەك لە جێگاکە دەکەوت و تای دەهاتێ و خێزانەکەی بەدیار سەریەوە دەگریا. بە وێنەی جاران نەیدەتوانی بچێتە حیکمەتخانە و گەر ڕۆژێك وانەی پێ گوترابایەوە چەند ڕۆژ نەیدەتوانی هیچ وانەیەك بڵێتەوە. هێندێ جاران پێی لەنێو حیکمەتخانەکە دادەنا و نەیدەتوانی بچێتە ژوورێ و دەگەڕایەوە. لە هەر کون و قوژبنێکی حیکمەتخانەکە دەیان یادگاری لەگەڵ سەریاڵ و ئاڕتیندا هەبوو، بۆیە هەر شوێنێکی ئەوێی دەدیت برینێك لە برینەکانی دەکولایەوە. حیکمەتخانە و ماڵەکە لەبەر چاوی وەکو ئەژدیهایەکیان لێهاتبوو کە هەموو ڕۆژێ هەڵمەتیان بۆ دێنا و پارچەیەکیان لە گۆشتی لاشەی سوهەیل دەخوارد و ورده ورده لە تەمەنیان دەبرد. ئەو دەمەی تەماشای ناندینەکەی دەکرد خێرا ئەو ساتانەی دەکەوتەوە یاد کە لەگەڵ لاوەکان چێشت و شیرینیان ساز دەکرد و بەزوویی لەوێدا هەڵدەهات و دوور دەکەوتەوە. ئەو دەمەی دەچوویە ژوورێ و وانەی بە قوتابیەکان دەگوت دادەنیشت و چاوەڕێی دەکرد سەریاڵ و ئاڕتینیش بێن وانەکانیان بخوێنن، ماوەیەکی پێدەچوو کە دەیزانی نایەن خێرا بە چاوی پڕ ئەسرینەوە دەگەڕایەوە ماڵێ و جەرگی لەگەڵدا دەکولا. هێندێ جار دەهاتە بەردەم ژوورەکە و بانگی سەریاڵی دەکرد تاوەکو پارەی پێ



بدا و بڕوا خواردن و کەلوپەل بۆ قوتابییەکان بسەنێ. ئەگەر باسی کارێك کرابا دەیگوت ئەوە سەریاڵ یاخود ئاڕتین دەنێرم جێبەجێی بکا، ئەو دەمەی بیری دەکەوتەوە کە ئەوان نەماون خێرا کزەی لە هەناوی دەهاتەوە.

لە هەمووی سەختتر لەلای ئەو دەمەبوو کاتێك دەچوویە ژووریێ و لە دۆڵابی جلەکان ڕادەما کە جلی لاوەکانی تێدابوو، خێرا دەیکردەوە و دەیبینی ئێستا بەتاڵە و هیچی تێدا نەماوە، ئەم دیمەنە زیاد لە ئەندازە ئازاری دەدا و نەیدەتوانی لە ژوورەوەدا بمێنێتەوە.

جار جار لە ماڵێ هەڵدەستا و دەیگوت دەچمە حیکمەتخانە و سەرێك لە سەریاڵ و ئاڕتین دەدەم، خێزانی کە ئەمەی دەبیست دەستی دەکردەوە بە گریان. ئەم ئێش و ئازارە لە ماوەیەکی کورت دا چەندین ساڵی لە تەمەنی سوهەیلی حەکیم برد و چەشنی پیرێکی زورهانی[١] لێکردبوو. لەگەڵ ئەم ئازارەدا ئێشەکانی ڕابردووش هەمووی لە دڵیدا زیندوو ببوونەوە. وادیاربوو ئیدی حیکمەتخانە و ماڵەکە جێگای سوهەیلیان تێدا نەمابوو. تا پتر لەوێ مابایەوە پتر یادگاریەکان دەیان کوشت و لەنێویان دەبرد. ڕۆژ نەبوو چەندین قولاب لە یادگاری نەهاوێژرێن و دڵی کون کون نەکەن و ڕای نەکێشن. کاك جەمشیدی ئاگادار کردبوویەوە

---

(١) زورهان: پیری پەککەوتە.



كە ئەم ماوەیە نەخۆشم و ناتوانم وانەكان بڵێمەوە. قوتابیەكانیشی ناردنەوە ماڵێ و ئیدی حیكمەتخانەكە بە چۆڵی مایەوە و دەتگوت ڕۆژێ لە ڕۆژان كەس وانەیەكی تێدا نەخوێندووە هێندە كش و مات بوو بوو. ناوە ناوەش قیدار هەوڵی دەدا ببینێ و قسەی لەگەڵ بكا، لێ سوهەیل ڕەتی دەكردەوە بە هیچ شێوازێك چاوی پێی بكەوێ، تا وای لێهات ئەویش بێ ئومێد بوو لێی و ئیدی نەگەڕایەوە.

بەیانیەك كە زانی سەریاڵ وەڵامی نامەكانی ناداتەوە چیدی بەرگەی نەگرت و خێرا ئەسپ و گالیسكەیەكی بە كرێ گرت تاوەكو بەرەو شارەكەی ئەم لاوانەی بەرێ، بەڵكو بتوانێ ئاشتیان بكاتەوە. دوای گەڕان و پرسیار و ماندوو بوونێكی زۆر توانی ماڵی سەریاڵ بدۆزێتەوە و ڕوانی وا لەبەر دەرگا لەگەڵ هاوڕێیەكی ڕوونیشتووە.

لە دوورەوە سەرنجێكی سەریاڵی دا و دووبارە ئاگر لە جەرگی بەربوویەوە. ئەو دەمەی نزیك بوویەوە و سەریاڵیش ئەوی بینی خێرا هاوڕێكەی بەڕێ كرد و ویستی بچێتەوە ژوور، حەكیم سوهەیل لەدواوە بانگی كرد:

+ بۆ خاتری حەكیمی مەزن مەڕۆ ژوورێ.

سەریاڵ لای كردەوە و گوتی: ئەگەر حەكیمی مەزنت هێندە لا گەورە با ئەم تاوانەت بەرامبەرم نەدەكرد.

ئەم گوتەیە فرمێسکی لە چاوانی حەکیم هێنا و بە گریانەوە گوتی: لە هەموو شتێکدا لەگەڵتم سەریاڵ گیان. من خراپەکارم، من کەسێکی باش نیم، من تاوانبارم، هەڵەیەکی یەکجار گەورەم کرد، وەلێ تکایە ئەم هەموو باشی و جوانیەی ڕابردوو لەیاد مەکە و لێم خۆشبە برا. سوێندت بۆ دەخۆم فێڵم لێ کرا و بە دەستی ئەنقەست ئەم کارەم نەکرد.

سەریاڵ بە تووڕەییەوە: بڕۆ نامەوێ هەرگیز بتبینمەوە، گەردەنت ئازا دەکەم، لێ هەرگیزاو هەرگیز چاوەڕێی برایەتی و یەکدی بینینەوە لە من مەکە. هەموو خەونەکانت ڕووخاندم، دەمهەویست ببمە حەکیم، تۆ واتکرد تا هەتایی ڕقم لە حیکمەتخانە و حەکیم بوون ببێتەوە. چۆن توانیت ئەوە لەگەڵ کەسێکدا بکەی کە بە برای گەورەی خۆی دایانبووی! مەگەر تۆ دڕندە بووی؟ چاوەڕێی هیچ نەرمیەك لە من مەکە و بڕۆ لێرە.

حەکیم سوهەیل لەگەڵ ئەم قسانەدا جەرگی کەوتەوە ئێش و فرمێسك لە چاوانیدا چەشنی ڕەهێڵە دادەبارین و بەر پێیان تەڕ دەکرد، لەوانە بوو ئەگەر ماوەیەك ئەم مروارییانە ڕژابان لەوێدا سلیخانیان[١] چێ کردبا. دووبارە سەری بەرز کرد و بە دڵی خوێناویەوە گوتی: نەخێر دڕندە نییم سەریاڵ گیان، بەڵکو عاشقم و لەوەتەی خۆم دەناسم عیشق و ئەوین لەنێو دڵمدا جودا

---

(١) سلیخان: قوڕ و لیتە.



نەبۆتەوە. دەمزانی چ پیلانێك لەڕێ دایە بۆ لێك کردنمان سەریاڵ گیان دەمزانی، بۆیە هەردەم نزام دەکرد و دەمگوت خودایە لێمی نەستێنی، هەر لەبەر ئەمەش بوو هەمیشە مۆڵەتی چوونە دەرم پێ نەدەدای. بەڵێ ئەوان کاری خۆیان کرد و لێمیان بردی. ئەم شەیتانە نەفرەتیانە بە خەونێك منیان خەڵەتاند و تۆیان لێبردم برام. سوێندت بۆ دەخۆم من ئەمەم نەویستووە و پیلانێك بوو لە دژی ئێمە جێبەجێ کرا. من هەرگیز کۆڵنادەم سەریاڵ گیان، قەت کۆڵ نادەم لە ئاشت کردنەوەت و زەلیل کردنی ئەوان. ئایا دەکرێ کەسێك خراپەی برا بچووکی خۆی بووێ؟ تەماشام بکە دەکرێ کەسێك بیەوێ ئازار بە دڵی برا بچووکی ماڵەکەیدا بگەیەنێ؟ سوێندت بۆ دەخۆم لەوەتەی ناسیومی تەنیا چاکەی تۆم ویستووە.

بەس تۆزێ بە عەقڵ بیرکەوە سەریاڵ گیان تۆزێ بە عەقڵ، من هەموو کات خەمی تۆم بوو، بۆ پێگەیاندنی ئێوە ژیانی خۆمم فەرامۆش کردبوو، لەبەر خاتری ئێوە حیکمەتخانەم دانا، وازم لە هەموو کەس و لە هەمو شتێك هێنا، ئێستا دوای ئەم هەموو شتە دێم و خراپەتان بەرامبەر دەکەم؟! نازانم بەم دیمەنە پێبکەنم یان بگریم، ئێستاش بڕوا ناکەم کە ئێمە ئاوامان لێهات برام، ناتوانم باوەڕ بەوە بکەم هەرگیز.

تکایـــە دڵی ئـــەوان خۆش مـــەکە و وەرەوە بۆ حیکمەتخانە برا گـــیان.

سەریاڵ نەیهێشت مامۆستا قسەکانی تەواو بکا و خێرا چوویەوە ژووریٚ و دەرگاکەی بە توندی داخست. حەکیم سوهەیل هەستی کرد سەریاڵ لەگەڵ قسەکاندا فرمێسکی هاتنە خوار و نەیتوانی پتر گوێی لیٚ ڕابگریٚ. دوای داخستنی دەرگاکە سوهەیل لەم دیوەوە بە دەنگێکی بەرز گوتی: وا دەزانی ڕۆیشتی؟ چەندی دەتوانی برۆ، سوێند بەخوا بچیە هەر جێگایەك ناتوانی بستێك لە دڵم دووركەویەوە.

دوای ئەوەی زۆر بانگی سەریاڵی کرد و دەنگی بڕا زانی چۆتەوە ژوور و بە ناچاری ئەوێی جێهێشت. ئەو دەمەی تۆزیٚ دوور کەوتەوە ڕوانی وا ئاڕتین بەرامبەری دیٚ، وێدەچوو بەرەو ماڵی سەریاڵ بچیٚ. کاتێك مامۆستای بینی ویستی ڕێگاکەی بگۆڕیٚ و حەکیم سوهەیل خێرا لێی نزیك بوویەوە و بانگی کرد: بەرەو کویٚ ئاڕتین، لێم هەڵدێی؟

ئاڕتین سەری داگرت و گوتی: ببوورە مامۆستا، بەرەو لای ماڵی سەریاڵ دەچووم.

+ لەم شوێنە دوورەوە هاتوومە لاتان میوانداریم ناکەن و خۆتانم لیٚ دەشارنەوە!

حەکیم سوهەیل قسەکەی بۆ تەواو نەکرا و دووبارە گریان بەسەریدا زاڵ بوویەوە.

دوای کەمێ کەوتەوە قسە: هەموو ئەو جوانی و خۆشەویستیەی ڕابردووتان لەیاد چوو؟!

ئاڕتین بە ساردیەوە: هیچ شتێك لەیاد نەچووە مامۆستا، وەلێ هەڵەکە زۆر زۆر گەورەیە ببوورە.

سوهەیلی حەکیم لەو کاتەدا زۆر بۆ ئاڕتین دواو باسی ئەوەی کرد کە شەیتانەکان فێڵیان لێی کردووە و بە دەستی ئەنقەست ئەم کارەی ئەنجام نەداوە. دواتر داوای لێکرد بگەڕێتەوە حیکمەتخانە و داهاتووی خۆی نەشێوێنێ.

ئاڕتین گوتی: بمبوورە مامۆستا، تکایە بمبوورە و ناتوانم لەگەڵت بم، خۆزگە هەڵەکە ئاوا گەورە نەدەبوو خۆزگە، سوێندت بۆ دەخۆم هێندەم ئازار چەشتووە خەریکە دەمرم، ئاخر ئێوە هەردووکتان خەونی منیشتان خستە گۆڕەوە، هەموو ئاواتم ئەوەبوو فێری حیکمەت ببم و هەرگیز قەرار نەبوو ئاوا زوو بڕۆم، لێ ئێوە چیتان پێ کردم چی!

+ بمبوورە ئاڕتین گیان بمبوورە، ئێوە بەچی بڕوا دەکەن برام بەچی؟ قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان قسەیەکی ناڕاستتان لەمن بینیوە؟ لەیادت چوو کە من غەمبار بام چەند غەمبار دەبووی؟ دەتگوت ئەو کەسە دەکوژم غەمبارت بکا مامۆستا، دەی ئێستا لەو پەڕی غەمباری دام و لەلام نی برام؟!

ئارتین بەدڵتەنگیەوە: هەموو چاکەکانتم لەیادە و هەرگیز ڕقم لێت نابێتەوە و خۆشیشم دەوێی، بەداخەوەم و زۆریش بەداخم ئەم فێڵە گەورەت لێ کراوە مامۆستا، وەلێ زۆر داوای لێبوردنت لێدەکەم کە ئیدی ناتوانم لەگەڵت بم. دڵم زۆر توندە زۆر. تۆ بۆ من زۆر کەسێکی ئازیز و خۆشەویست بووی، لێ دووبارە داوای لێبوردنم هەیە کە ناتوانین ئیدی یەکتری ببینین. سەریاڵ ئەگەر بزانێ قسەم لەگەڵ کردووی زۆر لێم تووڕە دەبێ، ئەو پێمی گوت یان من یان مامۆستا هەڵبژێرە.

مامۆستا بە چاوی پڕ ئەسرینەوە: تەواو تێدەگەم برا، لەگەڵ ئەو بە و ئاگاداری بە، ئەو برا و کەسی منە، هەرگیز نەکەی نە لەبەر من و نە لەبەر هیچ کەسێك دەست لە سەریاڵ هەڵگری. تا لەلام بوو بە ڕۆح و گیان ئاگاداری بووم. ئێستا من براکەی خۆم بە تۆ دەسپێرم، تکایە ئاگاداری بە ئارتین تکایە. لەبری من پێی بێژە زۆر ئاگای لەخۆی بێ و پەرستشەکانی زیاد بکا، نەکا ئەم نەفرەتیانە بیانەوێ زەفەری پێ بەرن. ئەو کوڕێکی تا بڵێی حەکیم ناس و چاکەکارە، هەرگیز وەکو گەنجانی هاوتەمەنی نەمدیوە بەدوای شتێکی خراپ و هەوەسبازی بێ، دەست بە هاوڕێیەتیەکەتان بگرن و هەرگیز یەکتری جێ مەهێڵن.

لەگەڵ ئەم قسانەدا ئارتینیش چاوەکانی تەژی بوو بوو لە ڕۆندك و تۆزێ لە مامۆستا ڕاما و گوتی: لەم ڕۆژانە جەژنە مامۆستا، هەوڵدە خۆت دڵخۆش بکەی و ئێمە لەیاد بکە. وابزانە

ئیدی لە ژیانتدا هەر نەبووین. بەم کارەساتە یەکجار دڵگرانم و هەناوم پێی دەسووتێ. ئای خودایە کاشکی[١] دەمتوانی زیاتر بمێنمەوە کاشکی.

+ جەژنی چی ئارتین گیان، سوێند بە حەکیمی مەزن لەو کاتەی عیشقم ناسیوە جەژنم نەکردووە. مامۆستا ئەمەی گوت و چیدی خۆی بۆ نەگیرا و بە خێرایی لەوێ دوور کەوتەوە و لە پڕمەی گریانی دا. دوای ماوەیەك بە دڵی پڕ ئێشەوە ئەسپ و گالیسکەیەکی بە کرێ گرت و گەڕایەوە بۆ شارەکەی.

هەر لەو کاتەی گەڕایەوە یەکەم کاری بە گریانەوە قەڵەم و کاغەزەکەی بەرەو بناری شاخ و دەو جۆبارەکە برد و دەستی دایە شیعر نووسین:

جێم دەهێڵی؟

لە کاتێکدا کە دەزانی...

بێ تۆ ساتێ ناگوزەرێنم

ئاخر ئەمن....

بۆ بەرگەی ئەم هەموو دووریە

دڵێکی بەرد لەکێ بێنم؟

---

(١) کاشکی: خۆزگە

ئەی ئەم هەموو یادگاریانە
لە یادەوەریت نەماون؟
چی جوانیە...
لەبەر چاوت پەشۆکاون
چەشنی کەلاوەیەکی کۆن
دارِووخاون....
ڕەسمێکە و وێنە کێشەکە
ئاوەژۆ نیشانی داون
تیانووسی بابایەکی بینا کزە و
هەڵگێڕ و وەرگێڕ نووسراون
مەگەر دەکرێ کە جوانیەکان
لە یادگەی مرۆی تەواودا
بیربچنەوە؟
مەگەر دەکرێ کە دایکانێك
کۆرپەلەی تازە ساوایان
لە باوەشدا هەڵفڕێنن
ژیر ببنەوە؟

جێم دەهێڵی؟

مەگەر ئەمن ئەو کەسە نییم

لە زستانی زۆر سەختدا

دەبوومە سەیوانی دەست و

دەبوومە پۆشاکی بەرت؟

بە چەشنی خۆر

ڕادەوەستام لە بان سەرت

لەو دەمانەی....

خوڕەی باران....

زریانی سەختی ئێواران

مرۆڤانیان هەڵدەپێچا و

لەرزە لەرزیان تێ دەخستن

هەڵمگرتی و

بوومە کەشتی ڕزگارکەرت

لە هاوینی ماندوو کەردا

بە هەناسەی سارد و سڕم

فێنکاییم پێ دەبەخشی

تا قوڕقوڕاگەم دەئێشا

چەشنی گوڵێکی دوور لە ناز

کە لەبەر سێبەری داران

باران نەتی دەگرتەوە

هەڵم گرتی و لە قوژبنێك

بە هێواشی ئاوم دەدای

تاکو بەروبومت هەبێ و

دوور لە چاوی هەموو جیهان

ئێش و ژانم بۆت دەکێشا.

جێم دەهێڵی؟

لەبیرت کرد....

ئەو دەمانەی نەساغ دەبووی

چۆن دڵی من تەم دایدەگرت

جەستەم لەرزەی تێ دەکەوت و

گشت گیانی من تا دایدەگرت

ئەو ساتانەی برسی دەبووی
من بووم کە سکم دەئێشا
کە لوقمەت بۆ زارت دەبرد
من بووم تێر دەبووم لە پێشا
تۆ پەڕێ بووی...
موددەتێ بوو
خەریکی نەخشاندنت بووم
زەمینێ بووی....
خەریکی داچاندنت بووم

جێم دەهێڵی؟
هەر ئەو کەسەم....
کە وازم لە جیهان هێنا
لەنێو ملیاران مەردووم دا
چاوەکانم....
سەیری چاوانی تۆی دەکرد
هەزاران فەرسەخیش دووربای

گەر لە کیشوەرێکی تر بای

لە خوارووو یاخود لە ژوور بای

هێشتا لووتم بۆی تۆی دەکرد

هەرچەند بڕۆی

خۆ ناتوانی

بستێك لە دڵم دووركەوی

گەر پەنجەش بخەیتە گوێچکەت

هێشتا گوتەی من دەژنەوی

وەرە و جارێکی دیکە با

هەنگاو بنێین

بەرەو هەزاران شەوی دی

سەر بخەینە..

سەری هەزاران خەوی دی

لە جێگای ڕق

با خۆشەویستی دابنێین

هەرچی بووە و چی ڕوودەدا

وەلا بنێین.

سوهەیلی حەکیم لەگەڵ ئەم برینەدا بە سەختی ژیانی بەڕێ دەکرد، لێ پەرستشەکانی زۆر لە جاران پتر کردبوو، دەیزانی کە حەکیمی مەزن یارمەتی دەدا و بەم چەشنە جێی ناهێڵێ. ناوە ناوە نامەیەکی بۆ سەریاڵ دەنارد و بێ ئومێد نەدەبوو لەوەی کە دڵی چاك بکاتەوە، لێ ئەو زۆربەی جار وەڵامی نەدەدایەوە، خۆ گەر وەڵامیشی دابایەوە کۆمەڵێ قسەی ڕەقی دەکردن و هێندەی دی سووژنی لە دڵی مامۆستادا دەئاژنی[1].

هەستی دەکرد سات بە سات گلەیی و گازاندەکانی کاك جەمشیدیش پتر دەبن و ڕۆژانە زۆر قسەی ناخۆش و نەشیاوی بۆ دەگەڕایەوە. دیاربوو کاك جەمشید بە تەواوی لێی بێزار ببوو و دەیگوت ئەم حەکیمە گشت ڕۆژێ نەخۆشە و ناتوانێ حیکمەتخانە بەڕێوە بەرێ.

سوهەیلی حەکیم هێندە بەو ڕووداوە غەمگین بوو هەرچی مرۆیەك کە زانیبای ئەهلی نزا و پەرستشە دەڕۆیشتە لای و پێی دەگوت لەگەڵ ئازیزێك نێوانی تێك چووە و داوای لێدەکرد نزای بۆ بکا. ئەگەر زانیبای کەسێك سەفەر دەکا و دەچێتە سەر گۆڕەکەی نێردراوی مەزن خێرا خۆی دەگەیاندێ و دەیگوت کە لەوێدا شەکوای دڵی بە نێردراو بگەیەنێ و لەیادی نەکا. ناوە ناوە خێر و چاکەی لەگەڵ هەژاران دەکرد بەڵکو ئاوێك لە

---

(١) ئاژنین: سووژن کردنی زۆر بە شتێکدا.



غەیبەوە بەم دڵ و دەروونە سووتاوەی دا بکرێ و ئارام بێتەوە. ئەو نەیدەویست بمرێ لە کاتێکدا کەسێك هەیە دڵی لێی تۆراوە، بەتایبەتیش ئەو کەسە ئازیزێکە و برای بچووکیەتی و بە فێڵێکی ژەهراوی شەیتانەکان لێی دوور خستراوەتەوە. هەمیشە دەیگوت دەبێ بمێنم و ببینم کە ڕیسەکەی سەواد ببێتەوە خوری و سەریاڵ بێتەوە ماڵەکەم. ئەوکات ئەگەر مردیشم باکێکم نییە.

هێندێ لە هاوڕێکانی و کەس و کاری ئەو دەمەی دەهاتنە ماڵی و مامۆستایان بەم کزۆڵیەوە دەبینی یەکجار بۆی غەمبار دەبوون و دەیانگوت بەڕاستی گوناهە و تاوانە کەسێکی وەکو تۆ دڵسۆز و نیان خەم بخوا و ئێش و ژانی هەبێ. ئەو دەمەی دەیان ویست نزای خراپ لەو کەسە بکەن کە مامۆستای ئازار داوە خێرا مامۆستا دەستی لەسەر زاری دادەنان و دەیگوت: بێدەنگ بن، چون ئەو کەسەی ئازاری داوم لەسەر حەقە و من ناحەقیم لەگەڵ کردووە، ئەگەر ئەو دڕکێك بچێتە پەنجەی ئازارەکەی لە پەنجەی مندا دەبێ.

ڕۆژێکیان کە لەوپەڕی بێتاقەتی دابوو قەڵەم و کاغەزەکەی دەرێنا و بڕیاری دا دواین نامە بۆ سەریاڵ بنووسێ و ئیدی کۆتایی بەم باسە بێنێ، زۆری نزا کرد حەکیمی مەزن دڵی نەرم بکا و وێنەی جاران بیانکاتەوە برا و دەستی پێکرد:

**بە ناوی خودای بەخشندە**

سەریاڵ گیان... پێم وابێ ئیمڕۆ ڕۆژی لە دایك بوونم بوو، لە ڕۆژی لەدایك بوونی خۆمدا داوام لە خودایە تەمەنی تۆ درێژ بكا. برای ئازیزم... وەرە و با هەردووكمان بە زنجیری ئەوین نەفسی خۆمان دیل و كەنەفت بكەین و چیدی گوێڕایەڵی نەبین و ببینەوە برایەكەی جاران.

دەمەوێ بڵێم زۆر زۆر داوای لێبوردنت لێ دەكەم، بە هەموو دڵ و ڕۆح و تاكە تاكەی خانەكانی جەستەمەوە هاتوومەتە دەنگ و پێت دەڵێم بمبوورە.

ئەها هەموو جارێك كە تۆزێ لە یەكتری توورە دەبووین خۆت نەدەگرت و بە سركی دەهاتی و دەتگوت مامۆستا هەموو شتم وەلا ناوە و هاتووم بڵێم ببوورە. ئەمجارەیان ئەوا من بەرگە ناگرم و نامەم ناردووە و دەڵێم ببوورە و تۆش لێم قەبووڵ بكە.

دەمەوێ ئەوەشت پێ بڵێم كە زۆرم خۆشدەوێی، هەر زۆر سەریاڵ گیان، سوێند بە حەكیمی مەزن ناڕاست نەبووم و ناڕاستیش نابم لەم ئەوینەدا، چون هیچ سوودێكی خۆمی تێدا نابینم. هەمیشە بیرم كردووی و لەمەودواش پتر لە جاران بیرت دەكەم.

ئەم ماوەیەش كە تۆ توورەی بەردەوام هەوڵم داوە تەندروستیت بزانم و دوور و نێزیك ئاگادارت بووم، چون تۆ هێشتا برای بچووكی منی، جوانترین ئاوازی منی، ئەو برا بچووكەی بەردەوام

شەوانە شیعرت بۆ دەگوتم و گۆیندەم بووی و بە دەنگی تۆ خەو دەیبردمەوە.

ئەگەر شەوێك نەهاتبایە ماڵەكەم وام دەزانی شتێك لەمندا پیوار بووە. بەڵێ تۆ هێشتان ئەو برایەی هەموو شتێکم ئەنجام دەدا تاوەکو تۆ پێبگەی و فێرببی. هێشتان ئەو برایەی کە بەیانیان زوو بۆ وانەکە واگام دێنای و دەستم بە تاڵەکانی قژت دا دێنا هەتاکو بە ئارامیەوە خەبەرت دەبوویەوە. بەر لە کاروانکوژە نزام بۆ دەکردی. بەیەکەوە کۆڵان بە کۆڵان پیاسەمان دەکرد و هەر یەکەمان خەمی دڵمان هەڵدەڕشتە نێو کاسەی دڵی ئەوی دی، لەنێو باخچە بچووکەکەی حیکمەتخانە ڕوودەنیشتین و چاییمان دەخواردەوە. ئەی بۆ ئەو باغە گەورەی دەرەوەی حیکمەتخانە ناڵێی، چەند جار بەیەکەوە لەوێدا ڕوودەنیشتین و ڕازەکانمان دەگۆڕیەوە و لەسەر گازی پشتێ لێی ڕادەکشاین. تۆ برای بچووکی ماڵی من بووی، تەنانەت ئەو دەمانەی لە ماڵیش نەبووم بەهۆی نیگابانی تۆوە بێخەم بووم لە خێزان و ماڵەکەم. هەندێ جاریش دەبوویتە هاژۆر و هەر جێگایەکم ویستبا بە بارکێشەکە دەتگەیاندم. بەیەکەوە دەچووینە بازاڕ و خواردن و شتومەکمان دەکڕی و دەتگوت من ئەسپ سواری تۆم مامۆستا. ئەو دەمانەی کە شیرینی و لیچاڵیشم[1] بۆت چێ دەکرد هەر مەپرسە. دەزانی

---

(١) لیچاڵ: مرەبا

لەو کاتەوەی ڕۆیشتووی هیچم دروست نەکردووە و شیرینیشم نەخواردووە کاکە.

سەریاڵ گیان... ئەو کەسەت بووێ کە تۆی دەوێ، باقی مرۆیەکانی دی سەلام و چاك و چۆنی بەسیانە. هەرگیز ئەو دەمانەم لەیاد ناچێ کە قوتابیم بووی و جلی قوتابیانت لەبەر دەمم دەپۆشی و شەرمت لێ دەکردم، ئێستا حەزم لە پیاسەیەکی ئەو کاتانەیە کاکە. دەزانی مامۆستاکەت بە چ ئازار و چورتمێکدا[١] تێپەڕی و ئێستا لەنێو چ گێژاوێکی خەم دایە؟ چۆن دڵت دێ هێندە مامۆستای خۆت ئازار بدەی کاکە؟ ئەی هەموو جار نەتدەگوت مامۆستا ئەگەر بێزار بووی و غەمێك لە غەمەکانی ڕۆژگار سینە و بەربینتی گرت وەرە و لای من هەڵیرێژە! دەی ئێستا لەوپەڕی غەمباری دام و تۆ لەکوێی کە بۆت هەڵڕێژم برا؟ بۆچی لەوپەڕی ناخۆشیدا جێت هێشتم و گوێت بۆ سیخناخی دەروونم نەگرت؟!

نەتبیستووە کە مەولانا دەفەرموێ گەر کەسێك دڕوو بە قاچیدا بچێ خێرا لەسەر چۆك پای خۆی دادەنێ و بە نووکی دەرزی و بە وردیەوە بۆی دەگەڕێ، دواتر کە دڕووەکەی نەدۆزیەوە بە زاری دەیپشکنێ و زوبانی لێدەدا، چون زوبان لووسە و دەتوانێ هەست بە شتی زبر بکا. جا پێم بێژە دڕوو لە

---

(١) چورتم: سەغڵەتی و دەردی سەری

قاچدا ئەوەندە دژواربێ دەبێ لە دڵدا چۆن بێ؟ ئەو دڵەی دڕکی ئازار و جودایی چۆتە نێوی دەبێ لە چ حاڵێکی پەرێشان دابێ.

ئازیزەکەم سەریاڵ.... ئەوانەی ڕۆژێك گوتویانە خۆشم دەوێی و ئێستا مراندوویانە هەر لە ئەوەڵەوە خۆشەویستی و عیشقەکەیان حەقیقی نەبووە، چون گەر حەقیقی بووایە هیچ شتێ نەیدەتوانی بیکوژێ، گەر باوەڕیش بەم گوتەیە ناکەی وەرە و سەیرێکی حاڵی ئێمە بکە. برای ئازیزم..... لەکاتی هەبوونی واجبێکدا خۆ خەریك کردن بە چاکەیەکی ناواجب کات بە فیڕۆ دانە. واز لەو چاکانە بێنە کە دەیانکەی و وەرە جەرگێکت لێرە سووتاندوە و ساڕێژی بکە. بزانە گەورەترین پەرستش خۆشی خستنە دڵی باوەڕدارێکە، هەروەکو نێرداروی مەزن وەهای فەرمووە. پێم بێژە تۆ چی لە چاکە و پەرستشەکانت دەکەی لەکاتێکدا دڵێك لێرە ببێتە خۆڵەمێش؟!

ئازیزی من..... ڕێزی ئەو کەسە بگرە کە خۆشی دەوێی، سوێندت بۆ دەخۆم عیشق و ئەوین ناچێتە نێو دڵێکی ڕقاویەوە. وەرە و دەمهەوێ دووبارە لەنێو باخچەکەی حیکمەتخانە چاییەك بخۆینەوە، دووبارە با بەرەو باغە گەورەکە وەڕێ بکەوینەوە.

بیرتە شەربەتێك لە شاهێن هەبوو ناوی شەکرێن بوو، تۆ زۆر حەزت پێی دەکرد و من ڕێگریم لێ دەکردی بیخۆیتەوە؟ تۆ ئەمجارە وەرەوە بەڵێنت پێ دەدەم کە چیدی ڕێگری خواردنەوەیت

لێ نەكەم. برای نازدارم... دووبارە سوێندت بۆ دەخۆم ئەم كارەی ڕوویدا بە حەزی من نەبووە و ڕۆژێك لە ڕۆژان خراپەی تۆم نەویستووە، ئاخر دەبێ كێ هەبێ خراپەی برا بچووكی خۆی بووێ بەس ئەوەندەم پێ بێژە كاكە بەس؟!

ئەمە پیلانێك بوو بۆ لێك كردنمان برا، پیلانێك بوو بۆ سووتاندنی جەرگی من جێبەجێ كرا، خودا لەكۆڵیان بكاتەوە. توخودا با دڵت چەشنی جارانی لێ بێتەوە كاكە، حەیفە ئەم دڵە بچووكەی تۆ لە من ڕەنجابێ. تۆ ببە ئەو قوتابی و خۆشەویستەی كە هەمیشە دەمێنیەوە و مەبە ئەوانەی كە ئازاریان بە دڵم گەیاند و گوزەریان كرد.

تەواو ئیمڕۆ بڕیاری كۆتایی بدە و ئاشت بەرەوە، دەزانم دەیكەی برا دەزانم. زۆر جار دەتهەوێ كارێكی چاك بكەیت، لێ هەر جارە و شەیتانە نەفرەتیەكان شتێكت بۆ چێ دەكەن و لە یادت دەبەنەوە. دەزانی ئاشت بوونەوەی تۆ سوودێكی ماددی بە من ناگەیەنێ كاكە، ئاخر جگە لەوەی مرۆ ناتوانێ دەستی لە برای خۆی بەربدێ چ قازانجێكی دی لەم نێوانە دایە پێم بێژە؟ تەنێ ئەوەیە كە زۆر ئازار دەخۆم كەسێكی نزیكم لێم ڕەنجاوە و نامهەوێ پیلانی ئەوانەی لێكیان كردین سەركەوێ.

سەریاڵ گیان... دەبوایە قەبووڵی ئەم تاقیكردنەوەیەت كردبایە و هێندە ئاسان جێت نەهێشتبام، چون كارەكە هەر بۆ تۆ

تاقیکردنەوە و سەغڵەتی نەبوو، بەڵکو گەر بۆ تۆ جارێك ناخۆش بووبێ بۆ من سەدان جار مردن بووە.

بیرتە هەموو جار کە دەڕۆیشتی دەمگوت بیرت دەکەم، تۆش دەتگوت خەمت نەبێ هەر دێمەوە مامۆستا، ئەی ئێستاکە چیت لێ بەسەر هاتووە و بۆ نایەیتەوە کاکە؟

هەر ئەو کەسەم تا دوێنێ بوو مامۆستات بووم و وانەکانی حیکمەتت لەلام دەخوێنا.

وەرە و دەمهەوێ بچمە جێگایەك و تۆ دووبارە ئەسپ سواریم بۆ بکە. وەرە من ماڵ بەجێ دێڵم و تۆ دووبارە پاسەوان بە. وەرە دەمهەوێ دیسان حەلوایەکی زۆر بەتامت بۆ چێ بکەمەوە. گوناهە ئەم هەموو خۆشەویستیە ئاوا بەفیڕۆ بڕوا گوناهـ.

بیرتە بە شۆخیەوە دەمگوت تۆ دوژمنی منی، هەر لەو ساتانەوە من نەترەم[1] لە جیایی چووبوو، ئێستا وەرە و بڵێ من هەرگیز دوژمنت نابم و خۆشم دەوێی مامۆستا. وەرە و باڵندەی ماڵەکەم بیرت دەکا. برای بچووکم.... ئەگەرچی وەکو جاران بۆنی تۆ بە لووتمدا گوزەر ناکا، وەلێ لە هەر کوێیەك بی دڵم لەوێیە، نا نا بەڵکو دڵم لە هەر کوێ بێ تۆ لەنێوی دای.

ئەم ماوەیە چەند نامەت پێگەیی لەمنەوە؟ ڕۆژێ دێ هیچ شتێ ناگا ئازیزم، گوێ مەدە وشەکانی نێوی ئەگەر بێ بایەخ

---

(١) نەترە: زەندەق، زراو

بوون، بەڵکو گوێ ڕادێرە بۆ ئەو عیشقەی کە لە پشتی وشەکاندا هەیە. ئێمە براین و هەر بە یەکەوەش جوانین. کەسێ تۆ تووڕە بکا منی تووڕە کردووە، ئازار بە تۆ بگەیەنێ بە منی گەیاندووە، جنێو بە تۆ بدا بە منی داوە.

هیوای سەلامەتیت بۆ دەخوازم و خودات لەگەڵ.

سوهەیلی حەکیم........



# ونبوونی حەکیم سوهەیل و کۆتایی



شەوێك لەو شەوانەی سوهەیلی حەکیم لەنێو خەوێکی قووڵ دابوو دووبارە دانیالی پیر لێی نزیك کەوتەوە. ئەمجارەیان کەوایەکی تەواو سەوزی لەبەردا بوو، نزیك بوو لەنێو سەوزاییەکەی چوار دەوریدا کەوایەکە دیار نەمێنێ و ون بێ. کڵاوەکەی سەری لەگەڵ سەوزیەکەیدا تاجێکی زەردی زێڕینی بچووکی لە پێشەکەی درابوو، دەورو بەری کڵاوەکەش بە دانە دانەی مرواری ورد ورد نەخشین و ڕازاوە کرابوو. بە ڕوویەکی خۆشەوە گوتی: حیکمەتخانەکە جێ بهێڵە و بڕۆ، چیدی شوێنی تۆ ئێرە نییە. ئەو کوڕەش دەگەڕێنینەوە لات خەم مەخۆ.

سوهەیلی حەکیم بەیانی زوو وەخەبەر هات و بەر لەوەی نانی بەیانی بخوات لە دەرگا دراو ڕوانی کاك جەمشیدە. دوای بەخێر هاتن و چاك و چۆنی کاك جەمشید دەستی پێکرد:

حەکیم سوهەیل، خۆت دەزانی من حیکمەتخانە و ماڵم پێ بەخشی و سوپاس بۆ حەکیمی مەزن خێزانیشت پێك هێنا، لێ بەداخەوە نەتتوانی حیکمەتخانەکە بەڕێوە ببەی وەکو ئەوەی من دەمهەویست. ڕاست دەکەم یان نا؟

سوهەیل بە غەمباریەوە: ڕاست دەکەی کاك جەمشید، نەمتوانی وەکو ئەوەی دەتهەویست بەڕێوەی ببەم.

+ دەی زۆر چاکە مادام خۆشت دانی پێدا دێنی، کەوابوو ئەگەر ئێرەت پێ بەڕێوە ناچێ بۆ کەسێکی دی چۆڵی بکەی باشتر نییە؟

- ڕاست دەکەی، خۆم دەمهەویست ئەمڕۆ پێت بڵێم کە لێرە دەڕۆم و چیدی ناتوانم لێرە بم، هەوڵدە لەم ماوەیە بۆ خۆت حەکیمێکی تر بدۆزیەوە، من تەندروستیم تەواو نییە و ناتوانم ئیدی وانەکان بڵێمەوە.

+خۆزگەدەمزانی کێشەی تۆ چی یە حەکیم سوهەیل،نەمدەویست ئاوا بڕۆی، وەلێ بەداخەوە ناچارین.

سوهەیلی حەکیم لەگەڵ هێندێ هاوڕێ و کەس و کاریدا خانوویەکی بچووکی قوڕینی لە نزیك ماڵی باوکیدا چێکرد و ئیدی بۆ تا هەتایی بە دڵی پڕ ئێشەوە ماڵئاوایی لە حیکمەتخانەکە و تەواوی یادگاریەکان کرد.

بەیانیەك ئاڕتین تەواو غەمبار ببوو بۆ مامۆستا، سەرپاکی یادگاریەکان هاتبوونەوە خەیاڵی و ئازاریان بە ڕۆحی دەگەیاند. چیدی نەیتوانی خۆی بگرێ و دووری لە مامۆستا هەڵبژێرێ و خەریك بوو دڵی دەتەقی، بۆیە خێرا پێنووسەکەی هەڵگرت و دەستی بە نووسین کرد:

سەلامت لێبێ مامۆستا.... ماوەیەکە هەست بە غەمباریەکی یەکجار زۆر دەکەم.

زۆرم پێخۆش بوو ڕۆژێك بێتەوە دووبارە لەلات بخوێنمەوە. هەر لە یەکەم ڕۆژەوە کە ڕۆیشتین بە ئەندازەی هەموو دونیا بێتاقەت بووم و زۆریش ئەسرینم ڕشت. ئەم خەمە تا ئێستاش بە وێنەی پەنگرێك[1] لە سینەمدا دەجمێ و هەمیشە دەمهەویست ڕۆژێك ببینم لە ئاتەك تۆدا ڕوونیشمەوە. مامۆستا گیان زۆر زۆرم سوود لێ بینی، زۆر گۆڕانکاریت تێمدا دروست کرد. لەگەڵ تۆدا هەستم بە هەبوونی دڵم دەکرد. هێندە سوودی عیرفانی و دونیایت پێ گەیاندم کە زۆر ئەستەمە بتوانم سەرژمێری بکەم.

منەتباری هەموو ئەو ڕۆژانەم کە لە کاتی خۆت دەگرت و حیکمەتت پێ دەگوتم.

منەتباری هەموو ئەو خولەکانەم کە بەوپەڕی دڵسۆزیەوە ئامۆژگاریت دەکردین.

هەموو ئەو ساتانەی کە گوێت لێ دەگرتم و لێم تێدەگەیشتی. منەتباری ئەو کاتەم کە خێزانت پێك دەهێنا و وازت لە ئاهەنگەکە هێنابوو و خەمی ئێمەت بوو داخوا چیمان خواردووە. هەموو ئەو چاکە و یادگاریانە لەیاد ناکەم و هەمیشە لەلام بەڕێز و بەرزیەوە دەمێننەوە. خۆزگە چەرخی گەردوون بە پێچەوانە دەسووڕایەوە و دەگەڕاینەوە لات و دووبارە بەیانیەکی تر هەڵدەستامەوە تاکو حیکمەتت لەلا بخوێنم، یاخود بەیەکەوە پیاسە بکەین و باسی

(١) پەنگر: پشکۆ ئاگر

عیرفانم بۆ بکەی، وەلێ ئیدی هەموو شتێ بە دڵی ئێمە نابێ و بە کەیفی ئێمە ناسووڕێ.

دڵنیام لەوەی ڕۆژێك سەریاڵیش لێت تێدەگا و هیچی لە دڵ نامێنێ مامۆستا، چون ئەوەی تۆ تا ئێستا بۆ ئێمەت کردووە مرۆڤ لە ئاستیدا شەرمەزارە.

مامۆستا گیان، هەر ئەوەندەی بزانە کە هیچم لەیاد نەکردووە و هەمیشە بەرامبەر ئەو خەم خۆریەی بۆ ئێمەت هەبوو بە نمەك دەبم. زۆرم هەیە، وەلێ لەوەندە دەیبڕێنمەوە و لەم ماوەیە ئینشاڵلا سەردانت دەکەم.

ئارتینی قوتابیت.....

ئەو دەمەی ئارتین نامەکەی تەواو کرد خێرا بە دەستەکانی پێچایەوە و لەنێو زەرفێکی خست و بەرەو نامەبەرەکەی برد، بەڵکو بگاتە دەستی حەکیم سوهەیل و بتوانێ هەم ئاوێك بەسەر برینی دڵی خۆیدا بکا و هەم دڵی مامۆستاش تۆزێ سارێژ بکاتەوە، لێ بەداخەوە کاتەکە درەنگی کرد و نامەکەی ئارتین نەگەیشتە جێ و سوهەیلی حەکیم ڕۆیی.

بەیانیەك ئەو دەمەی خێزانەکەی حەکیم سوهەیل هەڵسایەوە نانی بەیانی چێ بکا ڕوانی حەکیم لەوێدا نەماوە و گەلێکی بەدوادا گەڕا و لە هیچ شوێنێکدا نەیدۆزیەوە.

ئیدی سوهەیلی حەکیم تاوەکو ئێستاش وەکو ونبوویەك لە شاهێندا مایەوە و تەنێ ناوەکەی لەنێو خەڵکیدا ماوە. حەکیم سوهەیل بۆ ئەوەندە ژینەی مایبوو ڕووی کردە دەشتاییەکی چۆڵ کە هیچ مرۆیەك لە دەوروبەری نەدەژیا. گەر ویستبای بچێتە ئاوەدانی کەمێك ئاو هەڵێنجێ، یاخود تۆزە خواردنێك بسەنێ دەبوایە نیو کاژێر پتر بەپێ بڕوا تا دەگەیشتە لادێکە. خەڵکی لادێکە هەر جارەی بیان دیتبا یارمەتیان دەدا و بە مرۆیە غەوارەکە[1] ناویان دێنا.

بەڵێ مرۆڤ هەرچەندە ملیۆنان کەسیش ئاشنای بن لە ئاخر و ئۆخرەکانی ژیانیدا زۆر جار تەنیا دەمێنێتەوە. ڕۆژێ دێ هەموویان جێت دێڵن و لە بێکەسی و تەنیاییدا چاوەکانت نوقمی ئەسرین دەبن و سوور دەبنەوە. هەرچەندە خاوەنی مناڵی زۆریش بی ئەو ڕۆژە هەر دێ هەموویان ڕێگای خۆیان ببڕن و لەنکاوێك چاوەکانت هەڵبێنی و لەگەڵ خەم و تەنیاییدا دەست لەملان ببی.

ئەو کەسەی هاوڕێ و هاودەمێکی هەیە و بە تەواوی لە هەستەکانی یەك دەگەن و بەبێ یەکدی ناتوانن هەڵکەن، ئەم جۆرە مرۆڤە کوفری کردووە گەر بڵێ ژیان تاڵە.

تۆ ئەی ئەو کەسەی چوار دەورت پڕیەتی لە خەڵك، ئەم تەنیاییەی من دوور نییە لە تۆش، بۆیە تا زووە لە ماددە وەرە

---

(١) غەوارە: بێگانە



دەر و ئەوینە گەورەکە بدۆزەرەوە. زۆرێك لەو کەسانەی ئیمڕۆ بە دۆست و ئازیز ناویان دێنی ڕەنگە لە ڕۆژی پەسڵاندا ببن بە دوژمنێکی سەرسەخت و لەبەرت ڕابکەن، کەوابوو تۆ کەسێك بە دۆست بگرە کە لەو ڕۆژەدا لەبری هەڵاتن باوەشت پێدا بکا.

ئێمە خەڵکی ئەم جیهانە نیین و دەبێ سەرەنجام بچینەوە مەنزڵەکەی خۆمان، ئێمە لە هاوزوبانی خۆمان جودا بووینەتەوە و دەبێ ڕۆژێ بە دیداری بگەینەوە، چون کەسێ لە هاوزوبان و دۆستەکەی جودابێتەوە هەرگیز ناتوانێ ئەو بۆشاییە پڕکاتەوە مەگەر بە دیدار و ویساڵ نەبێ. حەزرەتی مەولانا فەرمووی:

هەرکەسێکی لە هـاوزوبان جودابێ

بێ زوبانە، با خاوەن سەد سەدا بێ

لە ڕۆژێکدا هەموو جێت دێڵن و هەر تۆ و خودا دەمێننەوە، گەر لەو کاتەدا عیشقێکت لەگەڵ ئەودا چێ نەکردبێ بگری بۆ خۆت. لە کاتێکدا ئەوت هەیە کێ دەڵێ قسەکردن لەگەڵ ئەوانی دی تاوان نییە؟

بەر لەوەی سەفەر بکەی بەرەو جیهانەکەی تر لە ئێستادا پەیوەندی لەگەڵ کەسانی ئەوێ بگرە با دواتر غەریب و بێگانە نەبی پێیان. گەر دەتەوێ گەورەبی ون بە، چون مرۆڤ ئەو دەمەی ون دەبێ دەتوانێ خۆی بدۆزێتەوە و گەورە بێ. زۆر فرمێسکم بێ هوودە ڕژاندن و زۆریش لە جێی خۆیدا بوون، ئێستا

دەمهەوێ هەموو ئەو فرمێسكانەی لەجێی خۆیدا نەمڕشتوون دانە دانە بیانكەمەوە چاوم. ئەی ئەو كەسەی ئەمە دەخوێنیتەوە، تۆ هەوڵدە هەموو فرمێسكەكانت لە جێی خۆیدا بڕژێ.

بەڵێ ڕۆژێك دەبیتە ئەو خۆڵەی كە گۆزەت لێ دروست دەكەن و بەدەستی یەكێك دەشكێی، لە ئێستاوە هەوڵدە خۆت بۆ ئەم شكانە ئامادەكەی، وەكو خەییام گوتی:

گۆزێك لە دەستم شكابوو، ئەو گریـــا بــــــــۆم
خەم دات نــەگرێ، مــــنیش یەكێكی وەك تــۆم
زۆر جار منیش وەكو تـــۆ گـــۆزەم دەشكانـــــد
تۆش ڕۆژێ دەبی بە گۆزە، دەشكێی وەك خۆم(١)

هەتا ئەم خولەكەش كە ئەو ڕۆمانە دەنووسم، چاوەنووڕی ئەوەم ڕۆژێ ببینم سەریاڵ و ئاڕتین بگەڕێنەوە و بە وێنەی جاران وەكو برایەك مامەڵە بكەینەوە.

لەگەڵ تۆمە ئەی خوێنەر... ئەی ئەو كەسەی لەدوای مەرگی من ئەمە دەخوێنیتەوە. ئەگەر من لە ژینیشدا نەمابووم چاكەیەكم لەگەڵ بكە و هەوڵدە پرسیاریان دەربارە بكە و بیاندۆزەوە. ئەگەر لەدوای مەرگیشم گۆڕەكەم بدۆزنەوە، یاخود هەر لە شوێنی خۆیاندا بێژن ئەوا هیچمان لە دڵ نەما بەرامبەر

---

(١) وەرگێڕانی مامۆستا هەژاری موكری.

مامۆستا و دووبارە بووینەوە بە برا، دڵنیا بن بەم گوتەیە لەنێو گۆڕەکەمدا خۆشحاڵ دەبم، چون هەرگیز نەمویستووە و نامەوێ پیلانی سەواد و کۆمەڵەکەی، یاخود ئەو شەیتانانەی هاوشێوەی سەوادن سەربکەوێ لە بەرامبەر مرۆیەکی باوەڕداردا.

دڵنیام دوای ماوەیەکی دی سەریاڵ و ئارتینیش ئەم کتێبە دەخوێننەوە و زەردەخەنەیان دێتێ لە دیاری.

لەگەڵ تەواو بوونی ڕۆمانەکەدا خاتوو لیا دەستی بە گریان کرد و دەمێکی خۆش ژیر نەبوویەوە، دوای کەمێ هاتنەوە سەرخۆ گوتی: بەڕاستی چیرۆکەکەی تۆ زۆر لە هی من غەمبار ترە حەکیم سوهەیل، نازانم بگریم یا پێبکەنم کە ڕێم لە ڕێگای پیاوێکی وەکو تۆ گەورە کەوتووە. دڵنیام خودا خۆشی ویستووم کە بەر لە مەرگم تۆی پێ ناساندم. بمبوورە سەرەتا وامزانی تەنێ پیرە پیاوێکی بێ کەسی و هیچی دی، ئاخر لە کوێ بزانم کە تۆ حەکیم سوهەیلی.

+ دەی ئێستاش هەر وایە، لە پیرە پیاوێکی بێکەس پتر هیچی دی نییم، پێم بێژە حاڵی دەستت چۆن بوو لەگەڵ نووسینی ڕۆمانەکە؟

- وا هەست دەکەم خوێنی بۆ ناچێ و وزەی تێدا نەماوە، تەنانەت کە دەشی جووڵێنم هەستی پێ ناکەم، لێ هێندە بە ڕووداوەکە غەمبار ببووم ئاگام لە دەستم نەمابوو.

تۆ بڵێی ئەم دووانە دوای ئەم هەموو ساڵە تۆیان بیر مابێ و بگەڕێنەوە لات؟

+ دڵنیام لەمە، وەلێ نازانم هەر زیندووم یاخود دێنە سەر گۆڕم. تۆ واز لەمە بێنە، پێویستە من تۆ بگەیەنمە لادێکە، چون ماوەیەکی زۆرە بەیانی بۆتەوە، وا بڕوا قسە تەواو نابن و بەرەو نیوەڕۆ دەچین.

- دیارە بیرت چوو حەکیم سوهەیل کە وانەیەکمان مابوو لەسەر پێشەوا بوسیری، من هەرگیز ئێرە جێ ناهێڵم تا ئەویش نەخوێنین.

+ وەلێ درەنگ دەکەوین ها، دواتر هەر شتێ ڕوویدا زەرەرمەندی یەکەم تۆ دەبی.

- هەرچیەك ڕوویدا ئێرە جێ ناهێڵم تا وانەکەی تریش نەخوێنم. ئەرێ بەڕاست با پرسیارێکت لێ بکەم، ئەگەر ئێستا ئەو لاوانە بێنەوە ئامادەی بە وێنەی جاران یارمەتیان بدەی و فێریان بکەی؟

+ بەڵێ بێگومان، چەندی لە توانام دابێ یارمەتیان دەدەم، چون من دەزانم ئەوان خەتایەکیان نییە و کارەکە پیلان بۆ داڕێژراو بوو. هەرگیز بیرت نەچێ کە نێردراوی مەزن فەرمووی: (هیچتان باوەڕی تەواو نابێ هەتاوەکو وای لێدێ چی بۆ خۆی پێخۆشە ئەوەشی بۆ براکەی پێ خۆش بێ). بێگومان باوەڕدار پێویستە لەسەری هەموو ئەو چاکانەی دێنە ڕێی پێی خۆشبێ بێنە ڕێی ئەوانی تریش، هەموو ئەو خراپانەشی دەیهەوێ لەسەری لابچن

پێی خۆشبێ لەسەر ئەوانی تریش لابچن. هەر کەس وەها نەبوو بزانە کە باوەڕەکەی لە کەم و کوڕی دایە. تۆ ئەو ئامۆژگاریەی نێردراوی مەزن بە دڵ وەرگرە و لەوەش دڵگران مەبە کە لەسەر یارمەتی دانی کەسانێك خراپ دەربێی، بیرت نەچێ کە ئێمە کار دەکەین بۆ ڕازی کردنی خودا نەك ڕازی کردنی ئەوانی دی.

ئێستا سێ دێڕی تریش لە هۆنراوە مەزنەکەی پێشەوا بوسیری شیدەکەینەوە و دواتر پشت بە خودا هەوڵدەدەم بتگەیەنمە لادێکە.



## گەڕان بەدوای مامۆستادا



لە بەیانیەکی سارد و سڕی کۆتایی پایزدا، لە دەشتایی و چۆڵگەکانی دەرەوەی شاهێندا دوو پیاوی پیر ڕێگاکانیان تەی دەکرد بۆ دۆزینەوەی مامۆستاکەیان. وێدەچوو لە دەوری (٦٠) ساڵیدا بن و هاوتەمەنیش بن. هەرچەندە ئەم تەمەنە ماویەتی بۆ تەواو پیر بوون، لێ ئیدی ئەو دەمەی مرۆ دەگاتە سەرووی پەنجا هەر بە پیر لە قەڵەم دەدرێ.

دوو پیاوی سەر و ڕیش تەواو سپی و خاوەن گەدێکی[١] ناوەندی کە ڕیشی هەردووکیان بە ئەندازەی دوو پەنجە درێژ دەبوو. هەردوو بە جلە ڕەشەکانیانەوە لە دووری بیابانە زەردەکەوە دەبینران.

هێندە جلیان لەبەر کردبوو لە ترسی سەرما کە مرۆ نەیدەزانی ئاخۆ ڕێژەی قەڵەوی و لاوازیان چەندە. هەرچەندە تەمەنیان هەڵکشابوو، لێ هێشتا لە ڕێکردن دا تەواو چوست و چاڵاك بوون و چەشنی گەنجێك خۆیان نومایان دەکرد. سەر و ڕیش و جلەکانیان بە تەواوی تۆزی گرتبوو، ئەمەش دەیسەلماند کە ماوەیەکی زۆربوو لەوێدا دەچەرخان و هەنسکە هەنسکیان

---

(١) گەد: قەد و باڵا

دەهات. دیاربوو ئۆتۆمبێلەکەیان لە دوورەوە ڕاگرتبوو، چون نەیان دەتوانی لە بیابانەکەدا لێی بخوڕن. ناوە ناوە ماندوو دەبوون و لە شوێنی خۆیاندا لەسەر خۆڵەکە ڕوودەنیشتن، ماوەیەك دەستیان بە گفتوگۆ دەکرد و جانتاکانی سەر شانیان دەهێنایە خوار کە دیاربوو ئاو و خواردەمەنیان تێیدا دانابوو. دوای حەسانەوە و خواردنەوەی کەمێك ئاو هەڵدەستانەوە و دەستیان بە گەڕان دەکردەوە. لەبەر زۆری گەڕان زوو زوو ماندوویەتی ڕووی لێ دەکردن و بگرە هەندێ جار پێیان لە دڕك و بەردی ڕێگاکە گیر دەهات و بەردەبوونەوە و یەکتریان هەڵدەستاندەوە.

ناوە ناوە یەکێکیان بە ئەوی دیکەی دەگوت: تۆ بڵێی بەر لە مردن مامۆستا بدۆزینەوە و ئەم ئاواتەمان لەگەڵ خۆ نەبەینە گۆڕ؟

پیری دووەم: بەڵێ من دڵم ڕوونە و دڵنیام دەیدۆزینەوە، قابیلە خۆ زەوی قووتی نەداوە و لەم وڵاتەش نەچۆتە دەرێ، بۆیە بێگومان لە کۆتاییدا هەر دەبێ هەواڵێکی هەبێ.

+ ئێستاش نازانم ئێمە بۆچی ئەومان ون کرد بۆ؟! ئاخر کێ لە ئەو دڵسۆزتر بوو بۆمان، ئەو لە خودی خۆمان زیاتر بایەخی پێ دەداین. ئەو جۆرە مرۆڤانە تا ون نەکرێن قەدریان نازاندرێ، هەرگیز قەدریان نازاندرێ.



- لە من مەپرسە خەتای تۆ بوو، ئەوە تۆ بووی بوویتە مایەی ئازاردانی مامۆستا، دەیان جار پێم دەگوتی ئاگات لەخۆت بێ و دڵی مامۆستا مەڕەنجێنە، تۆ بایەخت بە قسەکەی من نەدەدا. بیرت لەوە نەدەکردەوە کە مامۆستا لە دەیان جێگا دڵی شکاوە و ئازار دراوە و بەرگەی ئێشی دیکە ناگرێ و شاهێن جێ دەهێڵێ؟ ئاخر ئەو بەم دواییە دڵی بە چەشنێك لاواز بوو بوو کە نەدەبوایە بە هیچ جۆرێك خەم بچێتە نێوی.

+ ئەوکات ئەمەم نەدەزانی برا نەمدەزانی ئاوای لێدێ، ئەوەی ڕوویدا لە یەك تێنەگەیشتن بوو تێبگە لێم. سوێندت بۆ دەخۆم لە ژیانمدا ئازاردانی ئەوم نەویستووە، بگرە هەمیشە ئەوم وەکو کەسێکی گەورەی خۆم داناوە و خۆشم ویستووە.

- ئەم قسانە ناخوا تازە، ئەگەر خوانەخواستە نەیدۆزینەوە، نەك لە دونیا بگرە لە قیامەتیش ئەم گرێیە لەسەر دڵماندا دەمێنێتەوە.

+ نا نا هەرگیز نایەڵم بگاتە قیامەت، دەبێ هەر لەسەر دونیادا چاوم بە چاوی مامۆستا بکەوێتەوە و دووبارە خۆشەویستی و برایەتی بۆ یەکتر دووپات بکەینەوە.

پیری دووەم بە کەمێك تووڕەییەوە: کە لەگەڵمان بوو دووپاتت کردبایەوە، بۆچی دەتهێشت بگەینە ئەم ڕۆژە. ئاخر ئەوە تۆ بووی تۆ دەنا ئەمن هەرگیز قەرارم نەدابوو لە مامۆستا دوور کەومەوە،

دەی پێم بڵێ لە کوێ جارێکی تر کەسێکی ئاوا بدۆزمەوە کە هێندە بایەخم پێ بدات و خۆشی بوێم.

+ خۆت تووڕە مەکە برا، وادەزانی من ئەمەم دەویست، سوێند بە حەکیمی مەزن منیش ئەمەم نەدەویست، وەلێ تازە ڕوویدا و کاتیش ناگەڕێتەوە.

- ئای خۆزگە دەمتوانی کات بگەڕێنمەوە و بەس یەك ڕۆژی تر چووبامەوە لای مامۆستا و لەلایم خوێندبا خۆزگە. ئەو بە تەواوی کەسێکی ڕۆحی بوو، ئەو لە ڕۆحەکان تێدەگەیی و ئێمە نەمانتوانی وەکو پێویست ڕێزی بزانین.

+ خۆت دڵتەنگ مەکە برا گیان، شوکر هێشتا لەسەر توانای خۆمانین و دەگەڕێین، دڵنیام لە یەکێك لە دەشتایی و بیابانەکان یاخود ئەشکەوتێك لە ئەشکەوتەکان جێگایەکی بۆ خۆی سازداوە و تێیدا دەمێنێتەوە.

- ئەی گەر خوانەخواستە وەفاتی کردبوو چی؟ پێم بڵێ بە چ ڕوویەك بگەڕێمەوە لە کاتێکدا دڵی ئەوم هێشاندووە، ئەگەر ئەو نەمابوو هەرگیز لەخۆم خۆشنابم هەرگیز.

+ هیوادارم مابێ و جارێ وەفاتی نەکردبێ، ئەگەر وەفاتی کردبێ ئەمە لەسەر دڵی منیش دەبێتە گرێ دڵنیام. چەند خۆش دەبوو وەکو جاران چووباینەوە لای یەکتری و بەم پیریە ببابینەوە یەك خێزان.



- واز لەمە بێنە برا، ئەم ڕەشاییانە چین لە دوورەوە بەرەو ڕوومان دێن؟

+ نازانم برا، تۆ بڵێی مرۆڤ نەبن؟ وەلێ مرۆڤ چی دەکا لێرە! ئێمە زۆر لە جادەکە دووركەوتووینەوە!

- چۆن لێرە لەپڕدا بە مامۆستا ناگەین، گەر شتێکی وا ڕووبدا لە خۆشیاندا هەڵدەپەڕم.

+ کورە مامۆستای چی برا، پێم وابێ ئەوانە لە دڕندە دەچن.

پیری دووەم بە ترسەوە: گەر دڕندە بوو چی بکەین و لەم چۆڵگە و تووشە[1] بۆ کوێ ڕاکەین؟

+ نازانم، وا نزیك بوونەوە، لە گورگ دەچن و دوو دانەشن.

ئەو دەمەی تەواو هاتنە پێشێ و زانیان دوو گورگی دڕندەن ترسێکی زۆریان لێ نیشت و بە هەموو هێز و توانایانەوە دەستیان بە ڕاکردن کرد و گورگەکانیش لەم بیابانە چۆڵەدا وەدوایان کەوتن.

دوو پیاوەکە لەگەڵ پیری و بێهێزیدا هەرچی وزەی جەستەیان هەبوو خستبوویانە گەڕ بۆ ئەوەی لەدەستی ئەم دڕندانە ڕزگار بین و بە خێراییەکی نائاساییەوە لەگەڵ هاوارکردندا ڕایان دەکرد. یەکێ لەوان بە هەموو هێزیەوە هاواری دەکرد: خودایە نامەوێ

---

(١) تووش: ڕێوبانی سەخت

بمرم بەر لە دۆزینەوەی مامۆستا، ئەی حەکیمی مەزن بە هانامان وەرە و بەم تاسەیەوە مەمبەرەوە.

ئەوان بەردەوام بوون لە ڕاکردن و تا دەهاتیش گورگەکان نزیکتر دەبوونەوە لێیان، چون هەرگیز مرۆڤ خێراییەکەی بە خێرایی گورگ ناگاتەوە، سەرەڕای ئەوەش ئەوان تەمەنەکەیان هەڵکشابوو، ئەو تین و هێزەی جارانیان لەدەست دابوو.

یەکەمجـــار بوو ئەم پیـــاوانە بەم چەشـــنە لەگەڵ مەرگدا ڕووبەڕوو ببنەوە، بۆیە هێندە ترسابوون کە ڕەنگیان بە تەواوی زەرد هەڵگەڕابوو. لەنکاو یەکێ لەوان کۆنترۆڵی خۆی لەدەست دا و پێی ڕاستەی وەرگەڕا و زۆر بە خراپی بەڕوودا بەربوویەوە، دیاربوو قاچی ڕاستی بە تەواوی ئازاری پێ گەیی بوو. پیاوەکەی تر کە ئەم دیمەنەی بینی لەبەر هاوڕێکەی وەستا و بە دەستەکانی هەوڵی دەدا زوو هەڵیسێنێتەوە بۆ ئەوەی گورگەکان پەلاماری نەدەن، وەلێ چون زۆر خراپ بەربوویەوە نەیدەتوانی بڕوا و هاواری بەسەر هاوڕێکەیدا دەکرد کە جێی بهێڵێ و دەیگوت: بڕۆ نەتبینمەوە برا خێرا لێرە ڕاکە، سوێند بە خودا ڕانەکەی لە ڕۆژی پەسڵانیش گەردەنت ئازا ناکەم. پێویستە یەکێکمان بمێنین بۆ دۆزینەوەی مامۆستا، نابێ هەردوو پێکەوە بمرین، لێم تێبگە و بڕۆ.

ئەوەی دیکەش بە هەموو هێزیەوە هاواری دەکرد: نارۆم هەرگیز بەم چەشنە بۆ ئەو دڕندانەت جێ ناهێڵم، یان دەبێ هەردوو لێرە بمرین و بخورێین، یانیش خودا هەردووکمان ڕزگار دەکا.

پیری دووەم بە توورەییەکی زۆرەوە: نابێ نا هەردوو بمرین، تۆ بیر لە دۆزینەوەی مامۆستا بکەرەوە مامۆستا، پەیمانمان دابوو بابەتەکە نەبەینە ڕۆژی پەسڵان و لە دونیادا ئەو ببینینەوە. دووبارەی دەکەمەوە سوێند بە خودا ڕانەکەی گەردەنت ئازا ناکەم.

ئەوان لەو قسانەدا بوون گورگە برسیەکان گەیشتنە سەر سەریان و یەکێکیان خۆی هەڵدا بۆ پیاوەکان و ئەوانیش بە جانتاکەی دەستیان بەرگریان لە خۆیان دەکرد و لە گورگەکانیان دەدا، وەلێ ئەم کارە بێ سوود بوو، چون گورگەکانی پتر توورە دەکرد و دووبارە هەڵمەتیان دەهێنایەوە. یەکێ لە گورگەکان جانتای یەکێ لە پیاوەکانی بە کەڵبە تیژەکانی گرت و ڕایکێشا و دڕاندی و کەلوپەلەکانی پەرش و بڵاو کردەوە.

لەنێو یەکێك لە جانتاکاندا دوو شووشە شەربەتی تێدابوو، پیاوەکان هەر یەکە و شووشەیەکیان بەدەست گرت تا بەرگری پێ لە خۆیان بکەن، وەلێ دیسانەوە بێ سوود بوو، دەی مرۆڤ لە کاتی مەترسیدا پەنا بۆ هەموو چشتێك دەبا بۆ ڕزگارکردنی گیانی شیرینی. دانەیێ لە دڕندەکان دووبارە هێرشی بردەوە و

قەپی لە دەستی پیاوێکیان دا و خێرا بریندارى كرد و خوێنی لێ هێنا. تا دەهات ئەوان پتر تووڕە و دڕتر دەبوون. پیاوەكان بە تەواوی دەلەرزین و هێزیان لەبەر بڕابوو، نەیاندەزانی بەرەو كوێ هەنگاو بنێن و ڕوو لە كام لا بكەن. دەیانزانی كە ڕزگاربوون لە دەستی ئەم دڕندە برسیانە ئەستەمە، وەلێ گیان هێندە شیرینە كە تا دوا ساتەكان ئامادەی بەرگری لێ بكەی.

بۆ دواجار یەكێ لە گورگەكان بازێكی بەهێزی دا و هێرشی هێنایەوە، لێ لە نیوەی ڕێگادا لەگەڵ دەنگی بەرزی تفەنگێكدا سنگی خوێناوی بوو و لوورەیەكی كرد و خێرا كەوت بە زەویدا و خوێنی تێكەڵاوی خۆڵی بیابانەكە بوو. لەگەڵ كەوتنی یەكێكیاندا دانەكەی تریش ترسی لێ نیشت و دەیهەویست بكشێتەوە، لەنكاو دەنگی گوللەیەك ئەویشی لە شوێنی خۆیدا سارد كردەوە و هەردوو لە پاڵی یەكتریدا كەوتن. دوو پیاوەكە كە بە تەواوی ڕەنگیان زەرد بوو بوو لەگەڵ بینینی ئەم دیمەنەدا ڕۆح بەبەر جەستەیاندا هاتەوە و خێرا سەریان بەرز كردەوە تا بزانن ئەمە چ فەریاد ڕەسێكە لە ڕۆژێكی هێندە سەختدا بە هانایان هاتووە!

زۆری پێنەچوو سێ پیاو بە تفەنگەوە لێیان هاتنە پێش و بە كەیف سازیەوە یەكێكیان هاواری دەكرد: لێمان دان، سوێند بە حەكیمی مەزن خراپمان لێدان. كورە بابە ڕاوچی هەبێ هەر بەخۆمانین. ئای خودایە لەم نێچیرە چەورانە، دەڵێن پێستەكەیان

پارەی چاك دەكا. دوو پیاوەكە بە سەراسیمەیی تێیان ڕامابوون و ڕاوچیەكانیش خەریكی بردنی جەستەی گورگەكان بوون و بە چەشنێ مامەڵەیان دەكرد وەك بڵێی دوو پیرەكەیان هەر نەدی بوو.

یەكێ لە پیرەكان گوتی: ئەی هاوار ئێوە چ فەریاد ڕەسێك بوون بۆمان لەم مەرگەساتەدا، هەرچی بكەین ناتوانین مزدی[1] ئێوە بدەینەوە برایان. زۆر زۆر سوپاستان دەكەین و خودا یارمەتی دەرتان بێ.

یەكێ لە ڕاوچیەكان وەدەنگ هات: ئێوە هیچتان بۆ ئێمە پێ ناكرێ جگە لەوەی پارەمان بدەنێ. گەر شتێكتان لایە داینێن و ئەگەرنا سەرمان مەیەشێنن و دووركەونەوە. ئێمە بۆ قازانجی خۆمان ئەم گورگانەمان كوشتووە و نیەتمان ڕزگار كردنی ئێوە نەبووە.

دوو پیاوە پیرەكە هەرچەندە ئەم قسەیان زۆر لە دڵ گران بوو، ئەو دەمەی سەیری سەروچاوی ڕاوچیەكانیان دەكرد دەتگوت ئەو جۆرە موجریم و بكوژانەن كە لە فیلمەكاندا بینیویانە، وەلێ یەكێ لەوان خێرا جانتاكەی دەرێنا و ئەو برِە پارەی لەلای بوو بە پیاوەكانی دا لە بەرامبەر ڕزگار كردنیان. ئەو دەمەی ڕاوچیەكان ڕۆیشتن یەكێ لە پیرەكان گوتی: ئێستا چۆن بگەڕێینەوە، ئۆتۆمبێلەكەمان دوورە و تۆش قاچت ئازاری پێ گەییوە؟

---

(١) مزد: پاداشت

+ خەمت نەبێ ئەگەر دەست بە ژێر باڵمەوە بگری دەتوانم تۆز تۆزە بڕۆم. بەداخەوە ئیمڕۆش وێنەی چەند جارە گەڕاین و دووبارە مامۆستامان نەبینیەوە. چیا و چۆڵ و دەشتایی نەماوە لە شاهێن و دەرەوەی شاهێندا چەندین ساڵە بۆی نەچین، نازانم ئەم هەموو ماوەیە مامۆستا بەرەو ئاسمان بەرز بۆتەوە یاخود لە ژێر زەمین دایە!

- باشە ئەمجارەش دەگەڕێینەوە، وەلێ با کەمێ دانیشین و ماندوو بوون و ترسمان بە تەواوی بڕەوێتەوە، دواتر دەست بە ڕۆیشتن دەکەین.

دوای نزیکەی نیو کاژێر پشوودان دوو پیاوە پیرەکە هەڵسان و بەڕێ کەوتن تاوەکو بگەڕێنەوە، وەلێ ئەمجارەیان چون دانەیەکیان پێی ئازاری هەبوو زۆر لەسەرخۆتر دەڕۆیشتن. دوای ماوەیەکی زۆر کە ئەندازەیەکی باشیان لە ڕێگاکە بڕی بوو، لەنکاو دیمەنێکی چاوەڕوان نەکراویان کەوتە پێش و هەردوو بە سەراسیمەیی لە شوێنی خۆیاندا چەقین! هەمان ئەو سێ ڕاوچیەی بەر لە ئێستا گورگەکانیان لەکۆڵ کردنەوە ئەمجارەیان تفەنگەکانیان ئاڕاستەی پیاوێکی پیر و کچێکی تازە لاوی شۆخ کردبوو!

کچە لاوە شۆخەکە لێیان دەپاڕایەوە کە واز لەم پیرە پیاوە بێنن و ئەو تاوانێکی نەکردووە، دیاربوو ناوی کەسێکی تریشی دەهێنا کە ڕاوچیەکان نەیکوژن و لەبری وی کچە بکوژن، وەلێ ڕاوچیەکان زۆر بە هەڕەشە و دڕندانە هاواریان بەسەردا دەکرد و



هەرچی جنێوی ناشیرین و ناشایستەیە پێیان دەدا. پیاوە پیرەکەش وەکو چیایەکی پتەو لەبەردەمیاندا وەستابوو و پێی دەگوتن لە حەکیمی مەزن بترسن و ئەم داماوە مەکوژن و دوور کەونەوە، وەلێ سێ پیاوەکە بە قسەکانی پیرەکە پتر تووڕەیی دەیگرتن و دەیانگوت ئەگەر قسەی زیاتر بکەی تۆش دەکەینە هاوڕێی ئەو و هەر ئێرە گۆڕی تۆش دەبێ.

ئەو دەمەی دوو پیاوە پیرەکە ئەو دیمەنەیان بینی یەکێکیان خێرا هاواری کرد:

ئەوە چی لێرە دەگوزەرێ و چ کێشەیەکتان هەیە؟

ڕاوچیەکان تێیان ڕوانین و پیاوەکانیان ناسیەوە و یەکێکیان گوتی: ئەمە کاری ئێوە نییە و خۆتانی تێ هەڵمەقورتێنن و بڕۆن. ئەمە شەڕەفە شەڕەف، ئەم دووانە کاری خراپیان ئەنجام داوە و پێویستە لێرە بکوژرێن. ئەگەر ئێوەش دەتانەوێ هاوڕێی ئەوان بن بمێننەوە.

لەگەڵ ئەم قسەیەدا پیرەکان ترسیان لێ نیشت و یەکێکیان گوتی: تکایە با بڕۆین و پتر لێرە نەوەستین، خۆمان تازە لە مەرگ ڕزگارمان بووە. ئەمانە پێدەچێ بۆ پیاو کوشتن هاتبن و بابەتەکە بابەتی شەڕەفە. خودا نەیکوشتین با بەدەستی خۆمان خۆمان نەخەینە نێو مەرگ. لەگەڵ ئەم قسەیەدا هەردوو خێرا لەوێدا دوور کەوتنەوە و هێندە نەڕۆیشتن گوێیان لە دەنگی تەقە بوو.



## سێ دێڕەکەی تری پێشەوا بوسیڕی



حەکیم سوهەیل دەستی کردەوە بە شیکردنەوەی چەکامەکە و بە دێڕی حەوتەم دەستی پێکرد کە هەر لەوێدا وەستابوون.

غەمباریت جێگیری کرد نەساغی و دوو هێڵی ئاو
وەك کوریکێ بـوارێ زەرد و ســۆر بـوون تێکەڵاو[1]

دوای ئەوەی دادگا بڕیاری دا کە پێشەوا بوسیڕی عاشقە و دوو بەڵگەی بەهێز هەن ئەوە دەسەلمێنن ئەوانیش فرمێسك و نەخۆشی بەردەوامن، دادگاکە هەر بەوەندە ڕانەوەستا و بەردەوام بوو لە هێنانەوەی بەڵگە و زناکی[2] تر کە بەڵێ ئەو بە تەواوی عاشق بووە. بۆیە دادوەرەکە فەرمووی: ئەی بوسیڕی، تۆ ئەو دەمەی ناوی خۆشەویستەکەت دەبیستی خێرا بای عیشق ئەم ناوە بە هەموو جەستەتدا بڵاو دەکاتەوە و سەرجەم خانەکانی لاشەت پەشێوی تێ دەکەوێ و لە غەمباری و نەساغیدا ڕەنگت زەرد هەڵدەگەڕێ. ئەم ڕەنگ زەردیەت کە بەهۆی عیشقەوە تووشت دێ هەر دەڵێی ڕەنگی ئەو کوریکە زەردانەیە کە لە

---

(١) عەرەبیەکەی:

وَأَثبَتَ الوَجدُ خَطَّي عَبرَةٍ وَضَنى     مِثلَ البَهارِ عَلى خَدَّيكَ والعَنَمِ

(٢) زناك: نیشانە

بەهاردا سەر هەڵدەدەن و کێو و دەشتەکان دەڕازێننەوە. ئینجا هەر لەم کاتەدا کە ڕەنگت زەرد هەڵگەڕاوە ئەسرینەکانیشت چەشنی دوو جۆگەلە هێڵی ئاو بەسەر کوڵمەکانتدا دێنە خوارێ، ئەم ئەسرینانە چونکە لەگەڵ خوێن تێکەڵاو بوون ڕەنگیان هێندە سوور بووە هەر دەڵێی لکە سوورەکانی درەختی عەنەمن[1]، یاخود هەر دەڵێی گوڵاڵە سوورەن و ئەو ناوەیان پێ ڕازاوەتەوە.

- ئەی هاوار! عیشق چۆن ئەم هەموو ڕەنگە جوانە دەئافرێنێ! ئایا کەسێ عاشق نەبێ چۆن دەتوانێ لەمە بگا!

+ بەڵێ کچەکەم، عیشق جۆرەها دیمەنی ڕەنگا و ڕەنگی جوانتر لە دیمەنەکانی بەهار دەئافرێنێ. ئەوەتا حەزرەتی نالی دەفەرموێ:

یەك ڕەنگم و بێ ڕەنگم و ڕەنگین بە هەموو ڕەنگ
بـەم ڕەنگە دەبێ ڕەنگ ڕژیـــی عیشقـی حەقیـقی

واتا من کەسێکم یەك ڕەنگم بەرامبەر هەموو مرۆیەك و ڕۆژێ لە ڕۆژان دوو ڕوویی و دوو ڕەنگیم بەرامبەر چ کەس نیشان نەداوە. لەگەڵ ئەم یەك ڕەنگیەدا هەمیشە بێ ڕەنگم، چون ئەم ڕێگای عیشقە ڕەنگ بە لاشەی مرۆڤەوە ناهێڵێ و هەزاران هەوراز و نشێوی تێدایە و پیاوی خۆی گەرەکە پێیدا تێپەڕێ.

---

(١) عەنەم: درەختێکە لقەکانی سوورن، هێندێکیش دەڵێن گوڵێکی سوورە.

ئەوەتا هەموو سیفاتی ئەم جیهانە لەمندا کۆبۆتەوە، لەیەك کاتدا لەش ساغ و نەخۆشم و زانا و نەزان و هۆشیار و بێ هۆشیشم. لە هەموو ڕوویەك و دیمەنێکی ئەم جیهانەدا دەردەکەوم، بەڵێ خۆشەویستی ڕاستەقینە هەر دەبێ بەم جۆرە ڕەنگی بۆ بڕێژرێ.

- ئەی خودایە عیشق دەردێکی چەند سەیرە! لەلایەك وێرانت دەکا و لەلایەکی تریش بە هەزاران شێواز ڕەنگینی و ڕازاوەییت پێ دەبەخشێ!

+ بەڵێ کچی خۆم بەڵێ هەر وایە، نەتبیستووە کە حافز دەڵێ:

ئەگەرچی مەستی عیشق وێرانی کردم وێـــران
لـێ بنچینەی وجـوودم هەر لەوێ بوو ئاوەدان

ئەو دەمەی عیشق وێرانی کردی تۆ لەم وێرانیەدا بگەڕێ و ئاوەدانی بدۆزەوە. خەنی لەو مرۆیەی کە عیشق کوشتی، چون ئەو عیشقە هەر کەسێکی کوشت بۆ هەتا هەتایە ناوەکەی بە جاویدانی هێشتەوە.

دوای ئەوەی پێشەوا بوسیڕی هەموو ڕێگاکانی لەبەردەم داخران و چەند شاهێدێك شایەدیان لەسەری دا و شایەدەکانیش کەسانی بێگانە نەبوون، چون نە فرمێسك، نە لاوازی و نەخۆشی کەسانی غەریبە و بێگانە نیین بە پێشەوا بوسیڕی. هەروەك چۆن ئەو شاهێدەی لە بەسەرهاتی حەزرەتی یوسفدا شایەدی لەسەر

زولەیخادا کەسێکی بێگانە نەبوو بەڵکو هەر خزم و کەسی خۆی بوو. ئیدی لێرەدا پێشەوا هیچ ڕێگایەکی بۆ نەمایەوە و دانی بەوەدا هێنا کە بەڵێ ئەو عاشقە و فەرمووی:

شەوڕەوی کردە لای من ئیمشۆکە خەیاڵی یار
عیشق هەردەم چێژەکان لەناو دەبا بە ئازار[1]

بەڵێ ڕاست دەکەی ئەی دادوەر، من تا ئێستا دانم بەوەدا نەدەهێنا کە عاشقم، وەلێ ئێستا بە ناچاری لەبەردەمی دادگادا دان دەهێنم و دەڵێم هەموو ئەوانەی گوتت ڕاستن، بەڵێ من عاشقم و بەهۆی وەبیرهاتنەوەی خۆشەویستەکەم بوو ئاوا فرمێسك و خوێنم تێکەڵ کردبوو. ئەگەر لێشم دەپرسی هۆکار چی یە ئاوا خۆشەویستەکەت بیر هاتۆتەوە ئەوە بە ڕاشکاوی پێت دەڵێم کە ئەمشەو خەیاڵی ئەو کەسەی خۆشم دەوێ لە خەومدا شەوڕەوی کردە لای من و هاتە لام، ئیدی ئەم خەیاڵە خەوی لێ ڕەواندمەوە و چاوەکانم نەیانتوانی چیدی بنووقێنەوە.

دیارە پێشەوا بوسیری لەم کاتەدا دولبەرەکەی هاتۆتە خەوی کە ئەمە خۆشترین خەیاڵ بووە لەلای و ناتوانێ وەکو پێویست وەسف و ستایشی بکا، دواتر کە بەهۆی ئەم خەیاڵە خۆشەوە لەخەو ڕاپەڕیوە و زانیویەتی ئەوە تەنێ خەیاڵە و ڕاستی نییە

---

(١) عەرەبیەکەی:

نَعَم سَرَى طَيفُ مَن أَهوى فَأَرَّقَني     وَالحُبُّ يَعتَرِضُ اللَّذّاتِ بِالأَلَمِ

خەوی لە چاوان تۆراوە و دووبارە غەمباری هێرشی بۆ هێناوەتەوە. دیارە کە هەر مرۆڤێك خوو بە هەر کەسێك یا شتێکەوە بگرێ و خۆشی بووێ ئەوا وێنەی ئەو کەس و شتە لە خەیاڵیدا دەچەسپێ و جێگیر دەبێ، ئەم جێگیر بوونەش وادەکا بەردەوام لەخەودا خۆشەویستەکەی ببینێ و خەیاڵەکەی بۆ لێبدرێتەوە. ئەمە شتێکی سەیر نییە کە خەیاڵی دولبەر خەو لە مرۆڤ بڕەوێنێتەوە، چونکە سروشتی عیشق و خۆشەویستی وەهایە کە خۆشی و چێژەکان لەناو دەبا و دەیانگۆڕێتەوە بە ئێش و ئازار. بێگومان لەمەو پێشیش لێی دواین کە عیشق چۆن ئاگر لە دڵی مرۆدا هەڵدەکا و تەڕی لاشەی کەم دەکاتەوە، دەی بێگومان ئەمەش وادەکا خەو لە مرۆڤ بڕەوێتەوە و نەبێ بە هاوڕێی.

بەڵێ ئەو دەمەی مرۆڤ لە خەودا بە دولبەر و مەحبووبی دەگا و دواتر وەهۆش دێتەوە و دەزانێ ئەمە گەیشتنێکی حەقیقی نەبووە و لە ڕاستەقینەدا دوورە لێی، لەو دەمەدا هەموو ئازارەکان بە سوپایەکی مەزنی خودان چەك و مەتاڵەوە[1] دێن و تەواوی خۆشیەکان لەناو دەبەن. لەو کاتەدا مرۆڤ خۆزگە دەخوازێ واگا نەهاتبا و هەر لە خەودا مابایەوە، ئاخر ئەگەر خەوێك دولبەری تێدا ببینرێ مرۆڤ لەو کاتەدا چی لە هۆشیاری بکا! لەبەر ئەمەیە کە سەید کامیلی ئیمامی فەرموویەتی:

---

(١) مەتاڵ: قەڵغان

دەڵێن یارم لە شەودا دێ و لە خەودا
لــــە بێداری دڵــم بێزارە ئـــەمشەو

کچی خۆم... عیشق بچێتە نێو هەر دڵێکەوە دەیگۆڕێ لە دڵێکی ئاژەڵی تاریکی دوور لە نوورەوە بۆ دڵێکی نوورانی و ڕۆحی و فریشتە ئاسا. ئەو مرۆڤە لە خەوی غەفڵەت واگا دێنێتەوە. تۆ هەندێ جار بە غافڵی پەرستشەکانت ئەنجام دەدەی چونکە عیشقی لەگەڵ نییە، بڕۆ خەریکی یاری و شۆخیەکانت بە و ئەو دەمەی دڵت هاتەوە بە ئاگاییەوە وەرەوە بۆ پەرستشەکە.

یەکێ لە پیاوباشان فەرموویەتی: بەندایەتی لەگەڵ تۆسقاڵە گەردیلەیەك لە خۆشەویستی لەلام شیرینترە لە بەندایەتی حەفتا ساڵ بەبێ خۆشەویستی. بەڵێ کچەکەم، ئەو کەسەی عیشق نەیهەژێنێ پێویستە لەسەری بەدوای دکتۆرێکدا بگەڕێ، چون دڵی ئەم مرۆڤە کەم و کوڕی تێدایە. دڵەکان شوێنی عیشقن و هیچی دی، لە عیشق بەولاوە هەر شتێکی تری تێ بخەی زیانت بە دڵت گەیاندووە.

ئاگادار بە و بزانە چ جۆرە عیشقێکم مەبەستە کچەکەم، باسەکە باسی ئارەزوو نییە. هەر ئەو عیشقەیە کە حەزرەتی مەولانا دەربارەی فەرموویەتی ئەمە ئاگرێکە و هەرکەسێ ئەو ئاگرەی نییە بریا هەر نەبا. هەرچەندە ئەم عیشقە لەسەرەتادا وێنەی ئاگرێکی سووتێنەرە و جەرگەکان دەبرژێنێ و دووکەڵەکەی

مرۆیان دەخنکێنێ و دڵەکان ڕەش دادەگەڕێنێ، چون لە قۆناغێکی مەجازی دایە، وەلێ لە کۆتاییدا دەبێ بە لامپایەکی داگیرساو و چرایەکی لیپاولیپ لە نووری ڕۆشنکەرەوەی حەقیقی کە لە هەر شوێنێکدا پڕشنگ بداتەوە و لە هەر دڵێکدا نومایان ببێ ئەوا ئەو جێگایە دەکاتە زێڕێکی بێ خەوش و ساف، چون عیشقی حەقیقی وێنەی کیمیا و ئیکسیر وەهایە کە دڵەکان دەکاتە کاسەیەکی زێڕی نایاب و دوور لە فێڵ. بەڵکو دەیانکاتە دڵانێکی زیندوو پاش ئەوەی کە ژەنگی تاوانیان گرت و مردن، وەك چۆن دەڵێن مادەی ئیکسیر لە توانای دا هەیە کە مس بگۆڕێ بۆ زێڕ.

دەبێ تا ڕۆژی قیامەت عاشقان مەمنوون و سوپاسگوزاری خودابن کە هەمیشە ناوی ئەوان لەگەڵ ناوی دولبەرەکەیاندا دەهێنرێ. ئاخر ئەگەر عیشق نەبێ تۆ چی ناوت لەگەڵ ناوی ئەودا بێ پێم بێژە؟ ئەو بوڵەند و تۆ نەوی، ئەو سەردار و تۆ نۆکەر، ئەو پادشا و تۆ گەدا. ئای چەندە جوان مەحوی مەزن وێنای ئەم دیمەنەمان بۆ دەکا و دەفەرموێ:

ئەگەر لەیلا ئەگەر فەرهادە، تا حەشــر هەر بن مەمنوون
لە یومنی عیشقە، فەیزی حوسنە، وا بەم ڕوتبە نائیل بوون
دەکەن ڕەشتــاڵەیێکی دەشتەکی باســی لەگــەڵ شیریـن
دەبــەن بەرد هەڵکەنێکی کێزری ناوی لـەگەڵ مەجـــنون

بەڵێ لەیلا و فەرهادیش هەر دەبێ سوپاسگوزاری عیشق بن، چون ئەوە عیشقە بەرزی کردوون و وایکردوە لەیلایەکی ڕەشتاڵەی دەشتەکی ناوی لەگەڵ شیرینی شاژنی کۆشکی خوسرەودا بهێنرێ، هەر عیشقیشە وای لە فەرهادێکی بەردهەڵکەنی هەڵەشە کردوە ناوی لەگەڵ بۆ عیشق سووتاوێکی وەکو مەجنوونی عامیری ببرێ.

ئینجا دوای ئەوەی پێشەوا بوسیری دانی بە عیشقەکەی دا هێنا، ئەمجارەیان هەستی کرد کەسێك بە توندی لۆمەی دەکا لەسەر عیشقەکەی و پێی دەڵێ بۆچی تۆ لە هیچ و خۆڕا ئاوا خۆت ڕەنگ زەرد و نەساغ کردووە و چەشنی ئەم خەڵکانەی دی ژیان بەڕێ ناکەی؟ چ پێویست دەکا عیشقی کەسێك وەها غەمبارت بکا و فرمێسك لە چاوانت بێنێ؟ بڕۆ وێنەی ئەو خەڵکە دەست بە ڕابواردن و شۆخیەکانت بکە و هەتا لە دونیا ماوی چێژی لێ وەرگرە. پێشەوا بوسیری بە قسەی ئەم لۆمەکارە ڕازی نابێ و وەڵامی دەداتەوە و دەفەرموێ:

ئەی لۆمەکار عیشقەکەم چەشنی بەنی عوزریە
دیارە تۆ لەو لۆمەدا هیچ ئینســـافێکت نییـە[1]

---

(١) عەرەبیەکەی:

يا لائِمي في الهَوى العُذرِيِّ مَعذِرَةً　　مِنّي إِلَيكَ وَلَو أَنصَفتَ لَم تَلُمِ

ئەی ئەو کەسەی لۆمەم دەکەی لەسەر عیشق و پێم دەڵێی واز لە دولبەرەکەت بێنە، مەگەر نەتبیستووە کە هۆزی عوزریە هۆزێك بوون لە یەمەن هێندە بە توندی عاشق دەبوون زۆریان بەم دەردەوە سەریان دەنایەوە و دەمردن. ئەوە بزانە کە عیشقەکەی من بۆ یارەکەم وێنەی عیشقی هۆزی عوزریە وایە و بە ئاویلکە(١) و مردنیش ناتوانم دەستی لێ هەڵگرم.

دواتر تۆ ئەگەر کەسێکی عاقڵی دەبوایە بتزانیبا کە خوداش داوایەك ئاڕاستەی مرۆڤ ناکا لە سەرووی تاوانای مرۆڤەکە بێ، عیشقیش یەکێکە لەو ئازارانەی لە دەسەڵاتی مرۆڤدا نییە و هەرگیز ناکرێ مرۆڤ لەسەری لۆمە بکرێ. کەوابوو ئەی لۆمەکار بزانە لۆمەکەت هیچ سوودێك بە من ناگەیەنێ و بگرە ئەگەر تۆزێ ویژدان و دادپەروەریت تێدابا لەسەر ئەم عیشقە جوانە لۆمەت نەدەکردم.

بەڵێ هەمیشە کەسانێك کە لە عیشق تێناگەن دێن و مرۆیە عاشقەکان بەتەنگ دێنن و لۆمەیان دەکەن و قسەی نەشیاویان پێ دەڵێن، چون ئەوان ئەم دەردە جوان و پاکەیان نەچەشتووە. حەزرەتی نالی یەکێکە لەوانەی زۆر بە توندی وەڵامی ئەو کەسە دەداتەوە کە دێ بە ناوی ئامۆژگاری پێی دەڵێ واز لە دولبەرەکەت بێنە و ئارامگر بە لەسەر ئازارەکانت، ئەویش دەفەرمووێ:

---

(١) ئاویلکە: سەرە مەرگ



مووددەعی زەجرم دەكات و پێم دەڵــێ سەبرت ببێ
كەر بە لەعنەت بێ كە كەی عاشــق قەراری گرتووە

بەڵێ بەوپەڕی توندی وەڵامی دەداتەوە و پێی دەڵێ مرۆی وەها ئاژەڵی بەر نەفرەت بكەوێ، چونكە ئەگەر عەقڵی هەبا دەبوایە زانیبای مرۆی عاشق ناتوانێ هەرگیز لە دووری مەعشووقەكەی قەرار بگرێ. لێرەدا پێم خۆشە بەسەرهاتێكت بۆ وەگێڕم لەسەر عیشق كە چۆن هەندێ جار مرۆڤ لەنێو دەبا، جا ئەوە عیشقێكی دونیاییە و تۆ بیر لە عیشقە ئیلاهیەكە بكەوە دەبێ چۆن بێ! یەكێك لە شاعیرەكان بەناوی ئەسمەعی ڕۆژێكیان ڕێگای دەكەوێتە دێیەك، دەگوترێ كە ڕێی كەوتۆتە نێو هۆزەكەی عوزریە كە تازە لە شیكردنەوەی دێڕەكاندا باسمان كرد. ئەو دەمەی ئەسمەعی بەسەر گردێك دەكەوێ دەڕوانێ بەردێكی سپی گەورە ئەم دێڕە شیعرەی لەسەر نووسراوە:

ئەی كۆمەڵەی عاشقــان بڵێن بــۆ خـــاتــری خودا
گەر لاوێك تووشی دەردی عیشق هات دەبێ چ بكا؟

ئەسمەعیش لە ژێرەوە وەڵامی دەداتەوە و دەنووسێ:

عیشقەكەی بەردەوام كا و نهێنیشی وەشـارێ
ئارام و سەبری هەبێ و ترسیش لە لۆمەكارێ



بەیانی کە بەوێدا تێپەڕ دەبێتەوە سەیر دەکا لەژێر دێڕەشیعرەکەی ئەودا دێڕە شیعرێکی تر نووسراوە و وەڵامی دراوەتەوە:

چۆن ئارامگربێ کاتێك عیـشـــق کوژەری لاوە
لە گشت شەو و ڕۆژێکدا ڕۆحی پارچە کراوە؟

ئەسمەعی کە ئەمە دەبینێ خێرا لە ژێرەوە بۆی دەنووسێتەوە:

گەر ئـارامـــی نـــەگـــرت و داینەپۆشی نهێـنی
بێجگە مەرگ نابینم هیچ شت سوودی بۆ بێنی

ڕۆژی دواتر بەلای بەردەکەدا تێدەپەڕێ بۆ ئەوەی بزانێ چی وەڵام دراوەتەوە، لێ بەداخەوە تازە گەنجێك لەوێدا کەوتووە و گیانی لەدەست داوە و لەژێر دێڕەکەی ئەسمەعیدا نووسیویەتی:

مردم و بە گوێم کردی بەڵام تۆش ئەگەر یـــاری
بگەینە سەلام بەو کەس بێبەش بووم لە دیداری

بەڵێ ئەمە نموونەیەکە لە نموونەی ئەو کەسەی بەهۆی عیشقێکی دونیاییەوە گیانی لەدەست دا و بەرگەی نەبینینی دولبەرەکەی نەگرت. ئێمەش ئەم هەموو ساڵە لە دولبەری حەقیقیمان دوورین و زۆریش لەلامان ئاساییە! بەر لەوەی نیوەڕۆمان بەسەر دابێ بگرە ئەم پارچە سەموونە بخۆ و خۆت کۆکەرەوە کچم. حەکیم سوهەیل سەری ژێر زەمینەکەی هەڵدایەوە و پارچە سەموونەکەی لەنێو قاپێکدا لەگەڵ بادیەك

ئاو ڕادەستی کچە کرد و قایشەکەی خۆی لە نێوقەدیدا توند کردەوە و پێڵاوەکانی کردنە پێ و چاوەڕێی کچەی ژاکاوی دەکرد نانەکەی بخوا و بێتە دەرێ.

دوای خواردنی سەموونەکە کچە هاتە گۆ: مامۆستای گەورەم، ئەزیەت نابێ لەلاتان چەند خولەکێك چاوەڕێم بکەن تۆزێ پەرستش ئەنجام بدەم؟ خۆت دەزانی تازە ئەم ڕێگا جوانەم ناسیوە و دەشترسم کۆتا ڕۆژەکانم بێ و نەتوانم وەکو پێویست لە خزمەتی خوداکەم دابم.

+ ئەزیەتی چی کچم، بگرە زۆریشم پێ خۆشە.

- ئەگەر مردم تۆ بڵێی لە جیهانەکەی تر نێردراوی مەزن ببینم و بتوانم بچمە لای؟

+ دەیبینی ئینشاڵلا کچم دەیبینی، وەلێ ئینشاڵلا تەمەن درێژ دەبی و پتر لەنێو پەرستشەکانت دەمێنیەوە.

- ئەگەر ئەو ببینم هیچ سووم لە مردنەکەم نابێ، بەڵێ هیچ سووم لێ نابێ.

دوای چەند خولەکێك کچە هاتە دەرێ و هەردوو بەرەو لادێکە بەڕێ کەوتن، ڕێگایەکی زۆریان بڕی و هێندەیان نەمابوو بە تەواوی لە لادێکە نزیك بکەونەوە. سوهەیلی حەکیم لە پێشەوە وردە وردە دەڕۆیشت و کچەی ژاکاویش وەدوای کەوتبوو.

هێندە دڵی خۆشبوو کە لەگەڵ حەکیم سوهەیل ڕێدەکا و ئەوینی حەقیقی ناسیوە هەر دەتگوت تازە لە دایك بووە و هەموو ئێش و چورتمەکانی[1] خۆی بیر چووبوونەوە.

وایدەزانی گەیشتۆتە ویساڵی دولبەری و خەریکە لەگەڵ ئەودا بە ئەسپێکی باڵدار بەسەر تەواوی جیهاندا دەفڕن.

لەنکاو ئەو سێ پیاوەی سەرەتا هێرشیان کردە سەرماڵی حەکیم سوهەیل و لیایان نەدۆزیەوە بە چەکەوە لەبەر دەمیان پەیدا بوونەوە و حەکیم و کچە لە شوێنی خۆیاندا چەقین و شادیەکەیان لە کچە کردە شین. وادیاربوو ئەمانە لەو کاتەوە نەگەڕاونەتەوە ماڵێ و بەردەوام بەدوای خاتوو لیادا گەڕاون. خێرا یەکێك لە پیاوەکان هاواری کرد:

ئەوەتا لێرەیە ئەم چەتیوە، ئای خودایە ئێمە کوێی بۆ دەگەڕاین و لە کوێ پەیدامان کرد، وادیارە نێچیرێکی تریشی لەگەڵ خۆیدا هێناوە.

یەکێکی تریان ڕووی لە لیا کرد و بە پێکەنینەوە گوتی: لەبەر ئەم پیرە پەککەوتەیە لە ماڵێ هەڵاتووی کچێ؟ خەڵك وەدوای گەنج و جوانی و سەروەتەوە دەگەڕێ تۆ بەدوای چیەوەی! سەیرکەن برایان، پێم وابێ ئەوە هەمان ئەو پیرەیە کە دوێنێ

---

(١) چورتم: سەغڵەتی و دەردی سەری.

چووینە ماڵەکەی و جێگای لیای پێ نەگوتین، واچاکە ئێرە بکەینە گۆڕی هەردووکیان، چون هەردوو خیانەتکارن.

ئەویتریان هاتە دەنگ: نا بابە، بۆچی دەستمان سوور کەین بە خوێنی ئەم پیرە گڵاوە، کچەی خۆمان دەکوژین و دەگەڕێینەوە. ئەمە تەنێ دوو ساڵی تر دەژی و دەمرێ، واچاکە ئێمە باڵا بدۆزینەوە باڵا، ئەم هەتیوە نەمردووە.

خاتوو لیا لەگەڵ هێنانی ناوی باڵادا لە شوێنی خۆیدا موچڕکێکی بە لاشە داهات و لە هارژنی دا: نا تخوا ئەو مەکوژن، نە ئەم پیاوە پیرە تاوانێکی هەیە نە باڵاش تاوانێك، تەنێ من تاوانبارم من. ئەگەر دەتانەوێ ڕووی خۆتان لەنێو خزم و کەستان سپی بکەنەوە من بکوژن و بگەڕێنەوە. سوهەیلی حەکیم کە وەکو شاخێکی پتەو لە بەردەمی کچەدا وەستابوو لە سەرەتادا تەنێ سەیری دیمەنەکەی دەکرد و یەك یەك لە پیاوەکان ڕادەما، لەنکاو ڕوانی دوو پیرە پیاو لەلای ڕاستەوە هاتن و ئەوانیش بۆ تاوێك سەرنجیان دایە دیمەنەکە و یەکێکیان هاواری کرد کە چی لێرەدا دەگوزەرێ، لێ بە خێرایی سێ جەللادەکە دوو پیاوەکەیان ترساندن و لەوێ دووریان خستنەوە.

حەکیم سوهەیل بە چەشنێ لەم دوو پیاوە ڕامابوو هەر دەتگوت دەزانێ کێن و ناسیاوی کۆنی لەگەڵیان هەیە. دواتر بەوپەڕی بوێریەوە چاوەکانی خستە نێو چاوی جەللادەکان و



داوای لێ دەکردن لە خودا بترسن و کەسێك بەهۆی هەڵەیەکەوە لەناو مەبەن کە خودا مافی ژیانی پێداوە، لێ ئەوان لەگەڵ هەر قسەیەکی حەکیم سوهەیلدا پتر ئاتەشی دەبوون و دەیانگوت ئەگەر زیاتر بدوێی تۆش ڕزگارت نابێ و هەر لێرەدا دەنێژرێی.

ناوە ناوە حەکیم سوهەیل سەیرێکی لیای دەکرد و دەیزانی ترسێکی زۆری لێ نیشتووە و ڕەنگی بە تەواوی پەڕیوە، لەبەر خۆیدا زاری دەجووڵاند و بەردەوام نزای دەکرد کە خودا لە شەڕی ئەم خراپەکارانە بیانپارێزێ. هەر جارێ لە خاتوو لیاشی بڕوانیایە دەیدی زاری دەجووڵێنێت و دەقە ئاینیەکان لەبەر خۆیدا دەخوێنێتەوە.

سوهەیلی حەکیم بۆ تاوێ چاوی لەسەر یەك دانان و ڕێك لەو کاتەدا دیمەنی دڵارای لاوی هاتەوە بەر چاوان کە بەبەر چاوی ئەم هەموو خەڵکە بە غەدر کوشتیان و لە خوێندا گەوزاندیان. ڕێك هات و هاوار و پاڕانەوەی ئەم کچە بەستەزمانە دووبارە لە گوێی سوهەیلدا دەزرینگایەوە و بەڕوونی دەیدیت کە چۆن خوێنەکەی جۆگەلەی بەستووە و بە کۆڵان و بەردەم ماڵەکانی شاهێندا غلۆر دەبێتەوە. لەو دەمەدا حەکیم سوهەیلی پیر ئەسرینەکانی دابەزین و دڵۆپ دڵۆپ لەسەر ڕیشە سپیەکەیدا دەنیشتن و لانەیان دادەنا. جەللادەکان دوای چەندین قسە و گوتەی ناشیرین هەرسێ تفەنگەکانیان ئاڕاستەی لیای تازە لاو کرد و سوهەیلی حەکیمیش هیچ دەسەڵاتێکی نەبوو جگە لەوەی نزا بکات و سزای خودا بە

بیری جەللادەکاندا بهێنێتەوە. حەکیمی پیر بوێرانە لەبەردەم لوولەی تفەنگەکاندا ڕادەوەستا و کچەی دەخستە پشتی خۆیەوە بۆ ئەوەی بەر ئەو بکەوێ و لیای تازە لاو نەمرێ، لێ ئەمە بێسوود بوو، چون گەر گوللەکان بەر حەکیمیش کەوتبان دواجار لیاش ڕزگاری نەدەبوو لەبەر دەستیان.

پیاوەکان مشتومڕی ئەوەیان بوو کە کامیان بیکوژێ و ئەم شەڕەفە دەست بخا، حەکیم و کچەی ژاکاویش ساتێ زاریان نەدەوەستا لە ویرد و خوێندنەوەی دەقە ئاینیەکانیان.

لە کۆتاییدا جەللادەکان بڕیاریان دا لە ئاتەکی یەکەوە بوەستن و هەرسێ بە یەکجار و لە یەك کاتدا گوللەکانیان ڕووە و کچە بتەقێنن، ئەمەش بۆ ئەوەی هەرسێ شەڕەفی کوشتنەکەیان پێ ببڕێ و لە یەك کاتدا کچەی بەستەزمان بە گوللەی هەموویان ڕۆحی دەربچێ. ئەو دەمەی خاتوو لیا ویردەکانی بە کۆتا هێنا بە بوێریەکی یەکجار زۆرەوە خۆی لە پشتی حەکیمی پیر لادا و لەبەردەم هەرسێ براکەیدا چەشنی کێوێکی داکوتراو چەقی. برایەکانی هەرسێ نیشانەکانیان ڕاست دەکرد بەرەو سەری کچە و دەستیان لەسەر پەلەپیتکەی تفەنگەکانیان توندتر دەکرد.

کچەی ژاکاو لە دواساتەکاندا بەبێ ویستی خۆی پێیەکانی دەلەرزین و ڕەنگی پتر تێك دەچوو. بۆ دواین جار ئاوڕێکی بەلای حەکیم سوهەیل دایەوە و گوتی:

تۆ دڵنیای لە جیهانەکەی دی نێردراوی مەزن دەبینم؟

سوهەیلی حەکیم کە فرمێسکی وردە وردە لە چاوان دادەباڕین بە هێمنی گوتی:

بەڵێ دڵنیام کچم، تۆ یەکێك دەبی لە شەهیدەکان و زۆر بە زوویی بە خزمەتی دەگەی.

حەکیمی پیر قسەکانی تەواو نەکردن جەللادەکان دەستیان بە پەلەپیتکەوە ناو مێشکی کچەی ژاکاویان پڕژاند و دەشتاییەکەیان سوور کرد لە خوێن.

یەکێکیان خێرا تفەنگەکەی بە ئاڕاستەی حەکیم سووڕاند، لێ براکەی لێی هێنایە خوار و گوتی: کارێکمان بە کوشتنی ئەودا نییە و با بڕۆین لێرە.

سوهەیلی حەکیم بە بینینی ئەم دیمەنە بە تەواوی تاسا و جەستەی بێتاقەتی وەکو سەرما بردوویەك دەلەرزی و ئەملاو لای دەکرد کە دەتگوت لە ڕۆژێکی باسریشك[1] دایە و ڕیشە سپییەکەی سەرپاکی تەڕ بوو بوو.

جەستەی بێ گیانی کچە دەتگوت هەمان جەستەی بێ گیانی دڵارایە و لەنێو ئاپۆڕای خەڵکەکەدا کەوتووە، لێ خوێنی دڵارا بەنێو خەڵکی دادەڕۆیی و خوێنی لیا بەنێو بیابانەکەدا. سوهەیلی

---

(١) باسریشك: باوبۆران، بارینی بەفر و باران لەگەڵ بادا.

حەكیم بەرگەی ئەو دیمەنەی نەدەگرت و كەوتە سەر چۆك، ئەو لە ترسی ئەم دیمەنانە خۆی لە تەواوی خەڵكی ون كردبوو، كەچی لەم بیابانەشدا هێشتان كوشتن و جودایی یەخەی بەر نادەن.

خوێنی سووری لیای داماو چەشنی جۆبارێك بە ڕەوانی ڕێی دەكرد، لەگەڵ خۆڵ و تۆزی بیابانەكەدا ئاوێتە و دەست لەملان بوو بوو. بە زوبانی حاڵ دەیگوت ئەوەتا دایكە گەڕامەوە و تا دەهات توندتر باوەشی بە خۆڵەكەدا دەكرد و دەتگوت لە ڕۆژی ئەزەلەوە یەكتریان نەبینیوە. سوهەیلی حەكیم چاوەكانی خستنە سەر یەك و بە ئاشكرا دەیدیت كە چۆن بەهۆی ئەم خوێنە سوورەوە بیابانەكە هەزاران نەسرین و سۆسەن و وەنەوشە و چارانچەقیلەی[1] دەركردووە و هەر چوار لای ڕازاوەتەوە. ئەسرینەكانی حەكیمیش لەگەڵ خوێن و گڵەكەدا یەكیان گرتووە و گوڵەكان نەشونوما پێ دەكەن.

ئای ئەم بیابانە ڕەق و وشكە چۆن لە چاو تروووكانێكدا هەزاران گوڵی ڕەنگ ڕەنگ و ڕازاوەی دەركرد! دووبارە لەبەردەمی حەكیم سوهەیلدا گوڵێكی سوور بۆوە قوربانی،دووبارە جەللادەكان چاویان بە جوانیەكان هەڵنەهات و خونچەیەك كە تازە پێی خستبوویە سەر خۆڵی ژیانەوە لە ڕەگ و ڕیشە دەریان هێنا. دووبارە ڕقیان بەسەر ئەویندا زاڵ كردەوە، دووبارە لە بەرامبەر عیشقدا دڕندەییان نواند.

---

(١) چارانچەقیلە: گوڵاڵە سوورە.



بەڵێ خاتوو لیا کە تەواوی ڕۆمانەکەی بە دەستی خۆی نووسیبوو لەوێدا دڕندەکان کردیانە نێچیر و کۆتاییان بەو هەناسانە هێنا کە بەم دواییانە تەنێ لەگەڵ ناوی خودادا دەهاتنە دەرێ، وەلێ ئەم کچە لە دواساتەکانیدا بردیەوە و بەر لە مردنی ئەوینە گەورەکەی دۆزیەوە. سوهەیلی حەکیم بە چاوی پڕ لە ئەسرینەوە لەسەر چۆك هەڵسایەوە و وردە وردە بەرەو ژوورە بچووکەکەی وەڕێ کەوتەوە و گۆزەیەك ئاوی لەگەڵ خۆی هێنا و بە جەستە خوێناویەکەی داکرد و هەر لەوێدا بە تەنیا گۆڕی بۆ هەڵکەند و بە جلەکانیەوە ناشتی. وەلێ سەیر لەوەدا بوو ئەو دەمەی حەکیم چوویەوە ماڵێ هەرچەندە سەیری کرد و چاوی گێڕا ڕۆمانەکەی نەدۆزیەوە، لەوە سەراسیمەبوو کە دەبێ کێ لەو ماوە کورتەدا سەردانی ئەو ماڵەی کردبێ و ئەو دەفتەرەی بردبێ!

دوای ناشتنی کچە نزیکەی کاژێرێ گۆڕەکەی جێ نەهێشت و خەریکی خوێندنەوەی دەقە ئاینیەکان بوو لەسەری. لەنکاو هەستی بە نزیك بوونەوەی کەسێ کرد و ئاوڕی دایەوە، بینی تازە لاوێکی جوانی خاوەن ڕیشێکی تەنك و ڕوخسارێکی سپی و سوور لێی نزیك بوویەوە و سەلامی لێکرد. حەکیم سوهەیل بە زوویی تازە لاوەکەی ناسی و وەڵامی سەلامەکەی دایەوە.

گەنجەکە بە پەشۆکاویەوە پرسی: دەتوانم بزانم ئەمە گۆڕی کێ یە؟ پێدەچێ کەسێك تازە لێرە کوژرابێ و ئەم خوێنە زۆر تەڕە؟

سوهەیلی حەکیم بە نەرمی وەڵامی دایەوە: دانیشە کوڕم باڵا، من پرسیارێکت لێ دەکەم، ئەگەر وەڵامت دامەوە پێت دەڵێم گۆڕی کێ یە.

باڵا بە سەرسامیەوە: ماشەڵا لەتۆ قوربان، چۆن ئاوا یەکسەر ناومت زانی و تۆ کێیی؟! پێدەچێ یەکێ بی لە دۆستانی خودا!

+ واز لەوە بێنە کوڕم، هیچم لێ مەپرسە و تەنیا پێم بێژە ئەو شەوە بۆچی چووی بۆ ماڵی خاتوو لیا، خۆ تۆ کەسێکی دیندار بووی؟

باڵا لەگەڵ ئەم قسەیەدا هێندەی دی واق بوو بە پیاوە پیرەکەدا و خێرا دەستی بە گریان کرد و گوتی: سوێندت بۆ دەخۆم ئەوە فێڵ بوو لێم کرا. ئەو شەوە تێلێکم بۆ هات و کە هەڵم گرت یەکێ لە براکانی لیا بوو بە گریانەوە گوتی:

بەداخەوەم بۆ ئێوە باڵا، زۆرم حەز دەکرد خوشکەکەم بە دڵی خۆی شووی کردبا، وەلێ دووبارە بەداخەوە کە برا گەورەکانی ناهێڵن. من برای بچووکی ئەوم و هیچم لەگەڵیان پێ ناکرێ. ئەوان ئێستا لیایان لە ژوورەکەی خۆیدا بەستۆتەوە و دەیانهەوێ بە چەقۆ هەموو گیانی زیواڵ زیواڵ بکەن و بە ئازارێکی زۆرەوە بیکوژن. تکات لێ دەکەم وەرە و ڕزگاری بکە لە دەستیان، وەرە و منیش یارمەتیت دەدەم، تەنێ وەرە و با ببینە دوو کەس و بەڵکو بتوانین ئەم بەستەزمانە ڕزگارکەین لە دەستی ئەم



دڕندانە. تکایە باڵا یەك سانیەش دوامەکەوە و وەرە ژیانێك ڕزگار بکە. ئەم ڕێویە هێندە بە فێڵ و گریانەوە قسەی دەکرد کە هیچم نەبینی و خێرا دەستم دا چەقۆیەك و هەڵهاتم بەرەوماڵیان و ڕوانیم دەرگاکە کەمێکی والایە و خێرا خۆم بە ژووریٚ دادا. ئەو دەمەی چوومە ژووریٚ سەیرم کرد هەموو ژوورەکان تاریکن و تەنیٚ ڕووناکیەکی کز لە ژوورێکی سەرێدا وەدی دەکریٚ، بۆیە بە زوویی چووم بۆ ئەویٚ و هەستم ڕاگرت دەنگی هیچ نەدەهات، وەلیٚ بینیم مرۆیەك لەوێدا خەوتبوو. بە هێمنی ناوی لیام هێنا و کچە خەبەری بوویەوە و زوو زانیم فێڵم لیٚ کراوە. لەو کاتەدا برایەکی هاتە ژوور و چەند فیشەکێکی تەقاند، وەلیٚ تەنیٚ دانەیەك بە قۆڵم کەوت و خێرا لە پەنجەرەکە خۆم هەڵدا و ڕزگارم بوو.

سوێندت بۆ دەخۆم نە نیازێکی خراپم هەبووە و نە بۆ بینینی لیاش چووبووم. من کەسێکم لە بنەماڵەیەکی ئاینی پەروەردە بووم و هەرگیز بەدوای هەوەسبازیدا نەگەڕاوم، لیٚ ئەو فێڵبازە هێندە حاڵی منی پەرێشان کرد هەر بیرم بۆ ئەوەش نەچوو کە برایانی ئاژان[1] ئاگادار بکەمەوە.

ئەو دەمەی باڵا قسەکانی تەواو بوون حەکیم سوهەیل ڕووی لە گۆڕەکە کرد و گوتی: ئێستا دڵت داکەوت خاتوو لیا، زانیت

---

(١) ئاژان: پۆلیس

ئەم لاوە فێڵی لێ کراوە و تاوانبار نییە؟ کەواتە بە ئارامی بخەوە کچم، ئومێدم وایە ئێستا لە خۆشترین جێگاکان بی.

باڵا لەگەڵ ئەو قسەیەدا لە شوێنی خۆیدا ڕەنگی پەڕی و بە گریانەوە پڕ بە زاری هاواری کرد: ناااااااااااااا. حەکیم سوهەیل دەستی بۆ لاوەکە برد تا ژیری بکاتەوە، لێ ئەو لەتاوی ئازارەکەی هەڵهات و ڕووی لە دەشت و چۆڵاییەکە کرد و ون بوو لە چاوان.



## ڕۆمانەکە بە چاپ دەگەیەندرێ

ئارا کوڕی مامۆستا سیڕاجە، لەو لاوە چاپووکانەیە کە لە شاری ئەختەر دەژی و باوکی یەکێك بوو لە حەکیمە گەورەکانی ئەوێ و ئێستا لە ژیاندا نەماوە.

شەوێکیان خەو بە مامۆستا سیڕاجی باوکیەوە دەبینێ و پێی دەڵێ: کوڕی شیرینم..... دێیەك هەیە بە ناوی قەتار، پرسیاری دەرباره بکە و بیدۆزەرەوە. ڕۆژی سێشەممە ڕاستەوخۆ دوای عەسر لەو دێیەدا ڕێك لەو شوێنەی خەڵکەکە زبڵ و خاشاکی تێدا فڕێ دەدەن منداڵێکی موو زەرد دەبینی کە دەفتەرێکی پێیە. بە هەر نرخێك فرۆشتی دەفتەرەکەی لێ بکڕە و بەچاپی بگەیەنە. ئەوەش بزانە کە نووسەرەکەی ناوی حەکیم سوهەیلە.

ئارا چەند جارێك لەخەوەکەی ڕادەپەڕێ و هەمان خەون دەبینێتەوە و تێدەگا کە ئەمە دەبێ شتێکی گرنگ بێ بۆیە باوکی بەم چەشنە جەختی لەسەر دەکاتەوە.

بەیانی ڕۆژی یەکشەممە دەچێتە لای ڕەنجی هاوڕێی و خەوەکەی بۆ دەگێڕێتەوە و بەیەکەوە دەکەونە پرسیار کردن لەو دێیە. دوای ئەوەی پرسیار لە چەندین مرۆی شارەزا دەکەن دێیەکە دەدۆزنەوە، لێ ئەم دێیە نزیکەی چوار کاژێر بە ئۆتۆمبێل

لە ئەختەر دوور بوو، جگە لەمەش ئەم لاوانە دەبوایە سێشەممە ڕێك دوای عەسر لەوێدا بن.

ڕەنج یەكێك لە هاوڕێكانی بە ناوی ئەحمەد تێدەگەیەنێ كە ئۆتۆمبێلی هەیە و هەرسێ لە ڕۆژی دیاریكراودا بەرەو قەتار وەڕێ دەكەون. دوای ماندوو بوونێكی زۆر و چەند كاژێرێك بڕینی ئەم ڕێیە تووشە[1] لە كۆتاییدا بەر لە عەسر دەگەنە شوێنی مەبەست و بە پرسیار كردن جێگای زبڵ و خاشاكەكان دەدۆزنەوە. ماوەیەكی زۆر هەرسێ لەوێدا ڕادەوەستن و هیچ شتێ نابینن و چ منداڵ بەم ناوەدا ڕانابوورێ و لەخۆیان وەڕەز دەبن. لەپڕدا ئارا ڕوانی ڕێك هەمان منداڵی موو زەرد كە باوكی لەمەڕیەوە دوابوو بە بەردەمیاندا ڕابورد و دەفتەرەكەشی بە دەستی ڕاستیەوە گرتبوو، وێدەچوو تەمەنی لە دەوری دوانزە ساڵی دابێ. ئارا كە ئەمەی بینی خێرا بە ڕاكردن بۆی چوو، منداڵەكە ئاوڕی دایەوە و ترسی لێ نیشت كە دەفتەرەكەی لێ وەرگرێ و بە زوویی بە سینگی خۆیەوە نووساند و گوتی: تۆ كێی كاكە؟ چیت لێم دەوێ؟

ئارا گوتی: هیچمان ناوێ كوڕە جوان، ئەو دەفتەرەی دەستت سەرنجی ڕاكێشام، ئایا دەیفرۆشی لێت بكڕین؟

+ ئەم دەفتەرە دەڵێی؟ ئەمە چیرۆكی زۆر سەرنج ڕاكێشی تێدایە و لە شوێنێكی سەیر بەدەستم هێناوە و شتێكی دەگمەنە.

---

(١) تووش: ڕێوبانی سەخت

ئەو ڕۆژە هەندێك باسی ئەو دەفتەرەم بۆ كاك شۆڕش كرد، ئەو گوتی بۆ منی بێنە بە پێنج هەزار لێت دەكڕم. ئێستا خەریك بوو بۆ ئەوم دەبرد.

لەگەڵ ئەم قسەیەدا خێرا ڕەنج دە هەزاری لە گیرفانی هێنایە دەر و گوتی: ئێمە دە هەزارت پێ دەدەین، بە پێنج مەیفرۆشە.

+ هەر بەڕاستی دە هەزارم پێ دەدەن! ئەی گەر زیاتری كرد؟

ئارای مامۆستا سیراج پێنج هەزاری تری ڕەگەڵ دەیەكە خست و گوتی بگرە ئەمە پانزە هەزار و دەفتەرەكەمان پێ بدە، دەنا درەنگمانە و دەڕۆین و تۆش ناچار دەبی بە پێنج بیفرۆشی.

كاتێ منداڵەكە ئەمەی بیست خێرا پانزە هەزارەكەی وەرگرت و دەفتەرەكەی پێدان و بە ڕاكردن گەڕایەوە ماڵێ نەبادا پەژیوان بنەوە. دیاربوو ماڵیان تۆزێك لەلای ڕاستی زبڵگەكە بوو. ئەو دەمەی ویستیان بگەڕێنەوە ڕەنج گوتی:

ڕاوەستە ئارا، من لە شتێكدا مەراق بووم، ئەو منداڵە گوتی لە شوێنێكی سەیر بەدەستم هێناوە، تۆ بڵێی لەكوێی هێنابێ؟

+ بابە ئەوە كەی كاری ئێمەیە، دەفتەرەكەمان دەست خست و با بگەڕێینەوە.

- نا ئارا، دەبێ بزانم ئەم دەفتەرە لە كوێ هاتووە كە هێندە گرنگە بۆ مامۆستا سیراج، ئاخر ئەو مامۆستای من بوو، شتێك بۆ ئەو گرنگ بێ بۆ منیش گرنگە.

+ باشە ئەگەر دەڵێی چاوەڕێی منداڵەکە دەکەینەوە بێتە دەرێ، خۆ بیینیت چووە کام ماڵ.

هەرسێ نزیکەی یەك کاژێری تر لەوێدا مانەوە تاوەکو منداڵ هاتەوە دەرێ، ئەو دەمەی دووبارە لێی نزیك کەوتنەوە منداڵ ترسا و گوتی: پارەکە نەما، دامە باوکم.

ڕەنج: پارەمان ناوێ گیانەکەم، بەس ئەوەندەمان پێ بڵێ ئەم دەفتەرەت لە کوێ هێنا؟

- نا حەزناکەم بیدرکێنم، جێگایەکی زۆر سەیر بوو.

+ کاکە ئەمە پێنج هەزاری تر بگرە و پێم بڵێ دەی.

- زۆرباشە، لە ڕاستیدا من چەند ڕۆژێك لەمەوبەر لە ماڵەوە زویر بووم و زۆر لە لادێکە دوور کەوتمەوە. سەرەنجام گەیشتمە ژوورێکی بچووك کە لە چۆڵاییەکدا بنیات نرابوو، چوومە ژوورێ و کەسی تێدا نەبوو، وێدەچوو بێ خاوەن بێ، چون هیچی وا لە ماڵەکەدا نەبوو. لەوێ ئەم دەفتەرە سەرنجی ڕاکێشام و لەگەڵ خۆمدا هێنامەوە.

ڕەنج: ئێستا ئەم ژوورە بچووکە پێدەزانیتەوە؟

+ ڕەنگە پێ بزانمەوە، ئەگەر دەتانەوێ بە برە پارەیەك دەتانبەم بۆ ئەوێ.

ئارا: بڕۆ ڕەنج وازی لێ بێنە، چۆن ئەم منداڵەت لێمان فێری پارە کرد. کاکە نامانەوێ بمانبەی ئاقڵ بڕۆرەوە ماڵێ. وازبێنە برا ئیدی، باوکم تەنێ گوتی دەفتەرەکە بێنن و تەواو، کات زۆر درەنگی کردووە و با بگەڕێینەوە.

لەگەڵ قسەکەی ئارادا ڕەنج وازی لە مناڵەکە هێنا و هەرسێ بە دەفتەرەکەوە گەڕانەوە ئەختەر.

ئارا و ڕەنج دەستیان بە خوێندنەوەی تیانووسەکە کرد و زۆر سەراسیمە بوون پێی، چون سەرهاتەکەی نێوی زۆر لە چیرۆکی مامۆستا سیراج دەچوو. ئەوان دەیانگوت وێدەچێ هەردووك لە یەك ئاڤزێمەوە[1] هەڵقوڵابن. بە زوویی لەگەڵ چاپخانەیەکدا ڕێك کەوتن تاوەکو ڕۆمانەکەیان بۆ بە چاپ بگەیەنێ. دوو لاوەکە لە دانانی ناوی ڕۆمانەکەدا دڕدۆنگ بوون، ئارا دەیگوت با ناوی ڕۆمانەکە(عاشقم نەوەك دڕندە) بێ، وەلێ ڕەنج دەیگوت (عیشق نامرێ) ناوێکی جوانترە. دوای تۆزێ مشتومڕ لە کۆتاییدا ڕەنج دەستی لە پێشنیارەکەی خۆی هەڵگرت و بە ناوەکەی ئارا قایل بوو.

هێندەی پێنەچوو ڕۆمانی (عاشقم نەوەك دڕندە) لە شاری ئەختەردا ڕێژەیەکی زۆری لێ چاپ کرا و بڵاوەی کرد و هەموو چین و توێژەکان لە گەنج و پیر و منداڵ دەیانخوێندەوە و بە

---

(١) ئاڤزێم: کانیاوێکە کە هەر لە بەهاردا بژیەتەوە.

ماوەیەكی كورت لە شارەكەدا دەنگی دایەوە. ڕۆژانە خەڵكەكە پرسیاریان دەربارەی نووسەرەكەی دەكرد و كەس نەیدەزانی سوهەیلی حەكیم كێ یە. هێندێك دەیانگوت ئەمە نووسەرێكی خەیاڵیە و هیچ وجوودێكی نییە، كەسێك كە نایەوێ دەربكەوێ بەم ناوە خوازراوەوە ئەم كتێبەی نووسیوە. هێندێكی تر دەیانگوت نەخێر سوهەیلی حەكیم نووسەرێكی كۆنە و لە ئێستادا ئەم بەرهەمەی دۆزراوەتەوە.

هەبوو دەیگوت ئەمە هەمان مامۆستا سیراجی نووسەری كتێبی (لە عیشقەوە بۆ عیشقە)، لێ ئەوە جێگای سەرنجە بۆچی ئارای كوڕی بە ناوی باوكیەوە بڵاوی نەكردۆتەوە!

ئیدی هەركەسە و قسەیەكی دەكرد و بە جۆرێ لە بابەتەكە دەدوا، ڕەنج و ئاراش وەڕەز بوو بوون هێندەی خەڵك پرسیاری نووسەرەكەیان لێ بكا.

لە كۆتاییدا دوو لاوەكە ناچار بوون بڕۆنەوە دێی قەتار بۆ دۆزینەوەی منداڵەكە، بەڵكو شوێنی ئەم خانووە بچووكەیان پێ بێژێ و بتوانن زانیاریەك دەربارەی حەكیم سوهەیل وەدەست بێنن. دووبارە منداڵەكەیان دۆزیەوە و توانیان بە بڕە پارەیەك كە لەوەی جاران پتر بوو قایلی بكەن تا لەگەڵیان بێ بۆ ئەو ژوورە بچووكەی دەفتەرەكەی لێبوو.



مناڵەکە لە خۆشی پارەکە ڕەگەڵیان کەوت و چون جێگاکەی بە تەواوی لەیاد نەمابوو دوای نزیکەی دوو کاژێر لە گەڕان توانیان ژووره بچووکەکە بدۆزنەوە.

دوای دۆزینەوەی ماڵەکەی حەکیم سوهەیل ئارا و ڕەنج منداڵەکەیان وەڕێ کرد و لە دەرگایان دا، هێندەی نەبرد حەکیم هاتە دەر و بەخێرهاتنێکی گەرمی لێ کردن و هێنانیە ژوورێ، خێرا لە بادیەکە ئاوی بۆ تێکردن و دەستیان بە قسان کرد.

+ ماشەڵا لەم میوانە جوانانە، دوای ئەم هەموو ساڵە ئەمە چەند ڕۆژێکە میوانم لێ پەیدا دەبن، ئادەی ناوی خۆتانم پێ بێژن کوڕەکانم.

ئارا هاتە قسە: من ئارای مەولەویم، کوڕی مامۆستا سیڕاج، ئەو یەکێ بوو لە حەکیمەکانی ئەختەر و لە ژیان نەماوە.

ڕەنج: منیش ناوم ڕەنجە و لە ئێستادا قوتابیم، باوکی ئارا مامۆستام بوو و هەندێ لە وانە ئاینیەکانم لەلا خوێندووە.

+ یاخوا بەخێربێن کوڕەکانم، پێم بڵێن چیتان لە کتێبەکەی من کرد؟

لەگەڵ ئەم قسەیەدا ئارا و ڕەنج سەیرێکی یەکیان کرد و زەردەخەنەیان هاتێ، خێرا پڕیاندا دەستی حەکیم سوهەیل و ماچیان کرد و ڕووداوەکەیان بە تەواوی بۆ گێڕایەوە و بەڵێنیشیان پێدا کە هەموو توانایان بخەنە گەڕ بۆ دۆزینەوەی ئاڕتین و سەریاڵ.

ئەو ڕۆژە ئەو دوو لاوە لەگەڵ حەكیم سوهەیلدا هێندە كاتێكی ئارام و لێوانلێو لە چێژیان بردە سەر كە دەتگوت تازە هاتوونەتە ژیان. چوونەوە هەمان ئەو ڕۆژانە كە مامۆستا سیراج دەژیا و گوتەی پڕ لە عیرفان و عیشقی دەخستە بەر گوێچكەیان.

بڕوایان بەخۆیان نەدەكرد ئێستا لەگەڵ حەكیمێكی وا گەورە و نووسەری ئەو ڕۆمانەن كە خەڵكی ئەختەری بەخۆیەوە مژووڵ كردووە. سوهەیلی حەكیم لەگەڵ لاوەكاندا زۆر باسی مامۆستا سیراجی كرد و ئاماژەی بەوەدا كە لەگەڵ ئەو پەیوەندیەكی پتەویان هەبووە لە جیهانی ڕۆحدا.

تا عەسرێكی درەنگ لەگەڵ حەكیم سوهەیلدا ڕوونیشتن، بەڵێنیان پێدا كە سەردانی بكەنەوە و ڕۆمانەكەشی بۆ بێنن و نیشانی بدەن. بەیانی زوو ئەو دەمەی سوهەیلی حەكیم خەریكی پەرستشەكانی بوو دەنگە دەنگ و ژاوە ژاوێكی زۆری لە دەرەوە كەوتە بەر گوێ و خێرا دەرگاكەی والا كرد بۆ ئەوەی بزانێ چی لەوێدا ڕوودەدا.

حەكیم هەر لەگەڵ كردنەوەی دەرگاكەدا سەراسیمەبوو بە بینینی هەزاران خەڵك كە تێكڕا بەرەو ژوورەكەی ئەو ڕێیان دەكرد. زوو زانی ئەمە كاری ئارا و ڕەنجە ئەم حەشامەتەیان لێی تێگەیاندووە و بە تێكڕایی بۆ دیداری ئەو هاتوون و تازە ڕێگایەكی بۆ دەربازبوون نەماوە. ئەو دەمەی نزیك بوونەوە ئارا



و ڕەنج کە پێشڕەوی خەڵکەکەیان دەکرد بە تەواوی لە حەکیم سوهەیل هاتنە پێشێ و هاواریان کرد:

ئەی خەڵکی بە شەڕەفی ئەختەر و ئەوانەی لە شارەکانی تریش هاتوون، ئیمڕۆ هەمووتان خۆشحاڵ ببن و بیکەنە جەژن بە ناسینی حەکیم سوهەیلی مەزن.

لەگەڵ ئەم گوتەیەدا خەڵکەکە تێکڕا لێشاوی هێنا و هەر هەمووی مۆبایل و کامێراکانیان دەرهێنابوو تاوەکو وێنە لەگەڵ حەکیمدا بگرن، ئەمە جگە لەوەی چەندین کەناڵ وەستابوون و پەیامنێرەکان هەوڵی چاوپێکەوتنیان دەدا لەگەڵی، لێ لەبەر جەنجاڵی و ماندووبوون حەکیم ئامادە نەبوو ئەو ڕۆژە بۆ کەناڵەکان بدوێ.

ئارا و ڕەنج لەبەردەمیدا چەشنی شاخێك وەستابوون و یەکە یەکە خەڵکەکەیان دێنا پێشێ بۆ ئەوەی قەرەباڵغی لە دەورەی حەکیمدا ڕوونەدا و پرزەی تەنگ نەبێ. لەو کاتەدا ڕەنج ڕۆمانەکەی دایە دەستی حەکیم و پیرۆزبایی لێ کرد، ئارای مەولەویش ڕۆمانی (لە عیشقەوە بۆ عیشق) ی پێشکەشی حەکیم کرد کە لە نووسینی مامۆستا سیڕاجی باوکی بوو و ماوەیەکی کەم بوو بە چاپیان گەیاندبوو.

حەکیم سوهەیل دووبارە هەردوو کوڕەکانی ماچ کردن و دەست خۆشی لێ کردن. لەنکاودا لە ڕیزی پێشەوەی ئاپۆڕاکە

ڕوانی دوو پیاوی ڕیش سپی بە چاکەت و پاڵتۆیەکی ڕەشەوە وەستابوون. حەکیم زانی ئەوانە سەریاڵ و ئاڕتینن و خێرا بە ڕوویاندا پێکەنی. لەو دەمەدا هەردوو بە کرژیەوە[1] ڕایان کرد و خۆیان بە باوەشی حەکیم دادا و هێندەی یارایان هەبوو یەکدیان گوشی و فرمێسکیان بەسەر شانی یەکتردا ڕژاند و دووبارە بەڵێنی خۆشەویستی و برایەتیان بۆ تا هەتایە دووپات کردەوە.

ئارا دووبارە ڕووی لە خەڵکەکە کرد و بە دەنگی بەرز هاواری کرد: ئەی خەڵکینە، ئەوانە سەریاڵ و ئاڕتینن و جوان چاویان لێ بکەن چۆن لەگەڵ مامۆستاکەیاندا فرمێسك دەڕێژن، زۆربەی ئەوانەی باسی عیشق و ئەوینتان بۆ دەکەن درۆزنن، ئێوە ئیمڕۆ بە چاوی خۆتان ئەم عیشقە گەورە و ئەوینە مەزنە ببینن لە نێوان مامۆستا و قوتابیەکانیدا دەگوزەرێ. ئەم دیمەنە مایەی ئەوەیە چێژی لێ وەربگیرێ و بۆ هەتا هەتایە نەوە دوای نەوە بگێڕدرێتەوە.

لەو دەمەدا حەکیم سوهەیلی پیر ڕۆمانەکەی لەنێو ئاپۆڕاکە بەرز کردەوە و سێ جار بە دەنگی بەرز هاواری کرد: عیشق نامرێ... عیشق نامرێ.... عیشق نامرێ. هەموو ئەوانەی لەم جیهانەدا دەیبینن دەمرن، وەلێ تاکە شتێك کە نامرێ عیشقە.

خەڵکەکە تا درەنگان لەلای حەکیم مانەوە و وێنەیان لەگەڵ گرت و خۆشەویستیان بۆی دەربڕی، بەڵێنیان پێدا لە شار

---

(١) کرژ: خێرا و چەسپان

خانوویەكی گەورەی بۆ چێ بكەن و نەهێڵن چیدی لەم بیابانە بژی. لە كۆتاییدا حەكیم سوهەیل خەڵكەكەی بەڕێ كرد و داوای لێكردن كە ئیمڕۆ لەگەڵ سەریاڵ و ئاڕتیندا تەنهای بكەن و گوتی: ئەی خۆشەویستانم، ئیمڕۆ لەگەڵ ئەم دوو برایەمدا جێم بهێڵن و بەیانی ئینشاڵا ئەگەر تەمەن ڕێگای دا هەرسێ بە یەكەوە دەگەڕێینەوە شار و یەكتری دەبینینەوە، لێ ئیمرۆ زۆر شەكەتم و ناتوانم لەمە زیاتر چاوم بە كەسی دی بكەوێ و تواناكەم هەر ئەوەندەیە. خۆزگە دەكرا لەگەڵ هەمووتان یەك یەك دانیشم و گوێبیستی تەواوی ڕاز و گوتەكانتان بم، لێ خۆتان دەزانن كە پیری مرۆ چەندە ماندوو دەكا.

دوای ئەوەی دەشتەكە بە تەواوی لە خەڵكەكە چۆڵ بوو هەرسێ چوونە ژوورێ و دووبارە تێر تێر گریان و دەیان یادگاری تاڵ و شیرینیان لەگەڵ یەك هەڵدایەوە.

هێندەی پێنەچوو وێنەی حەكیم سوهەیل و دوو قوتابییەكەی لە كاتی باوەش بەیەكدا كردندا خرانە سەر ڕووپەڕی ڕۆژنامەكان، یەكێ لەو ڕۆژنامانە لە ناونیشانەكەیدا نووسی بووی: لەم وێنەیەدا لە وەفا ڕابمێنە، یەكێكی دیكە نووسیبووی: ئەوین تەمەن نازانێ، یەكێكی دیكەیان: عیشق بە ڕیشی سپییەوە چەند جوانە. ئیدی هەریەكە و بە جۆرێ گوزارشتی لەم جوانیە دەكرد.

درەنگانی شەو حەکیم داوای لێبوردنی لێ کردن کە نوێنی لەلا نییە و لێرەدا دەبێ هەر کەسە و لە شوێنی خۆیدا ڕاکشێ، لێ هیچ کامیان خەویان نەدەهات و چێژیان لە چرکە بە چرکەی ڕوونیشتنەکە وەردەگرت. ئەوان دەیانویست تەواوی ئەم هەموو ساڵەی لە دووریدا بەسەریان بردووە لە شەوێکدا قەزا بکەنەوە و هەر یەکە و دەیان و سەدان قسەی بۆ ئەوی دیکە پێبوو.

سوهەیلی حەکیم ڕووی لە سەریاڵ کرد و گوتی: برای شیرینم..... هەموو ئەو کەسانەی لەم جیهانەدا خۆشەویستی دەکەن لەم سێ جۆرە بەدەر نیین: ئارەزوو، بەرژەوەندی، دڵسۆزی و خودایی. ئەو کەسەی لەبەر ئارەزوو کەسێکی خۆشدەوێ هەوڵی تەواوی خۆی دەدا بە ئارەزووەکەی بگا. ئەگەر پێی گەیشت ئارەزووەکەی دەکوژێتەوە و خۆشەویستیەکە وجوودی نامێنێ، خۆ ئەگەر پێشی نەگەیشت ئەوا خۆشەویستیەکە دەگۆڕێتەوە بە ڕق.

کەسی بەرژەوەندی خوازیش بەردەوام لە هەوڵ دایە بۆ وەچنگ خستنی خۆشەویستەکەی. ئەویش وەکو کەسی یەکەم ئەگەر بەدەستی هێنا کاری لەگەڵ تەواو دەبێ و گڕی عیشقەکەی خامۆش دەبێتەوە، خۆ ئەگەر لەدەستی چوو وەڕەز دەبێ و دەست لە خۆشەویستیەکە هەڵدەگرێ و چەشنی کەسێکی ئاسایی لێی دەڕوانێ.

دەتوانی بە چەند نیشانەیەك ئەم دوو جۆرە کەسە بناسیەوە: هەمیشە پێی ناخۆشە ئەو کەسەی خۆشی دەوێ قسە و گفتوگۆ لەگەڵ کەسێکی دیکەدا بکا و سوود لە مرۆیانێکی دیکە وەرگرێ، هەمیشە دەیهەوێ خۆی سوودی پێ بگەیەنێ و چەشنی گوردێك[1] لە بەرامبەری دەرکەوێ. لە قسە و گفتوگۆدا مناڵانە دەدوێ و سوودی ماددی زۆرە و ناتوانێ هیچ سوودێکی ڕۆحی بە خۆشەویستەکەی بگەیەنێ.

هیچ کاتێ ئامادە نییە لەو کەسە تووڕەبێ کە خۆشی دەوێ، هەرچەندە کەسی بەرامبەری هەڵە بکا ڕێگا بەخۆی نادا بۆی ڕاست بکاتەوە، چون دڵسۆزی نییە و تەنێ بۆ ئارەزوو یا بۆ بەرژەوەندی ئەوی دەوێ. تا بەرژەوەندیەکەی لە ئارادایە لەگەڵتە و هەرگیز بە بینینی ئەم جۆرە کەسە خودات ناکەوێتەوە یاد. زۆر جاران بە پارە بە هەموو شێوازێك کۆمەکیت دەکا بۆ ئەوەی بتوانێ دڵت بەدەست بێنێ و بگاتە بەرژەوەندیەکەی. هەرگیز ئەم مرۆڤە حەقی بەوەدا نییە تۆ تاچەند دینداری و لەسەر چ ئاینێکی و ڕۆژێ لە ڕۆژان نایێ ئامۆژگاریت بکا. ئەم جۆرە مرۆڤە ئەگەر خۆشی ویستی بە ناوی گەورە و قەبە ناوت دێنێ و خۆت بە باشی دەزانی کە ئەم ناو و نازناوانە شایەنی تۆ نیین. بە چەشنێ لەگەڵت دەدوێ کە لەخۆت بکەویتە گومانەوە و بێژی تۆ بڵێی من هێندە گەورە بم و نەمزانیبێ!

---

(١) گورد: پاڵەوان

بابێینەسەر کەسی سێیەم کەبەدڵسۆزیەوە کەسێکی خۆشدەوێ و عیشقەکەی عیشقێکی خوداییە، وەکو ئەو خۆشەویستیەی لە نێوان براکاندا هەیە، یان لە نێوان قوتابی و مامۆستاکەی دا هەیە کە دەیهەوێ سوودی پێ بگەیەنێ و خەمخۆریەتی.

ئەم جۆرە خۆشەویستیە زۆر جار کۆسپ و تەگەرەی زۆری بۆ چێ دەبێ و شەیتانەکان هەوڵی لەناو بردنی دەدەن و دەیانەوێ وەکو دووەکەی تری لێ بکەن، وەلێ دوای چەندین ئێش و ئازاریش دەبینی خۆشەویستیەکە وەکو خۆی دەمێنێتەوە. دەزانی بۆ؟ چونکە ئەم خۆشەویستیە لەسەر بنچینەی ئارەزوو و بەرژەوەندی بنیات نەنراوە تا بڕووخێ، بەڵکو بنچینەکەی بە پتەوی دانراوە. ئەم جۆرەیان هەرگیز نامرێ، ئەگەری کزبوونی هەیە، وەلێ مردن نا.

+ دەتوانی نیشانەکانی ئەم جۆرە کەسەشم پێ بڵێی مامۆستا، بۆ ئەوەی بە تەواوی لە دووەکەی تر جیابێتەوە؟

- بەسەرچاو سەریاڵ گیان، ئەم جۆرە کەسە بە بینینی خودات دێتەوە یاد، هەموو خەمەکانت هەڵدەگرێ و تەواوی ئێش و ژانەکانت بە هی خۆی دەزانێ. هیچ کاتێ لێت بێزار نابێ و هەمیشە لە هەواڵت دەپرسێ. لە هەڵەکانت خۆش دەبێ و بەردەوام هەوڵ دەدا بۆتی ڕاست بکاتەوە. پێی خۆشە تۆ سوودت پێ بگا، جا سوودەکە لە هەر کەسێکەوە بێ. ئەم جۆرە کەسەی

سێیەم سوودی ڕۆحی زۆر زیاترە لە سوودی ماددی، زۆر جاران لێت تووڕە دەبێ تاوەکو ڕاستت بکاتەوە. تا کۆتایی لەگەڵتە و دەیهەوێ تۆ کەسێکی چاکەخواز و لە خودا نزیك بی. زۆربەی ئەو کەسانەی ئیمڕۆ دەیانبینی بەدوای جوانیەوەن نەك عیشقی ڕاستەقینە. ئەو دولبەرەی زۆرترین خەڵکی لە چوار دەور دایە ئەگەر بێت و جوانیەکەی لێ بکەیتەوە دەبینی لە چەند چرکەیەکدا کەسی بە دەورەوە نامێنێ.

کەسانێك کار دەکەن بۆ ئەوەی خۆشەویستی ڕاستەقینە بە دڕندەیی نیشان بدەن و ئارەزووش بە خۆشەویستی.

برای ئازیزم.... خۆشەویستی مرۆڤان دارێکە و بەردەوام لە گەشە دایە، ئەم دارە بۆ ئەوەی بە بەهێزی بمێنێتەوە و بەروبوومی باشی هەبێ پێویستە جاروبار لق و پۆکانی بقرتێنی و نەهێڵی زۆر بەرەو ئاسمان بڕوا. ئەو دەمەی هێشتت زۆر بڕوا دەبێ چاوەڕوانی شکانی بکەی، ئەوەش بزانە کە چەندی ڕووی لە ئاسمان بێ لەکاتی قرتاندن و شکانیدا ئێشەکەی پتر دەبێ.

هەڵەی من تەنێ ئەوەندە بوو کە زۆر درەنگ لق و پۆکانی ئەو خۆشەویستیەم بڕی کە لەگەڵ ئێوەدا چێم کردبوو.

حەکیم سوهەیل لەنێو ئەم قسانەدا بوو ڕوانی وا قیدار لەلای دەرگاکە وەستاوە و سەری بەرداوەتەوە و هاتووە تا حەکیم لێی خۆش ببێ. سوهەیلی حەکیم سەیرێکی کرد و گوتی: ئیمڕۆ لە

هەموو ئەوانە خۆش دەبین کە ڕۆژێك لە ڕۆژان هەڵەیان لەگەڵ کردووین و برایەتی و ئاشتی لەگەڵ هەموو کەسێکی ئەم جیهانە ڕادەگەیەنین.

لەگەڵ ئەم قسەیەدا قیدار زەردەخەنەی کرد و هاتە نێو مەجلیسەکە ڕوونیشت.

دوای ئەوەی شەو تەواو درەنگی کرد و هەرسێ لە جێگاکەی خۆیان پاڵیان دایەوە، سوهەیلی پیر بە دەنگێکی نزمەوە گوتی: ڕۆژێکیان یەکێك لە فریشتەکانی خودا لە نێردراوی مەزن نزیك بوویەوە و پێی گوت: (کێت خۆشدەوێ خۆشت بوێ، وەلێ بزانە ڕۆژێك لێی جیا دەبیەوە). ئەمە کۆتا قسەی حەکیمی پیر بوو لەم شەوەدا و ئیدی خەو چوویە چاوانی. بەیانی کە سەریاڵ و ئارتین واگا هاتن و بانگیان کرد دەنگێکی نەبوو و بۆ تا هەتایە سوهەیلی حەکیم چاوەکانی لێك نان.

تەواو..........

# ناوەڕۆك